(دیاریی لیژنەی ئامادەکردنی ڕێوڕەسمی یادی پەنجاساڵەی
کۆچی دوایی یەکەم مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید)

# یادنامەی
# شێخ مەحموودی حەفید


منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

تصوير أبو عبد الرحمن الكردي

# یادنامەی
# شێخ مەحموودی حەفید

(دیـــاریی لیژنـــەی ئامـــادەکردنی
ڕێـــوڕەسمی یـــادی پـــەنجا ســـاڵەی
کۆچـــی دوایـــی یەکـــەم مـــەلیکی
کوردستان شێخ مەحموودی حەفید)

بنکەی ژین
سلێمانی ـ ٢٠٠٦

٩٥٣,٢١
ح ٩٤٤ حەفید، ناسر (نووسەری تر)
یادنامەی شێخ مەحمودی حەفید/ دانانی ناسر حەفید (نووسەری
تر)" پێشەکی لیژنەی باڵا .ـ سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.
٣٢٠ ل: پاشکۆ، ١٧,٥ × ٢٥ سم. .
١-حەفید، شێخ مەحموود ـ مێژوو.
٢-مێژووی هاوچەرخی کورد.
ئـ . لیژنەی باڵا (پێشەکی). ب. ناونیشان.
کتێبخانەی گشتی سلێمانی زانیاری سەرەتایی پۆلێن و پێرستی ئامادەکردووە

سەرپەرستی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح
زنجیرە: ٥٢
کتێب: یادنامەی شێخ مەحموودی حەفید
نووسەر: ناسر حەفید و ئەوانی تر
تایپ: سیروان خەلیل محەمەد
مۆنتاج: یادگار ئەورەحمان
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان
ژمارەی سپاردن: ١٠٤٣ی ساڵی ٢٠٠٦

بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، سەرچنار، گەڕەکی ١١٩، شەقامی ٧٥ سەگرمە، خانووی ٧٣
تۆرمال: ٣١٨٣٦٣١ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩
سنووقی پۆست: ١٤ E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com

# پێشەکی

لە دووتوێی ئەم یادنامەیەدا چاوتان بە کۆمەڵێك وتارو لێکۆڵینەوە ئەکەوێت کە لەلایەن کۆمەڵێك نووسەرو زانستکارەوە ئامادەکراون بۆ پێشکەشکردنیان لە کۆبوونەوەکانی ڕێوڕەسمی پەنجاهەمین ساڵیادی کۆچی دوایی شێخ مەحموودی حەفید. ئێمە لە کاتێکدا سوپاسی هەموو ئەو نووسەرو زانستکارانە ئەکەین کە ئەرکی ئامادەکردنی ئەو وتارو لێکۆڵینەیان گرتۆتە ئەستۆ، دەستخۆشییان لێئەکەین و هیواداریـن کارەکانیان شایانی ڕەزامەندیتان بێ‌و ئێوەش بە سەرنج و تێبینییەکانتان باسەکان دەوڵەمەند بکەن، وە ئەگەر هەڵەو ناتەواوییەکتان تێدا بەدیکرد بیخەنەڕوو، تا ئەو هەڵەو ناتەواوییانە نەمێڵین و بە ڕوونکردنەوەی پێویست و ئامادەکردنی پێرست بۆ شوێن و ناوەکان، کە پێویستن بۆ هەموو کارێکی زانستی، تەواو بکەین.

ئێمە بەهیوای ئەوەی ئەم ئەرکە بە جێبهێنین، بێ هیچ دەستکارییەك وتارەکانمان چۆن پێگەیشتوون وەك خۆی بڵاوکردۆتەوە، ئومێدەوارین ئێوەش لە بیروڕاو بۆچوونەکانی خۆتان ئاگادارمان بفەرموون تا لە چاپی داهاتوودا ڕەچاویان بکەین.

هەر بژین

لیژنەی باڵا

٢٠٠٦/١٢/٢٢

## شێخ مەحموود:
## یەکەم کۆشش دوای بابانەکان
## لە پێناو ئیدارەیەکی کوردیی سەربەخۆدا

_مەسەلە پڕکردنەوەی بۆشایی بابانەکان نەبوو، بەڵکو هەوڵێکی تری مێژوو بوو.

_دوو سیاسەتی دژ بەیەک. بوونی هەر یەک لەوان نەبوونی ئەوی تریان بوو. خەباتی شێخ مەحمود دژی نەبوون بوو.

_شێخ مەحمود و هاوڕێکانی هەنگاویان دەنا بۆ دەوڵەتی کوردیی، بەڵام ئینگلیزەکان ئەوانیان بۆ نۆکەریی دەویست.

ناسر حەفید
٢٠٠٦-١١-٢٠/ سلێمانی
Nala١٩٢٢@hotmail.com

هەر کاتێک مێژوو دەستی شل بووبێت، دەسەتەڵاتێکی کوردیی لە کوردستانی داگیرکراودا هەڵتۆقاوە. ئەم دەستەڵاتە لە راستییدا بۆ ئەوە نەبووە کە گەلی کورد باشتر ببات بەڕێوە، بەڵکو لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە بووە کە کورد دەستەڵات دروست بکات لە کورد خۆی. یەکێک لەم دەستەڵاتدارییانە میرایەتیی بابان بوو.

عوسمانییەکان لە ڕێڕەوی بەرفراوانبوونیاندا ساڵی ١٥١٤ لە جاڵدێران کەوتنە شەڕەوە دژی سەفەوییەکان. بەشداربوونی کورد لە بەرەی عوسمانییداو سەرکەوتنیان بەسەر سەفەوییەکاندا، ژمارەیەک میرنشینی کوردی لە ژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانییدا لێ کەوتەوە. یەکێک لەو دەستەڵاتدارییانەی کە لە دوای ساڵی (١٥١٤)ەوە ناوی دەرکەوت دەستەڵاتی بابانەکان بوو.

دانیشتوانی میرنشینی بابانەکان موسوڵمانی سونە مەزهەب بوون کە نێوەندەکەی لە ئەستەنبوڵ لە دەستی سوڵتانەکانی عوسمانییدا بوو. ئەم دەستەڵاتی بابانە لە ژێر کاریگەریی دوو فاکتەردا بووە. یەکەم، فاکتەرێک کە سەرچاوەی لە هۆکارە سروشتییەکانەوە وەرگرتووە. بەپێی ئەم هۆکارە سروشتییانە کورد دەبوو لە خۆی و بە گوێرەی خۆی لە ڕێکخستنێکدا دەستەڵات لە زێدی خۆیدا دروست بکات. هەروەکو چۆن پورە هەنگێک یان شارە مێروولەیەک بۆ بەردەوامیی ژیان لە کۆبوونەوەو خۆڕێکخستنیان توانایەک بۆ هەموویان دروست دەکەن. دووەم، فاکتەری بیروباوەڕی ئیسلامیی کە گەلانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانیی لە ڕێکخستنێکدا کۆ کردبووەوە. بەم ڕێکخستنە باوەڕییە سوڵتان هێزی گەلانی لە دەستدا کۆ بوو بووەوە کە بەکاری دەهێنایەوە بۆ حوکمکردنی هەر یەکێک لە خۆیان.

هەر کاتێک فاکتەری ستوونیی سروشتیی لە بەرانبەر بە فاکتەری ئاسۆیی ئیسلامیی دەوڵەتییدا بەهێز بووبێت دەستەڵات ملی لەوە ناوە کە سەربەست بێت و سەرئەنجام لەگەڵ عوسمانییەکاندا بکەوێتە ناکۆکیی و

جەنگەوە. بەلام شەڕ و ناکۆکیی بەردەوامی سەفەویی شیعە مەزهەب لەگەڵ عوسمانیی سوننە مەزهەبدا لۆجیکییە فاکتەری سوننەیەتیی کردبێت بە فاکتەری زاڵ و بڕیاردەر بەسەر فاکتەری سروشتییدا. مرۆڤ دەتوانێت بڵێت: فاکتەری سروشتیی هۆکاری خۆڕێکخستن و دروستبوونی دەستەلاتێکی کوردیی بووە، بەلام دەوڵەتی عوسمانیی لە ڕێگای فاکتەری ئایدۆلۆجیی ئیسلامییەوە ئەم دەستەلاتەی بۆ سیاسەتی خۆی بەکار هێناوە. حوکمی بابانەکان بەگشتیی ئەڵقەیەکی دەستەلات بووە لە ناو زنجیرە دەستەلاتی عوسمانییدا کە هەرگیز نەیتوانی لێی دەربچێت. میرەکانی بابان بەزۆریی لە پێناوی دەستەلاتدا دژی یەکتریی پەنایان دەبردە بەر دەستەلاتی عوسمانییەکان و لەشکری ئێرانییان دەهێنایە سەر خۆیان. میرەکانی بابان لە نێوان ناکۆکیی و شەڕی قەڵەمڕەوی سەفەوییەکان و عوسمانییەکاندا هەوڵیان داوە کە ڕۆڵی ئەو ئەڵقە دەستەلاتە ببینن. ئەمارەتی بابان کە لە بناغەوە بەهۆی عوسمانییەکانەوە دروست بووبێت هۆی مانەوەی لە دەرەوەی ئەوان لە نێوانی هەردوو قەڵەمڕەوەکەدا نەبووە. بۆیە ئەگەر یەکێک لە پاشاکانی بابان لە سەردەمێکی دیاریکراودا بوژانەوەیەکی خستبێتە ناوچەکەیەوەو ملی لە پساندنی گرێبەندیی دەستەلاتی عوسمانییەکان نابێت، کۆتایی بە نەمان هاتووە.

### فاکتەری ئایدۆلۆجیی

عەرەب بە هۆی ئاینیی ئیسلامەوە باڵی کێشا بەسەر ژمارەیەک نیشتیماندا. تورکەکان ئەم ئایدۆلۆجیی ئیسلامییەیان خستە دەستی خۆیانەوەو لە ڕێگای ڕێکخستنی ئیسلامیی گەلانەوە قەڵەمڕەوی عوسمانییان دروست کرد. فارسەکان مەزهەبی شیعەیان لە بەرانبەر سوننەی عوسمانییەکاندا خستە گەڕ و قەڵەمڕەوی سەفەوییان دامەزراند. ڕوس بەهۆی شۆڕشی سۆشیالیستیی ئۆکتۆبەرەوە یەکێتیی سۆڤیەتی پێک هێناو ڕێکخستنێکی سیاسیی جیهانیی بەناو میللەتاندا راکێشاو جیهانی کرد بە دوو بەرەوە. قەڵەمڕەویی ئەم نەتەوانە لەسەر حسابی

نەتەوەکانی تر بوو. باوەڕ لە هەر فۆرمێکدا بووبێت ئایین یان کۆمۆنیزم بە ئەقڵی ئازاد و فاکتەری سروشتیی ناکۆک بوو. میللەتان لەژێر دەستەڵاتی عوسمانییدا دەبوو بە قورئان و وتەکانی پێغەمبەر لە ژیان تێ بگەن. ئەم پێتێگانەش لە دەستی سوڵتانی عوسمانییدا بوون. دەوڵەتی عوسمانییش بە گوێرەی بەرژەوەندیی خۆی پێتێکە ئیسلامییەکانی لێک دەدایەوەو بەکاری دەهێنان. ئەم بەکارهێنانەش رووی دەدا پێچەوانەی بەرژەوەندیی گەلان (پێچەوانەی فاکتەری سروشتیی) بوو. کاتێک میر سلێمانی بابان ساڵی ١٦٨٩ کەرکوکی رزگار کرد، وەزیری عوسمانیی بەغداد "حەسەن پاشا" لە نامەیەکی هەڕەشەدا نوسی: "پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ناو ریزی موسوڵمانانی یەکتاپەرست و ملکەچی شەریعەتی ئیسلامیی بن بە پێی ئایەتی کەریمەی: "یا ایها الزین امنوا اتیعوا اللە و اتیعوا الرسول واولی الامر منکم. ئەگینا لە ریزی "باغی"یان دادەنرێن کە دەبێت بەپێی شەرع شەڕتان بکرێت" (٦٣/١٢).

لە مێژوودا باس کراوە میر محەمەدی رەواندز فتوای مەلای خەتێ، کە خۆشی کورد بووە، دەوری چۆڵ کردووەو بۆتە هۆی شکانی لە شەڕیدا دژی دەوڵەتی عوسمانیی. بەکارهێنانی پێتێگەکانی ئایدۆلۆجیی ئیسلامیی وەکو ئامرازێک بۆ بڕیار لە لایەن دەستەڵاتی عوسمانییەوە نموونەی ساڵی ١٧٢٦ وەردەگرێت. کاتێک ئەشرەف خانی ئەفغانی دەستی گرت بەسەر ئێراندا سێ نامەیان نارد بۆ دەوڵەتی عوسمانیی کە لە یەکێکیاندا مەلا ئەفغانییەکان داوایان کردبوو دان بنرێت بە ئەشرەفدا وەکو ئیمامی میللەتەکەی. بەڵام کۆبوونەوەی کاربەدەستانی عوسمانیی لەگەڵ موفتی و قازی و زانا ئاینییەکانیان بەوە گەیشت کە ئەشرەف "یاخی"یەو بەر حوکمی ئەم ئایەتە دەکەوێت: "فان بغت احدهما علی الاخری فقاتلوا التی تبغی حتی تفیء الی امر اللە". ئەم بڕیارەش "نەوشیروان" وتەنی وەکو بڕیاری جەنگ وابوو (٦٠/١٢).

گەلانی موسوڵمانی داگیرکراو و ملکەچ دەبوو لە رێگای دەستەڵاتی عوسمانییەوە پێتێکەکانی ئیسلام بەکار بهێنن. بەم پێیە ئیمامەتیی ئەستەنبوڵ بڕیاری دەدا ئەم گەلانە چۆن بیر بکەنەوە. ئەم چۆنیەتیی

بیرکردنەوەیەش دیارە تەریب لەگەڵ بەرژەوەندیی دەسەڵاتی تورکییدا رۆشتووە. ژیانی گەلانی ژێر دەست بە حوکمی ژیانی نەتەوەی دەستەڵاتدار گەڕاوە. لە سەردەمی کۆمۆنیزمیشدا مافی نەتەوەکان مافێکی گوێرەیی بوو، دەبوو بە گوێرەی ئایدۆلۆجیی کۆمۆنیزم و سیاسەتی نێودەوڵەتیی یەکێتی سوڤییەت هەڵبسەنگێنرێت. بۆیە مانای ئازادیی بۆ کورد لە بنەڕەتدا مانای رزگاربوونی فاکتەری سروشتیی بووە لە گیرۆدەیی فاکتەری ئایدۆلۆجیی بێگانە. ئایا فاکتەری سروشتیی دەبوو چۆن خۆی رزگار بکات؟ ئایا دەبوو بیروباوەڕی ئیسلام رەد بکاتەوە؟ کێشەکە رەدکردنەوەی باوەڕی ئیسلام نەبوو، بەڵکو بەکارهێنانی بوو بە کوردیی. هۆکاری سروشتیی بۆ خۆرێکخستن لە خۆوەو بە خۆ دەبوو تەریب لەگەڵ ئایدۆلۆجییدا یەک هەدەفیان هەبێت. کورد دەبوو لە خۆی و بە گوێرەی خۆی پێتێکەکانی ئیسلام بەکار بهێنێت. ئەمەش ئەوەی دەگرتەوە کە دەبوو سەرچاوەی ئیسلامیی باوەڕپێکراوی کوردیی هەبێت کە بۆ کوردەکان جێگای لێکدانەوەو بەکارهێنانی پێتێکەکانی ئیسلام بێت. بۆ ئەمەش دەبوو کورد خەریکی کۆششی عیلم و عیرفان بێت. شێخ مارفی نۆدێ یەکێک بوو لەو مەلایانەی خەریکی زانیاریی و باوەڕی ئیسلام بوو.

## شێخ مارفی نۆدێ

بابانەکان بیریان لەوە کردەوە کە لە قەڵاچولان بگوێزنەوە. مەحمود پاشا نزیک گوندی مەلکەندی سەرایەکی دروست کرد بۆ ئەوەی بیکات بە مەڵبەندی حوکمڕانیی. بەڵام فریا نەکەوت تەواوی بکات لابرا. ئیبراهیم پاشا بەردەوامیی دا بەم پڕۆژەیە. داروپەردوی خانوەکانی قەڵاچوالانیان بەکارهێنا بۆ دروستکردنی ئەم شارە تازەیە "سلێمانی". نەوشیروان مستەفا دەنوسێت: "ئەم شارە بوو بە ناوەندێکی گرنگی جوڵانەوەی سیاسیی و فەرهەنگیی و ئەدەبیی لە مێژووی نوێی کورددا". یەکێک لەو بینایانەی کە دروست کرا "مزگەوتی گەورە بوو". ئەم مزگەوتە تاکە مزگەوت بووە کە نوێژی هەینیانی تێدا دەکرا. یەکێک لەو مەلایانەی کە لە سەرەتای دامەزراندنی مزگەوتی گەورەوە دانرا شێخ مارفی نودێ بوو.

شـێخ مـارف بـە منداڵـیی لای بـاوکی خوێندویـەتی. دوای ئـەوە لـە قوتابخانەی قەڵاچوالاندا ماوەتەوە تا کوژرانی سلێمان پاشا. بەهۆی ئـەم ڕووداوەوە "فەقێ"کانیش ماوەیەک پەرەوازەبوون. شێخ مـارف چـووە لای مەلا محەمەدی ئیبنولحاج و چوار ساڵیش لای ئەو خوێندی. ئەو کاتە مەلا عەبدوڵای بێتوشیی هاتۆتە هەزارمێرد بۆ لای ئیبنولحاج، شێخ مارف لای ئـەویش خوێنـدی. دوای ئـەوە گەڕاوەتـەوە بـۆ قـەڵاچوالان و مۆڵـەتی مامۆستایی وەرگرتووە. ژمارەی ٥٤ کتێبی ئاینیی و، دەربارەی ڕێزمـانی عەرەبیی و بەلاغەت بە عەرەبیی نوسیووە (١٣/٥). فەرهەنگی "ئەحمـەدیی" بە زمانی عەرەبیی/کوردیی داناوە. ئەم فەرهەنگـە ژمـارەی ١٤٧٥ وشـەی عەرەبیی تێدایە. لەگەڵ دروستکردنی سلێمانی شێخ مـارف لـە مزگـەوتی گـەورە دامـەزراوە، وانـەی وتۆتـەوە، نوسـیوویەتی و سەرپەرشـتیی کتێبخانەکەی کردووە (١٠٣/١٢).

شێخ مارفی نودێ کە ساڵی ١٨٣٨ کۆچیی دوایی کرد تەمـەنی ٨٦ سـاڵ بوو. لە ڕێگای شێخ مارفەوە ڕێنمـایی قـادریی لەسـەردەمی بابانەکانـدا پەرەی سەند. شێخ عەبدولقادری گەیلانیی، کە دانەری ئەم ڕێگایە بـووە، چەند پەیڕەوییەکی دانابوو بۆ سوفییگەریی کە بریتیی بوون لەم خاڵانەی خوارەوە:

١. دەروێش دەبێت سوێند بە خودا نەخوات. ٢. بـە هـیچ جۆرێـک درۆ نەکات. ٣. بەڵێنەکانی جێبەجێ بکات. ٤. لەعنەت لە هیچ خولـقێنراوێک نەکات. ٥. دوعای خراپ لە هیچ کەسـێک نـەکات. ٦. شـایەدیی لـە هـیچ موسوڵمانێک نەدا کە هاوبەشی بۆ خودا پەیدا کردووە یان کفری کـردووە. ٧. تەماشای هیچ گوناحێک نەکات. ٨. داوای یارمەتیی لەکەس نـەکات. ٩. تەماعی لە دەستی کەس نەبێت. ١٠. ملکەچ و بێفیزبێت (٧٥/١٣).

ئەو خاڵانەی سەرەوە لە بنچینەدا نەخشەی پێکهێنانی سـترەکتورێکی موراڵیین کە مرۆڤ لە ڕێگای کۆشـشی سـۆفێتییەوە توانیوویـەتی پێکـی بهێنێت. لە سەرەتادا لە سەر رادەی مرۆڤی تاک لەوە دەدوێـن کـە کـەس دەبێت چۆن بێت و چۆن هەڵسوکەوت بکات. لە پلـەی دووەمـی سیاسـییدا دەچێتـــە خزمـــەتی ئـــەوەوە کـــە کۆمەڵـــگا چـــۆن ببینرێـــت.

له سەردەمی  حوکمی کورتی ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشـادا هێـزی چەکدار رێکخرا. ئەحمەد پاشا چوار تیپی هەزار کەسیی لە سـەر شـێوەی سوپا نوێیەکانی دنیا دروست کرد و پلەی سوپایی بـۆ دیـاری کـردن. لــە هەمان کاتدا بایەخێکی زۆری دا بـە خوێنـدن و خوێنـدەواریی. مزگـەوتی تازەی دروست کرد و رێزی مەلاکانی دەگـرت. ژیـانی مـەلاکانی مـسۆگەر دەکرد و گوندی لەسەر وەقـف کـردوون. کتێبخانـەی مزگـەوتی گـەورەی ئاوەدان کردەوە، ژمارەیەک کتێبی زۆری بۆ کڕین یان بە نوسـینەوەی دا. دوای دور خرانەوەشی لە کوردستان بەردەوام کتێبی بۆ ئـەم کتێبخانەیـە ناردۆتەوە. هەتا ئێستاش ژمارەیەک لەو کتێبانە لە کتێبخانەی ئـەوقافی سلێمانیدا ماوە. لەم سەردەمەدا شیعر بە شێوەزمانی بابان گەشەی کـرد. "قوتابخانەی شیعری بابـان" لــە لایـەن سـێ شـاعیری هەڵـکەوتووەوە "نالـی"، "سالم" و "کوردی"یەوە هاتە کایەوە. ئەحمەد پاشـا تێکۆشـا بـۆ بەرقەرارکردنی ئاسایش، و پاراستنی سەر و ماڵــی هاووڵاتیـان و سـزای جــەردەو رێگـری دەدا. هــانی پیـشەسازیی و کـشتوکاڵی داوە (١٢/١٦٠). بەڵام کورد کە کەوتبووە نێـوانی (نەوشـیروان وتــەنی) دوو بەرداشــەوە، هەمیشە دەستەڵاتەکەی بەگشتیی بەشێک بوو لە دەسـتەڵاتی یـەکێک لــە قەڵەمڕەوەکانی عوسمانیی و سەفەویی. دەستەڵاتی میرەکانی بابــان بــە پێی هەلومـەرجی سیاسـەتی عوسمانییـەکان و ئێرانییـەکان کـەوتبووە وردەکارییەکەوە کە فاکتەری دەستەڵات هێڵە موراڵییەکانی لە سەر ئاستی جیاواز دەشکاند. برا برای دەکوشت و لەشکری دەوڵەتەکەی تری دەهێنایە سەر میرایەتییەکە. خۆیان کە سوننە بوون دەکەوتنـە بــەرەی شـیعەوە. شێخ مارفی نودێ لە نامەیەکدا بۆ عەلی رەزا پاشای والی بەغـداد ساڵـی ١٨٤٢ دەنوسێت کە لەوەتەی شای عەجەم و سەربازانی شیعە ئەم وڵاتەیان داگیرکردووە، شیرازەی دین و دنیا تێک چووە. ئاواییەکان وێران بــوون و نوێژی جەماعەتیان تێدا ناکرێت. لە قوتابخانەکەیاندا لە ٧٠ قوتابییــەوە هاتۆتە سەر ١٠ قوتابی (١٢/١٧١). لە شـەڕ و نـاکۆکیی نێـوان جوتــە بـرا مەحمود پاشا و سـلێمان پاشــادا ساڵــی ١٨٢٧ و ١٨٢٨ ناوچەکـە توشـی ناهەمواریی کۆمەڵایەتیی، سیاسـیی، فەرهــەنگیی و ئــابوریی هــاتووە.

ناوچەکـە چەنـد جارێـک لــە نێــوانی عوسمانییــەکان و ئێرانییەکانــدا دەستاودەستی کرد، گەشتە ئەوەی کە ئێرانییەکان پادگانێکی هەمیــشەیی لە سلێمانی دابنێن. فریزەر کە لە سەردەشتەوە دێـت بـۆ سـلێمانی، بــە درێژایی ڕێگا گوندێکی ئاوەدان نابینێت، کە دەگاتــە سـلێمانی بەڕەیــەک نابێــت بــۆی رابخــەن. زۆربــەی پیــشەکار و بازرگــان و جوتیارەکــان هەڵهاتبوون بۆ ڕەواندز، کەرکوک و موسـڵ. دانیــشتوانی سـلێمانی لــەو کاتەدا هاتۆتە سەر کەمتر لە ٥٠٠٠ کەس (١٥٧/١٢).

نەوشیروان مـستەفا دەنوسـێت: "شـێخ مـارف زۆر بێـزار بـووە لــە لەشکرکێشییەکانی ئێران و، لە ململانێ و نـاکۆکیی نـاوخۆی میرەکــانی بابان، لەو نامانەدا کە بەجێ ماون بە لایەنی کەمەوە سێ جار و لــە سـێ سەردەمی جیاوازدا ویستویەتی سلێمانی بەجێبهێڵێت (١٥٩/١٢).

جگە لە شێخ مارفی نودێ مەولانا خالیدی نەقـشەبەندیش هــەر لــەو گێژاوە بێ هیوا بوو. مەولانا خالید پێش ئەوەی ببێت بە شێخی تەریقــەت شیعری بەسەر پاشاکانی بابادا هەڵـدابوو. هەوڵــی دا مــەحمود پاشــا و عوسمان بەگی برای و عەبدوڵا پاشای مامیان ڕێک بخات. ئەم سـێ کەســە لە سەر دەستی مەولانادا سوێندو تەڵاق و خەنجەر دەخۆن کە خیانەت لــە یەکتریی نەکــەن. هــەر کاتێـک نامــە لــە حــاکمی کرمانــشان یــان والـی بەغدادەوە بۆ یەکێکیان هات لە یەکتریی نەشارنەوەو لەبەردەمی مــەولانا خالیددا بیکەنەوە. بەڵام ئەم پەیمانە جێگای بڕوا نــەبووە لای مــەولانا و لەوە نەچووە هەلومەرجێکی مــاددیی بــەهێز هــەبووبێت بـۆی. مــەولانا خالید لە ئەنجامدا ڕووی کردە بەغداد و دواتر کە بە سەفەر هاتۆتەوە بـۆ سلێمانی نەیویستووە مەحمود پاشا ببینێت و نامەی گلــەیی و ڕەخنەشــی بۆ نوسیووە (١٤٤/١٢).

ناکۆکیی پەنجا ساڵەی نێوانی عوسمانییەکان و سەفەوییەکان، کە لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم و شا ئیسماعیلی یەکەمەوە دەســتی پــێ کرد بوو، ساڵی ١٥٥٥ گەشتە "ڕێکەوتنی ئاشتیی ئاماسیە". بە گوێرەی ئەم ڕێکەوتنە، کە لە نامەکانی نێوانیادا هاتبوو، کێـشەی سـنور، ئـایین و راکردوانی لەدەست هەریەک لەوان باسکرابوو. دەوڵەتی عوسمــانیی دانی

بە بوونی دەوڵەتی ئێرانیی سەفەوییدا نابوو (٣٩/١٢). ئەم رێککەوتنە تا مردنی سوڵتان سلێمان ساڵی ١٥٦٦ و مردنی شا تەهماسب ساڵی ١٥٧٦ لە لایەن هەردو لاوە رەچاو کرا. دوای ئەم رێککەوتنە رێککەوتنی یەکەمی ئەرزرۆم ساڵی ١٨٢٢ گەلێک کێشەی چارەسەر کرد بەڵام کۆتایی بە ناکۆکیی نێوانی تورک و فارس نەهێنا. رێککەوتنی دووەمی ئەرزرۆم بە کۆششی بەریتانیا و روسیا ساڵی ١٨٤٧ ئیمزا کرا. لەم رێککەوتنەدا بەندە گرنگەکانی رێککەوتنی یەکەم دوپات کرانەوەو ژمارەیەک کێشەی گرنگی تریان بەلادا خست. برگەی دووەمی رێککەوتنەکە کێشەی کوردستانی دەگرتەوە. لەم برگەیەدا دەوڵەتی ئێرانیی بەڵێنی دا واز بهێنێت لە خواستەکانی خۆی لە ویلایەت و شاری سلێمانیدا و دەست وەرنەدات لە مافی خاوەنداریێتیی دەوڵەتی عوسمانیی کە لە ناوچەی ناوبراودا هەیەتی.

نەوشیروان مستەفا دەنوسێت: "ئەم رێککەوتنە بناغەی سیاسەتی هاوبەشی هەردو دەوڵەتی بەرامبەر میرایەتییە کوردییەکان و مەسەلەی کورد دارشت و کۆتایی بە حوکمی بنەماڵە خۆجێییەکان هێنا لە هەردو بەشی کوردستانی عوسمانیی و ئێرانییدا" (١٦٤/١٢).
لە ناو سترەکتوری دەستەڵاتی عوسمانییدا بنمیچێک لە فاکتەری "ئایدۆلۆجیی دەوڵەتیی" وەکو فاکتەری دووەم بۆ دەستەڵاتی بابانەکان، لە ناکۆکیی عوسمانییەکان و سەفەوییەکاندا، دروست بوو. لەژێر ئەم بنمیچەدا، حوکمڕانیی بابانەکان بە حوکمی یاسای سروشتیی وەکو فاکتەری یەکەم بەپێی هەلومەرجی ناوچەکە لە گەشەکردن و لاوازبووندا بوو. دوای رێککەوتنی دوو لایەن، ئێرانییەکان و عوسمانییەکان، دۆڕاو لایەنی سێیەم بوو. ئەرکی فاکتەری دووەم تەختکردنی فاکتەری یەکەم (قەوارەی بابانەکان) بوو. هۆی دروستبوونی بابانەکان هۆی روخانیشیان بوو. جارێکی تر مێژوو دەستی نوقاندەوە، بەڵام ئایا فاکتەری یەکەمی سروشتیی بۆ کوێ چوو؟

## ئایدۆلۆجیی بە کوردیی

شێخ مارفی نۆدێ ساڵی ١٨٣٨لە هەمان ساڵدا کە سلێمان پاشای کوڕی ئەوڕەحمان پاشا کۆچیی دوایی کردووە لە سەیوان نێژراوە. سیانزە ساڵ دوای ئەم مێژووە کۆتایی بە میرنشینی بابان هاتووە. ساڵی ١٨٤٩ ئیسماعیل پاشا دانرا بە موتەسەڕیف لە سلێمانی. ناوچەکە راستەوخۆ خرایە ژێر دەستەڵاتی تورکەکانەوەو بەمە کۆتایی هات بە میرایەتیی بابان (١٦٨/١٢).

دوای شێخ مارف کاک ئەحمدی کوڕی بەردەوامیی دا بە تێکۆشان. کاک ئەحمەدی شێخ کاتێک ساڵی ١٨٨٧ کۆچی دوایی کردووە ٩٧ ساڵ ژیابوو. ئەو کاتە شێخ مەحمود تەمەنی ٥ ساڵ بووە. کاک ئەحمەد ژمارەی ٩٩ بەرهەمی نوسینی هەبووە کە بەناو خەڵکیدا بڵاوی کردونەتەوە. لە نوسینەکانیدا گرنگییەکی زۆری داوە بە مورال و پەروەردەی رۆح. کاک ئەحمەدی شێخ دەنوسێت: "مرۆڤ هەرچەند پایەو مایەدار بێت، پێویستە لەگەڵ راگرتنی سەنگینیی و ئەدەبدا دەربارەی خەڵک خاکیی بێت، خۆی بە کەم بزانێت، خۆی بە زل نەزانێت، سڵاویان لێ بکات، وەڵامی سڵاویان بداتەوەو کە هاتە مەجلیسەوە هەوڵی لای ژورو نەدات و لە رێگارۆشتندا هەوڵی ئەوە نەدات پێش بکەوێت (٩٣/١٤).

کاک ئەحمەد لە رێنماییەکانیدا رەچاوی کارەکتەری گوێرەیی (نیسبی یان رێلاتیڤیزم) کردووە کە یەکێکە لە سیفەتەکانی زانستێتیی. لە روونکردنەوەکانیدا لێکچوونی وەکو ئامرازی تێگەیاندن بەکار هێناوە. کاک ئەحمەد دەنوسێت: "دوکتۆر تا لە نەخۆشییەکە حاڵی نەبێت دەرمان بە نەخۆشەکە نادات، کە بە نەخۆشییەکەشی زانی بە قەدەر پێویست دەرمانی بۆ دیاری دەکات، هەر بەو جۆرە زانای زانستی بیروباوەڕ لەسەری پێویستە بەپێی رادەی هوشیاریی موسوڵمانان ئامۆژگارییان بکات و، بە قەدەر توانای بیروهۆشیان شتیان فێر بکات. ئەگەرنا ئیرشادکردنی "زیاد لە توانا" زیانی لە سوودی زیاتر دەبێت (٤٩/١٤).

کاک ئەحمەد جگە لە تێکۆشانی ئاینیی و زانستیی رۆڵێکی گەورەی کۆمەڵایەتیی بینیووە. بەرگریی لە جولەکە کردووەو لای جولەکەکان

خۆشەویست بووە. لەم رووەوە ژمارەیەک هەڵوێست و کرداری کاک ئەحمەد دەگێڕنەوە. کاک ئەحمەد لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەی نابینن لەم رۆژەدا لە نێو موسڵمانانندا ئەرکەکانی ئیسلامێتیی، وەکو غیرەت و وەفا و راستیی و میهرەبانیی و دڵسۆزیی و راگرتنی دڵی دراوسێ و رێز لە ئەهلی دین هەر ناویان ماوە؟ (٤٦/١٤)." شێخ مەحمودیش کە وەزارەتی دانا مەسیحیەکی دەستپاک "عەبدولکەریم عەلەکەی" کرد بە وەزیری دارایی.
تۆماس هۆبس مرۆڤی وەکو بوونەوەرێکی دووفاقیی بینیووە، لەبەرئەوە بە پێی ناوبراو مرۆڤ دوو سروشتیشی هەیە: یەکەم "شەیدایی" و دووەم "ژیریی". لە دەرەوەی هەبوونی حکومەت، شەیدایی مرۆڤ بە پێویستیەوە زیاد دەبێت و لە ژیرێتییەکەی بەهێزتر دەبێت. مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی شەیدایی و دەیەوێت حەزی لە چی بوو بیکات و هەرچییەکی ویست هەیبێت. بۆیە لە باری سەرەتایی بێ حکومەتدا رەوشێکی خراپ دروست دەبێت کە شەیدایی مرۆڤ تیایدا بە بێ بەربەستێک رەوتی خۆی وەردەگرێت (٧٥/١٦).
بە پێی جان جاک رۆسۆ مرۆڤ، بە چوونەناو باری کۆمەڵگاوە لە باری پێشوی سەرەتاییەوە کە دەستەڵاتێک نەبووە، کارەکتەرێکی مۆراڵیی وەردەگرێت کە لەوەپێش نەیبووە. ئەو کاتە بۆ یەکەم جار ئەرکی سەرشان جێگای ئەو بزوێنانە دەگرێتەوە کە لە ویستی لەشەوە سەرچاوە وەردەگرن و دەبنە پاڵپێوەنەری جوڵانەوەی مروڤ. ماف جێگای ئارەزوو دەگرێتەوە، کە تا ئەو کاتە مرۆڤ هەر بیری لە خۆی کردۆتەوە بەڵام ئیتر خۆی دەبینێت ناچارە لە پرەنسیپێکی ترەوە هەڵسوکەوت بکات، پێش ئەوەی گوێ لە ئارەزووەکانی بگرێت لە بەردەمی ژیریی خۆیدا راوەستێت (٣٣/١٥). بەپێی رۆسۆ ئیتر مرۆڤ ئەو کاتە کارەکتەری مرۆڤیی وەردەگرێت کە بە گوێرەی مۆراڵێک (واتە راست و هەڵەیەک، چاکەو خراپەیەک یان رێکخستنێکی کۆمەڵایەتیی) نەک راستەوخۆ بە ئارەزوو بۆ دابینکردنی پێویستییە ئاژەڵییەکانی هەنگاو بنێت. کاک ئەحمەدیش دەربارەی هەمان کێشە دەڵێت:
"سەرکەوتنی گەلی خراپ و ناهەقکار بەسەر ئەهلی هەقدا، لەبەرئەوەیە لە هەر شوێنێکدا یەکێک ئیشێکی نالەبار بکات، مادام بە پێی ئارەزووی ئادەمیزاد بێت، یارمەتیدەری زۆرەو باوەڕی پێ دەکەن.

بەڵام لە هەر لایەک یەکێک ئیشێکی باش بکات لەبەر ئەوەی کە ناکۆکی ئارەزووی نەفسی خەڵکە یارمەتیدەری زۆر کەمە، بەڵکو بێباوەڕیی بەرامبەر دەردەبڕن. لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤی پاک بەهۆی ئەو بارە نالەبارەوە نزیکە دڵی ببێت بە ئاو (٢٨/١٤). ئەم تێکستەی کاک ئەحمەد ئەوە پیشان دەدات کە فاکتەری ئارەزوو لە فاکتەری مۆراڵ بەهێزترە. مرۆڤ بڕوای بەوە کەم دەبێتەوە کە بتوانێت لە ڕێگای ڕێنماییەوە گەرەنتیی ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتیی دادپەروەرانە بکات. لە ڕاستییدا ئەرکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا ناخرێتە سەر زهنی چاک، بەڵکو سەر سیستێمی چاک. جەوهەری بۆچونەکانی کاک ئەحمەد و ڕۆسۆ و هۆبس دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوەیەی کە کۆمەڵگا لە کۆنتراکتێکی کۆمەڵایەتییدا دروست بووە. لەم کۆنتراکتەدا مرۆڤ هەم مافی هەیە هەم ئەرکی لەسەر شانە. کاک ئەحمەد لە بواری ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەدا دەنوسێت کە یەکەم، خوداوەند پەیمانی لەگەڵ هەموو بەندەکانی خۆیدا بەستووە کە دان بە پەروەردەگاریی ئەودا بنێن و بە ئافەریندەی هەموو جیهانی بزانن. دووەم، خوداوەند پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەراندا بەستووە کە هەر پەیڕەو و ئەحکامێک خوداوەند ناردوویەتی بۆیان بە گەلەکانیانی ڕابگەیەنن. سێیەم، خوداوەند پەیمانی لەگەڵ زاناکان، خاوەن دەستەڵات و خاوەن تواناکاندا بەستووە کە کە ئەمر بە چاکەو نەهیی لە خراپە بکەن. ئەگینا بە گوێرەی کاک ئەحمەد شاردنەوەی ڕاستیی، مرۆڤەکە شایستەی سزا دەکات (١٤/١٤). هیچ کۆنتراکتێک بێ مەرج نابێت. جان جاک ڕۆسۆ لەم بارەیەوە دەڵێت: "هەر میللەتێک بێ مەرج خۆی بخاتە دەستی هەر دەستەڵاتێکەوە هیچ نرخێک لە باتی وەرناگرێت." شێخ مەحمود دەڵێت: "مەرجی سەرەکی ئەوەیە هەمووومان یەک دڵ، یەک زمان و یەک جەستە بین (٩٠/٥)." هەڵوێست و سیاسەتی شێخ مەحمود سەرچاوەی لە سترەکتورێکی مۆراڵییەوە وەرگرتووە کە دروست بوو بوو ئەرکێکی مێژوویی پێ ببینرێت. شێخ مەحمود دەڵێت: "لە منداڵییەوە بیرم لە گەلەکەم دەکردەوە، من وا دروستبووم". چۆن مرۆڤ شتومەک بە گوێرەی پێویست بەکار دەهێنێت، ئاواش کۆمەڵ بەگوێرەی هەلومەرجی کات مرۆڤەکانی بەکار دەهێنێت.

کاک ئەحمەد لای خۆیەوە جیهانێکی بۆ خۆی دامەزراندبوو. کاتێک سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ویستبووی ببینێت ئەم داواکەی رەد کردبۆوەو وتبووی: "من کەسێکی هەژار و خوا پەرست کارم بە بینینی سوڵتان نییە و تەنها هەر خودا گەورەمە (١٥/٥)." بەهێزیی کاک ئەحمەد لە ئارامیی رۆحەوە هاتووە. ساکاریی و ژیانی ناو هەژارانی دەربڕی ئازایەتیی بوون. ئەو شوێنەی کە گەورەترین سوپا و بەهێزترین چەک نەیتوانی بیگرێت، کاک ئەحمەد بە سواری کەرێکەوە بە بێ ئەوەی زۆر لە خۆی بکات بوو بە نیشتیمانی. ئەو شوێنەش "رێز" بوو. رێزیش هەر کەسێک هەیبوو، تەنها بە خۆی دەشکێت. کاتێک کە کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندیی سەری گەورەی نا بە شێخ مەحمودەوە لەبەرئەوە نەبوو کە شێخ مەحمود لەو بەهێزتر بوو، بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە شێخ مەحمود میراتگری رێز بوو. ئینگلیزەکان کە هاتنە عێراقەوە زوو لە کاک ئەحمەد تێگەیشتن. میس بیل لە هێز و نفوزی شێخ مەحموددا گرنگیی کاک ئەحمەدی خوێندەوە. دوای شەڕی بازیانی ساڵی ١٩١٩، کە ئینگلیزەکان سلێمانیان گرت، مەکتەبەکەی کاک ئەحمەدیان سوتاند. لە خۆڕایی نەبووەکە خەڵکی سلێمانی سوێندیان بە گۆڕی کاک ئەحمەد و شێخ مەحمود خواردووە. کێشەکە لە بنەڕەتدا خودی کەسەکان نییە، ئەو بەها جوانیی و مۆراڵییانەن کە لای ئەوان هەبوون.

لە دوای کاک ئەحمەد، شێخ سەعیدی کوڕەزای ناوی دەرکرد. شێخ سەعید خاوەنی فەنتازییەک و هێزێکی شیعریی بوو کە لە کۆچی دوایی شێخ مستەفای برایدا نووسی:

مردنە بێ تۆ ژیانم زیلە بێ تۆ عیزەتم
دەردە خۆراکم بەبێ تۆ ژەهری مارە شەربەتم
تۆیش وەکو من قوڕ دەپێویت گەر بزانیت عیللەتم
وێڵی سەحراکەی نەهاتی غوربەتی بڕ میحنەتم
ئیرسی مەجنونە خەلاتم لەیلەکەم ون کردووە
چیم لە جاهو حیشمەت و ئیقباڵە، بۆچیمە حەشەم
وەک جەهەنەم وایە جەنەت قەبرە گوڵزاری ئیرەم

قەت نییەو نابێت فەرەج بۆ تۆ هەتا ڕۆژی عەدەم
دڵ لە ناری فیرقەتت وەک خونچە تەنگو پڕ لە غەم

لاوازبوونی دەستەڵاتی عوسمانیەکان بوو بەهۆی سەرهەڵدانی شێخ سەعید. عوسمانییەکان نەیان دەتوانی کۆنترۆڵ و سەرپەرشتیی تەواوی موڵکی دەوڵەت بکەن و باج و داهات بە جوانی کۆ بکەنەوە. بۆیە بەشێکی زۆری موڵکی دەوڵەتیان داوە بە کرێ یان بە مەزاد فرۆشتووە. شێخ سەعید و براکانی سودیان لەم هەلە بینی و بنکەیەکی ئابوریییان بۆ خۆیان پەیدا کردووە (١٣٦/٣). جگە لەمە دەوڵەتی عوسمانیی پێویستی بە کەسانی ناودار و بەنفوز بووە کە یەکێک لەوانە شێخ سەعید بوو. شێخ سەعید دوو جار بانگ کراوە بۆ ئەستەنبوڵ بۆ میوانداریی. شێخ سەعید ئەوەندە نێوانی لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمیددا خۆش بووە کە دەڵێن جفرەی تایبەتی داوەتێ بۆ پەیوەندیی ڕاستەوخۆ.

لە شێخ مارفی نۆدێ وە تا سەردەمی شێخ سەعید تێکۆشانی ئەم بنەماڵەیە لە بواری ئایدۆلۆجییدا بوو. دوای نزیکەی ٣٧ساڵ تەختبوونی قەوارەی بابانەکان یەکەم گولله ساڵی ١٨٧٧ شێخ سەعید تەقاندی. بەڵام ئەم جارەیان پشتبەست بە ئایدۆلۆجیی. لەو ساڵەدا شێخ سەعید لە شەڕی دژی قەیسەری ڕوسییدا لەگەڵ عوسمانییەکاندا بەشدار بوو (١٤٨/٣). ڕزگاربوونی "فاکتەری سروشتیی خۆڕێکخستن" لە دەست "فاکتەری ئایدۆلۆجیی ئیسلامیی دەوڵەتیی" پێویستی بە خودی ئایدۆلۆجییە ئیسلامییەکە خۆی هەبوو. شێخ مارفی نۆدێ کارخانە ئایدۆلۆجییە کولتورییەکەی لە سەردەمی بابانەکاندا دامەزراند. کاک ئەحمەد کەرەسەکەی تیادا بەرهەم هێنا. شێخ سەعید ئەم کەرەسەیەی کردی بە ئامرازو شێخ مەحمود بەکاری هێنا. کێشەکە ئەوە نەبوو کە شێخان بۆشایی نەمانی بابانەکانیان پڕ کردەوە، بەڵکو هەوڵێکی تری مێژوو بوو.

لە سەفەرێکی شێخ سەعیددا بۆ لای سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ساڵی ١٨٩٨ شێخ مەحمودی کوڕی کە تەمەنی حەڤدە ساڵ دەبێت لە جیاوازیی ژیانی ئەستەنبوڵی تورک و ژیانی

دواکەوتووی کورد سەرسام دەبێت. کاتێک شێخ مەحمود هۆی ئەم جیاوازییە لە باوکی دەپرسێت، باوکی لە رستەیەکی ساکاردا وەڵامێکی قوڵی دەداتەوە کە تا ئێستاش ئەم وەڵامە کرۆکی کێشەی سیاسیی کوردە.

شێخ سەعید دەڵێت: "ئەوان بۆ خۆیان دەژین و ئێمەش بۆ ئەوان." خەباتی ئازادیی کورد بە درێژایی مێژوو دەبێت هەوڵی رزگاربوون بووبێت لەم کۆتە سەپاوە. هەر تێکۆشەرێکیش ئەم کوردایەتییەی کردبێت کردارەکانی شایەتن و باجەکەشی داوە. شێخ مەحمود یەکێک بوو لەو کەسانەی کە ئەوەندە تەرخان بوو بۆ شکاندنی ئەم یاسا سەختە کە ئیتر ئەقڵی تیادا نەما خۆی ناو نا "فەرهادی کورد".

## شێخ سەعید و ئیتیحادییەکان

رێکخراوی ئیتحاد تورەقی لە لایەن هەندێک ئەفسەری لاوی تورکەوە بە نهێنیی لە سلانیک دامەزرا. ژمارەیەک لە تورک، عەرەب، کورد، ئەرمەن و کەسانی تر بوون بە ئەندام و لایەنگری ئەم رێکخراوە. ئیتیحاد تورەقی رۆژی ١٩٠٨/٠٧/٢٤ کۆدەتایەکی سەربازیی کرد بەسەر سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمداو ناچاری کرد دەستوری ساڵی (١٨٧٦)ی مەدحەد پاشا بێنێتەوە پێشەوە. سوڵتان لە مانگی چواری ساڵی داهاتوودا هەوڵی دا کۆدەتایەک بکاتەوە بەسەر ئیتحادییەکاندا بەڵام سەری نەگرت. ئیتحادییەکان سوڵتانیان ناچار کرد لە دەسەڵاتدا نەمێنێت و رەشادی برایان بە ناوی (رەشادی پێنجەم)ەوە کرد بە سوڵتان (٤٩/١). سوڵتان رەشاد هیچ دەسەڵاتێکی لە حوکمدا نەبوو. ئیتحادییەکان هەر ئەوەندەی جێگای خۆیان لە حوکمدا قایم کرد، کەوتنە سیاسەتی بەتورککردنی نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیی. ئیتیحادییەکان دایان نا لە ماوەی ساڵەکانی (١٩٠٨ـ١٩١٤)دا پلانی لەناوبردنی ئەرمەن و توانەوەی کورد بە ئەنجام بگەیەنن. بۆ ئەرمەنییەکان "لەناوبردن"یان هەڵبژارد و بۆ کورد لە پلەی یەکەمدا "تواندنەوە لە ناو تورکدا". بەڵام ئەگەر تواندنەوە سەری

نەگرت ئەوا کوردەکانیش کوشتار بکرێن. بۆ ڕێکخستنی ئەم پرۆسێسە لـە ڕووی یاساییشەوە قانونی تەیبەتییان دەرکرد. ڕاگوێزانی کـورد گەشـتە ئەوەی کە هەر دە کوردەو لەناو سەد تورکدا نیشتەجێ بکرێن. دەسـەلاتی تورک لە ساڵی (١٩١٥)دا ژمارەی ٧٠٠ هەزار کوردی گواستەوە بۆ ڕۆژئاوای ئەنازۆڵ بەلام لەم ژمارەیە، بەهۆی تیاچوونەوە لە ڕێگا، تەنها نیـوەی گەشتە شوێنی مەخسەد (١٥/٢).

شێخ سەعیدی حەفید نێوانی لەگەڵ سوڵـتان عەبدولحەمیـددا خـۆش بوو. چەند جارێک بانگ کرابوو بۆ ئەستەنبوڵ بۆ میوانداریی سوڵتان. کە ئیتحادی تورەقیی دەسەلاتی گرتە دەست، لقی ئیتحادییەکان لە سلێمانی پێک هات لە ناحەزن و دوژمنانی شێخ سەعید. ئەم تاقمە بریتیی بوون لە کەسانی بازرگان، ئاغـا و کەسـانێکی ئەفـسەری تـازەدەرچوی سـوپای عوسمانیی. ناحەزەکانی شێخ سەعید بە هەلیان زانی لەگەڵ موتەسەریفی شاردا کەوتنە پیلانگێڕان دژی شێخ سەعید. پیلانەکان بریتیبوون لـە دانی بەرتیل بە کاربەدەستانی عوسمـانیی و نـاردنی ڕاپـۆرتی پـڕ لـە درۆ و هەلبەستراو دەربارەی شێخان و لایەنگرانیان بۆ موسڵ و بابی عالی. ئـەم هەولانــە شــێخ ســەعیدیان خــستە بــەردەمی ئیجرائــاتی تورکــە ئیتیحادییەکانەوە. بەلام ئایا ئیتحادییـەکان چـی دەکـەن بەرامبـەر بـە ناودارێکی کورد کە پاشماوەی بابانەکان و پەروەردەی شێخ مارفی نۆدێ و کاک ئەحمەدی شێخە؟

شێخ سەعید و کوڕەکانی لەگەڵ سەید ئەحمەدی بابە ڕەسـوڵ و شـێخ ساڵحی موفتی بانگ کران بۆ سەرا. لە لایەن پۆلیس و سەربازی تورکەوە دەستبەسەر کران. بازرگانەکان چونە پۆستەخانەو تـەلگرافیان کـرد بـۆ شکات و ناڕەزایی دژی نفوزی شێخان. دوکتۆر "زیا" و ئەفسەرێک بـەناوی "فەهمی"یەوە لەگەڵ "قۆڵ ئاغاسی"دا چونە بـازاڕ و بلاویـان کـردەوە کـە حکومەتی عوسمانیی شێخانی گرتووەو دەبێت بچن بۆ سـەرا بـۆ ئـەوەی گوێ لە خوێندنەوەی فەرمان دەربارەی ئەو گرتنـە بگـرن. هـەر کەسـێک نەچێت بۆ ئەو گوێگرتنـە پیـسترین جـۆری سـزا دەدرێـت. ناوشـاریان خرۆشـان و هــانی دانیـشتوانیان دا کــە پــەلاماری ماڵــەکانیان بـدەن و

دەستدرێژیی بکەنە سەر کەسوکاریان (١٤٧/٣). شێخ سەعید و گیراوەکـان لە ژێر چاودێریی هێزێکی دووسەد کەسییدا رەوانە کران بەرەو موسڵ.

لەو رۆژانەدا رۆژنامەی "ئیرشاد" لە موسڵ و رۆژنامـەی "بەغـداد" لـە شاری بەغداد کەوتنە بلاوکردنەوەی نوسینی ناحەزانـە دەربـارەی شـێخ سەعیدی بەساڵداچوو. رۆژنامەی "بەغداد" کە خاوەنەکەی "موراد سلێمان" بوو لە ژمارەی (٢)ی مانگی مایسی ساڵی (١٩٠٩) دا لەژێر ناوی "الحالە فی کردستان و فاجیعە السلێمانیە"دا لە نوسینێکدا بە جنێوێکی پیسەوە قـسە و هێرشی خۆی ریز کردبوو (١٤٧/٣).

شێخ سەعید لە موسڵ لە خانویەکی محەمـەد پاشـا سـابونچیی، کـە لەناو کورددا بە حەمـە قـەدۆ ناسـراوە، دانـرا. رۆژی دووەمـی جـەژنی قوربان، رێکەوتی سێـشەممەی ١٩٠٩/٠١/٠٥ فەرتەنەیـەکیان بـۆ نانـەوە. کاتێک "بەهادین ئەفەندی" لەگەڵ شـێخ ئەحمـەد و شـێخ مـەحموددا لـە ساحەی "باب التۆب" دەڕۆن، ئافرەتێک دەقیژێنێت کە "بەهادین ئەفەندی" دەستی بۆ بردووە. لەمەوە خەڵکەکە پەلاماری بەهادین ئەفەنـدی دەدەن و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدیش تێـوە دەگلـێن. ژمارەیـەک جەندرمـەی کوردیش، کە لە کەرکوکەوە تازە دابەزێنرابوون، دەچنە ناو شـەڕەکەوە، چەک دێتە بـەکارهێنان و شـەڕ کاتێـک دەکوژێتـەوە کـە جەندەرمـەکان دەکشێنەوە بـۆ سـەکەنەکەیان. ئـەم بەیەکادانـە بـووە هـۆی کوشـتن و برینداربوونی ژمارەیەک. رۆژی دوایی جێگری والی موسڵ "فـەریق زەکـی پاشا حەلەبی" وەفدێکی لە سێ کەسی ناسراوی شاری موسڵ نارد بە دوای شێخ سەعیددا کە لەبەر پارستنی خۆی بێتە سەرا. شێخ سەعید بڕوای بەم نێردراوە کرد و لەگەڵ ژمارەیەک سەربازدا هێنرا بۆ ساحەی سەرا. بـەڵام کاتێک گەشتنە سەرا بە فەرمانی بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ "توفیق بەگ" دەرگای سەرا بەسەر شێخ سەعیددا داخرا. خەڵکە هاندراوەکـە هێرشـیان کردە سەر شێخ سەعید، یەکێک لە پشتەوە بەردێکی زلی دا بەسەری شێخ سەعیدداو کوشتی. ئەو پیاوەش کە لەگەڵی بوو "رەزا دەبـاغ" بـە گوللـە کوژرا. بە کوشتنی شێخ سەعید و رەزا دەباغ کۆتایی بە ئاژاوەکە نـەهات. لێشاوی موسڵییەکان رووی کردە ئەو ماڵەی شێخ سـەعیدی لـێ دابـەزی

بوو. هێرش کرایه سەر ماڵەکەو لە ئەنجامدا ١٣ کەس، کە لەگەڵ شێخ سەعید بوون، لەوێدا کوشتار کران. یەکێک لەوانە شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ سەعید بوو. ژمارەی کوژراو لە فەرتەنەکەدا بە گشتیی گەشتە ٧٠ کەس و ١٠٠ بریندار (١٦٣/٣). خانێک کە هی محەمەد پاشا سابونچیی بوو تالان کرا. بەپێی قونسوڵی بەریتانیی، ئەو کاتە حکومەت هێزێکی سوپایی ٨٥٠ کەسیی هەبوو کە دەیتوانی کۆنترۆڵی ئاژاوەکە بکات. بەلام سەرۆکی ئەرکانی فەیلەقی دەوڵەت "عەلی سەعید بەگ" بوو کە ئەندامی ئیتیحاد تورەقیی بوو. ئەم پیاوە ژنبرای موتەسەرڕیفی سلێمانی بوو، لە سەرەتاوە ئاگاداری هەموو ڕووداوەکان بوو لە سلێمانییەوە تا دامەزراندنیان لە موسڵدا (١٥٤/٣). عەلی سەعید بەگ سور بوو لە سەر ئەوەی کە سوپا دورەپەرێز لەم فەرتەنەیە بووەستێت (٤٨/١).

ڕووداوی موسڵ کوردستانی هەژان. باسکردن و بەدواداچونی ڕووداوەکان کەوتە ڕۆژنامەکانی ئەستەنبوڵەوە. ژمارەیەک بەرپرسی حکومیی لە ئەستەنبوڵەوە هاتن بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆی ڕووداوەکە.

نائارامیی ژیانی ڕۆژانەی شاری سلێمانی گرتەوە. هەمەوەندەکان کە دۆستی شێخ سەعید بوون لە ناوچەی کەرکوک لە حکومەت یاخی بوون. هەڕەشەیان لە حکومەت کرد کە تۆڵەی قوربانییەکان دەسێننەوە. هەستانی کورد لە شارەکانی کەرکوک، سلێمانی، هەولێر و هەڕەشەی چونەناو موسڵەوە بۆ تۆڵەکردنەوە، وای لە حکومەت کرد کە شێخ مەحمود جارێ لە موسڵ بهێڵێتەوە. شێخ مەحمود دوای بریندarبوون و خۆحەشاردانی لەناو خوێناو و کوژراوەکاندا، خۆی گەیاندبووە ماڵی (خدر هەمەوەندیی) ، کە موقەدەمی دەرەک بوو لە موسڵ. شێخ مەحمود لە ماڵی ناوبراوەوە گەیەندرایە ماڵی "محەمەد چەلەبیی جادر" و لەوێشەوە برایە خانوی حکومیی.

یەکێک لە داواکارییەکانی ڕاپەڕیووەکان ئەوە بوو کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا ڕێگا بدەن شێخ مەحمود موسڵ بەجێ بهێڵێت. موتەسەڕیفی کەرکوک کەوتە پەیوەندیی لەگەڵ والی موسڵدا کە شێخ مەحمود مەرەخەس بکرێت، بۆئەوەی لە ئاکامی خراپی هێشتنەوەی ڕزگاریان

ببێت. لەژێر ئەو فشارەدا کــە کــوردە راپــەڕیووەکان خــستبوویانە ســەر حکومەت، شێخ مەحمودیان لە ژێر چاودێریی مەفەرەزەیەکدا رەوانە کــرد بۆ کەرکوک. لە کەرکوک خەڵکەکە لە ماڵی سەید ئەحمەدی خانەقا و لــە تەکێی شێخ عەلی تاڵەبانیی دابەزین. شێخ مەحمود، کە ئەو کاتە تەمەنی ٢٨ ساڵ بوو، پێشوازییەکی گەورەی لە لایەن کەسایەتییەکانی کــوردەوە لێ کرا.

شــاری ســلێمانی و دەوروبــەری کەوتــە بــەر هێــرش و هەڕەشــەی جەنگاوەران بەتایبەت هەمەوەندەکان. چالاکیی بازرگــانیی، ســەفەر لــە سلێمانییەوەو بۆ سلێمانی زەحمەتیی تێکەوت. ژمارەیەک لە بازرگانەکان کەوتنە کۆکردنەوەی قەرزەکانیان و بەجێهێشتنی شار. ناحەزانی شــێخان لە کاتی پرسەی شێخ سەعیددا لە چەنــد قاوەخانەیــەک کەوتنــە قــەوان لێدان. لایەنگرانی شێخان چوونە سەر ئــەو قاوەخانانــەو قەوانــەکانیان شکاندن (١٦٠/٣). بەلام شێخ مارفی نەقیب، مامی شێخ مەحمود، کە یەکێک بوو لە دورخراوەکانی موسڵ، کــە هاتــەوە بــڕیای دا کێــشەکە شــێوەی تۆڵەسەندن وەرنەگرێت، بدرێتە دەست یاسا و مەحکەمە. لێکۆڵینەوە لەم رووداوەو مەحکەمە ساڵێک و نیوی برد. ژمارەی ١٣٠ پیاو و ١٣ ئافرەت بۆ لێکۆڵینەوە حیجــز کــران. ســەرۆکی دادگــا فایــەق بــەگ بــە یارمــەتیی لێکۆڵەرەوەی یاســایی، کــە لــە دیاربــەکرەوە هێنابوویــانن، فــەرمانی لەناوبردنی ١٣ کەس و بەندکردنی ٥٠ کەسیان بۆ ماوەی سێ ساڵ دەرکرد. بەلام ئەم حوکمانە لە ئەستەنبوڵ دانیان پێدا نەنران. هەموو تاوانبارەکان بەردران. کەس لە سەر رووداوی کوشتاری موسڵ حوکم نەدرا. مێجەر سۆن رای وابووە کە رووداوەکانی موسڵ بە پێی ئەو فەرمانانە پیادە کــران کــە بەرپرسەکانی ئەوێ وەریان دەگرت. لۆنگریک لــە بــارەی کوشــتی شــێخ سەعیدەوە وتویەتی: "کارێکی دوژمنانەی چەپەڵ دژی کەســایەتییەک کــە گەورەترین ناوبانگی هەبێت (٤٨/١ـ٥٨).

کاتێک رەشــید پاشــا رۆژی ١٩٠٩/٠٣/٠١ بــوو بــە والی موســڵ هەوڵــی ئاساییکردنەوەو کۆنترۆڵی رەوشەکەی دا. لە ســلێمانی کۆبوونەوەیــەکی رێکخست کە لایەنی شێخەکان و بازرگانــەکان تیایــدا بەشــداربن. بــەلام

بازرگانەکان ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە نەبوون. (توفیق پاشا)ی موتەسەڕیفی سلێمانی کۆمەڵێک جەندرمەی لەبەردەمیماڵی شێخ مەحموددا دانا بۆئەوەی کەس هاتوچۆی نەکات. بەڵام خەڵکی شار فشاریان بۆ خۆی هێنا. کاتێک لە سلێمانی دەرپەڕی لە نزیک خەراجیانەوە رێی پێ گیراو خۆی و قافڵەکەی چەک کران. عەبدوڵا ئەفەندی کاتب کە ئەندامێکی دیاری ئیتحاد تورەقی بوو لە سلێمانییەوە نەقڵ بوو بۆ کفری و لەوێ کوژرا. باوکی بەهادین ئەفەندی بە دەستێکی نادیار لەناوچوو. ناحەزە ئیتیحادییەکانی شێخان بنەبڕیی هەر خەریکی پیلان بوون. ئەم رووداوانەیان بە دەسیسەی شێخ مەحمود تۆمار کرد لای دەوڵەت. شێخ بە سێ ساڵ حوکم دراو فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو (١٥٤/٣).
بەڵام دەوڵەت ئەوەندەی دەسەڵات نەبوو کە کۆنترۆڵی تەواوی هەبێت بەسەر ناوچەکەدا. ئەو کاتە ساڵی ١٩٠٩ باری سیاسیی لە ئوستانە (ئەستەنبوڵ) خراپ بوو بوو، سەرۆکی عەشیرەتەکان دەستیان خستبووە کاروباری شارەکانەوە بە تایبەت لە سلێمانی و عەمارە و بەسرە. هێزی حکومەتی عوسمانیی، کە لە فەیلەقی شەشی عێراقدا خۆی دەنواند، لاواز بوو.

هێرشەکانی کورد بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانیی لە سلێمانی و ناوچەکانی سەر سنور، بەتایبەت لە لایەن هەمەوەندەکانەوە، ئەوەندە پەرەیان سەند کە لە مانگی شەشدا والی فەرمانی دا بەناردنی سوپایەک بۆ سزادانیان. بەڵام پێش ناردنی سوپا بۆ ئەوێ بەهۆی ناکۆکیی نێوان شێخ عەبدولسەلامی بارزان و (عوسمان ئاغا)وە وای کرد کە والی هێز بنێرێتە سەر شێخی بارزان. حەملە بۆ سەر شێخی بارزان سێ مانگ بەردەوام بوو بە بێ ئەوەی سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەست بێنێت. ئەم حەملەیە پەنجا هەزار قرشی تێچوو. بەڵام شێخ عەبدولسەلام دواتر بەهۆی کوردی ناپاکەوە جەندرمەی تورک گرتی و ساڵی ١٩١٤ لە موسڵ ئیعدام کرا. لە ناوچەی زاخۆش هێرش دەکرایە سەر دەوڵەت. عەشیرەتی (دلێم)یش چالاکییان بەرەو باکور نزیک موسڵ بوو بووەوە. هێرشەکانی هەمەوەندییەکانی دۆستی شێخ مەحمود وای کرد کە والی حەملەیەک لە

مانگی (١٢)دا بەرێ بخات. بەڵام جەنگاوەرکانی کورد هەر کاتێک زۆریان بۆ دەهات دەچونە سەر سنوری ئێران یان خۆیان دەکرد بەودیودا بۆ ناو ئێران (٦١/٤). شێخ مەحمود لە شاری "مەریوان"ی کوردستانی ئێران، دور لە پیلانی کوردی ناحەز و دەستەلاتی تورکە ئیتیحادییەکان، پێشوازییەکی گەرمی لێ کراو دانیشت.

پەشێویی تەنها کوردستان و ویلایەتی موسڵی نەگرتبووەوە. لە بەهاری ساڵی (١٩٠٩)دا چالاکیی عەشایەری عەرەبی سەر دیجلە و فورات دژی حکومەت دەستی پێ کرد. ئاژاوەی سەر خواروی روباری دیجلە بە دەستی شێخی موحەمەرە و شێخی کوێت لەسەر زەوی و موڵک لە بەسرە بە لابردنی والی بەسرە وەستایەوە. لەهەمان کاتدا جوڵانەوەکانی سەرەوەی روباری فورات گەشتە ئەوەی کە قونسوڵی گشتیی بەریتانیی داوای لە حکومەتەکەی کرد کە کەشتییەکی چەکدار بنێرێتە بەسرە بۆ ئامادەیی لە حاڵەتێکدا عەشایەرەکان هێرش بەرنە سەر کەسانی ئەوروپیی و ماڵ و موڵکیان. هاتوچۆی کەشتیی لە روباری دیجلەدا لەبەر رەحمەتی تەقەلێکردنی عەشایەرەکاندا بوو لە کەنارەکانەوە.

دوای شەهیدبوونی شێخ سەعید رۆڵی ئەم بنەماڵەیە لە بەردەمی کورە گەورەی شێخ سەعییدا وەستا کە شێخ محەمەد بوو. شێخ محەمەد رۆڵەکەی کرد بە دوو بەشەوە. قورئانەکەی باوکی بۆ خۆی هەڵگرت و تفەنگەکەشی دا بە شێخ مەحمود. شێخ محەمەد لە حوکمدارییی یەکەمی شێخ مەحموددا ساڵی ١٩١٨ بوو بە قازی سلێمانی. ساڵی ١٩١٩ دوای شەڕی دەربەندی بازیان و گرتنی سلێمانی لە لایەن ئینگلیزەکانەوە رووی کردە گوندی بێتوش و لەوێ کۆچیی دوایی کرد و نێژرا. بە مردنی شێخ محەمەد کۆتایی بە رێنمایی ئاینیی لە لایەن ئەم بنەماڵەیەوە هات. بەڵام رۆڵی سیاسیی لەگەڵ شێخ مەحموددا درێژەی کێشا.

### شێخ مەحمود و روسیا

شێخ مارفی مامی شێخ مەحمود و باوکی حەپسەخانی نەقیب، بەهۆی دۆستایەتیی موتەسەڕیفی سلێمانی "ئیبراهیم ئەفەندی ئەرنائۆتی"یەوە،

له ئەستەنبوڵ بۆ شێخ مەحمود تێکەوت. شێخ مەحمود لە لایەن دەوڵەتەوە لێبوردنی بۆ دەرکرا (١٥٤/٣).

شێخ دوای دوو ساڵ لە مەریوانەوە لە ساڵی (١٩١٢)دا گەڕایەوە بۆ سلێمانی. بەڵام دوای ساڵێک ١٩١٣ نوێنەری نارده لای قونسوڵی گشتیی روس "ئەرلۆف" لە بەغداد بۆ باسکردنی کێشەی کورد. لە کۆتایی مانگی چواری ساڵی (١٩١٣)دا سەید ئەحمەدی مەرەخەسی بە نوێنەر نارده لای قونسوڵی روس "کیرسانۆف" لە موسڵ. ئامادەیی کوردی پیشان دا بۆ شۆڕشێک دژی عوسمانییەکان لە حاڵەتێکدا روسیا پشتیان بگرێت و یارمەتیان بدات. دوبارە جارێکی تر لە مانگی شەشدا نوێنەری چووەوە لای قونسوڵی گشتیی "ئەرلۆف" لە بەغداد بۆ هەمان مەبەست. ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو سەردانانەدا نەڕۆشت کە ئەحمەد بەرزنجی سەردانێکی تری بۆ لای جێگری قونسوڵی روسیی لە موسڵ لە مانگی یەکی ساڵی (١٩١٤)دا کرد. بەرزنجیی نامەیەکی شێخ مەحمودی پێ بوو بۆ قسەکردن لە بارەی رەوشی سلێمانییەوەو و زانیاریی وەرگرتن دەربارەی هەڵوێستی روسیی.

شێخ مەحمود دەیویست پشتگیریی روس بۆ سیاسەتی خۆی وەربگرێت. بەڵام سیاسەتی دەرەوەی روسەکان لەسەر ئەو بناغەیە بوو کە سود لە کورد دژی عوسمانییەکان وەربگرن لە حاڵەتێکدا جەنگ داگیرسا. لەگەڵ ئەوەدا کە ژمارەیەک بەرپرسی روس بۆچونێکی جیاوازیان هەبوو لەو سیاسەتە. جێگری قونسوڵی روسیی لە (کوی) و قونسوڵی روسی لە ئورمییە پێچەوانەی هەڵوێستی حکومەتەکەیان بوون دەربارەی کێشەی کورد. هەندێکیان پێشنیاریان کرد کە یارمەتیی دارایی شێخ مەحمود لە سنوری ٢ـ٣ هەزار رۆبڵدا بدەن بۆ راکێشانی کورد بەلای خۆیاندا. هەروەها جێگری سەفیری روسیی لە تاران "فلادیمیر مینۆرسکی" لە راپۆرتێکی نهێنییدا پێشنیاری یارمەتیی پێویستی کوردی کردبوو لە ناوچەی سلێمانی و ئیشکردن بۆ پێدانی ئۆتۆنۆمیی بۆ زامنکردنی ناوچەی نزیک روسیا لە ولاتی فارسدا و بۆ بەهێزکردنی نەخشەی هێرشی روس بۆ سەر ناوچەی موسڵ لە حاڵەتی روودانیدا. ئەم بۆچوونەی مینۆرسکی

جیاواز بوو لە بۆچوونی حکومەتەکەیەوە کە سەفیر لە وەزارەتی دەرەوەی روس "جریکۆف" دوپاتی کردەوە کە مەسەلەی کورد تەنها لە کاتی بەرپابوونی جەنگدا جێگای سەرنجە. ئەویش پێویستە بە ئاگالەخۆبوونێکی تەواوەوە پەیوەندییان لەگەڵدا ببەسترێت (٧٩/١).

لە هەمان کاتدا شێخ مەحمود لە ساڵی (١٩١٣)دا لە پەیوەندییدا بوو لەگەڵ دەستەیەک کوردا بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی هەڵگیرسانی راپەڕین دژی دەوڵەتی عوسمانیی. ئەم کەسانە بریتیی بوون لەم ناوانە: جەلال بابان، کە ئەفسەرێکی عەسکەریی بوو لە سوپای تورکییدا لە چەمچەماڵ، بابەکر ئاغای پشدەر، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، ئەحمەد بەگی ساجێبقران (حەمدی)، ئیسماعیل حەقیی، و فایەق تۆفیق کە بە فایەقی تاپۆ ناسرابوو. بەڵام پاش قسەلێکردن گەشتنە ئەوەی کە راپەرینەکە دوا بخەن و کۆفایی بەوە بهێنن یاداشتێکی نهێنیی بدەن بە کۆمەڵەی دەوڵەتان دەربارەی کێشەی سنور. ئەو کاتە سنوری نێوان ئێران و تورکیایان دەست نیشان دەکرد و دەچەسپاند. لە یاداشتەکەدا نوسییان:

"بۆ دەوڵەتە رۆژئاواییەکان نییە زەوی وڵاتەکەمان دابەش بکەن و بیدەنە گەلێکی تر. موڵکییەتی ئەم زەوییانە بۆ خەڵکەکەی خۆی دەگەڕێتەوەو ئیشەکەتان پێچەوانەی مافی مرۆڤ و سەربەستیی و دیموکراتییە. بۆ بێگانە رەوا نییە ئەمە بکەن..."

شێخ مەحمود خۆی چووە سنور و یاداشتەکەی دانی. کاتێک لیژنەکە هاتە سلێمانی لە ماڵی "عەبدولرەحمان بەگی بانق" یاداشتێکی تریشی دایە دەستیان. لیژنەکە فەرەنسیی/ئینگلیزیی بوو. لیژنەکە بە شێخ مەحمودیان راگەیاند: "تازەکردنەوەی سنور و پارچەکردنی کوردستان شتێکی براوەیەو بەدەست ئەوان نییە، کوردستانی خواروو و رۆژهەڵات دەبنە ناوچەی دەسەڵاتی روسیای قەیسەریی و عێراقی عەرەبیش

دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەوە. لەبەرئەوە چی داخوازییتان هەیە داوا لە روسیای قەیسەریی بکەن، ئەم بڕیارەش نهێنییە."

شێخ پیاوێکی باوەڕپێکراوی بە ناوی "عەبدوڵا ئاغای حاجی حەمە سەعید" نارد بۆ خانەقین بۆ پەیوەندیی بە کەسێکی سیاسیی روسەوە. پاش ٤ مانگ وەڵامی روسەکان هاتەوە: "هەرێمی کوردستان ئێستا بۆتە ناوچەی دەسەڵاتی ئینگلیز و پێویستە نەخشەکەتان بگۆڕن و یادداشت بدەن بە دەزگای ئینگلیز، ئێمەش لە کاتی خۆیدا یارمەتیتان دەدەین (٢٢/٥)."

ئەو سەردەمە سیاسەتی بەتورکتەماشاکردنی نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی لە لایەن ئیتیحادییەکانەوە بوو بە هۆی ئەوە کە هەستی نەتەوایەتیی میللەتانی تری وەکو عەرەب، یۆنانی، سربیی بجوڵێنێت یان هەست بە مەترسیی بکەن لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستەدا. لە مانگی دەی ساڵی (١٩١٢)دا جەنگ لە نێوانی وڵاتانی بەلقان (یۆنان، بولگاریا، سەربیا و مۆنتی نێگرۆ) و دەوڵەتی عوسمانییدا دەستی پێ کرد. ئەنجامی جەنگ لە کۆتایی مانگی حەوتی ساڵی دوایيدا ١٩١٣ بە سەربەخۆیی وڵاتانی بەلقان هات. هەر ئەم سیاسەتەی بابی عالی نەریتی یەکسانیی و رێگادانیشی بە ئاینیی دی شکاند. ژمارەیەک گوندی "القوش" کە بڕوایان بە کەنیسەی کلدانیی کاسۆلیکیی بوو ویستیان بچنە سەر باوەڕی ئەسڵیی نەستوریی. بەڵام حکومەتی بابی عالی ئەم ویستەی رەت کردەوە. هەروەها بەوە رازی نەبوو کە مەترانی ئەو گوندانە لە لایەن مارشەمعونەوە دابنرێن. دانیشتوانی ئەو گوندانە پەنایان بردە بەر نائیبی قونسڵی گشتیی حکومەتی بەریتانیا لە موسڵ بەڵام ئەوان لەو کاتەدا نەیان ویست دەست بخەنە کارێکی ناوخۆیی واوە (٧٢/٤).

والی بانگی "شێخ مارفی حەفید"ی کرد بۆ موسڵ. والی بە شێخ مارفی مامی شێخ مەحمودی راگەیاند کە ئاگای لە جوڵانەوەکانی شێخ مەحمودە. هەر پەیوەندییەک بە هەر لایەکەوە یان هەر جوڵانەوەیەکی سیاسیی لەمەولا بکەن کەس ناتوانێت رێگەگریی بکات لە لەناوبردنیان. شێخ مارف دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ دۆستانی خۆیان

کرد. بڕیاریان دا شێخ مەحمود خۆی ون بکات و ئەمانیش سەری خۆیان کز بکەن تا ڕۆژی خۆی. شێخ مەحمود بە ناوی دیارییەوە هەندێک کەلوپەل وهەزار لیرەی ڕەشادیی بۆ والی نارد. شێخ سلێمانی بەجێ هێشت و چوو بۆ داریکەلیی، دوای ماوەیەک، لەبەر خۆپاراستن لە شەڕی سەربازی عوسمانیی و پیلانی کوردی ئیتیحادیی، ڕووی کردەوە "مەریوان" لە ڕۆژهەلاتی کوردستان. ئەم ناوچەیە لە ژێر نفوزی دوو سەرکردەی کورددا بوو؛ "مەحمود خانی دزلی" و "مەحمود خانی کانی سانان". شێخ مەحمود لە لایەن ئەم دوو سەردارەوە پێشوازیی گەرمی لێ کرا. مەحمود خان لە کۆبوونەوەیەکدا وتی: "تۆ لە ناوماندا نامۆنیت، لە نیشتیمانی خۆتدایت و ئێمەش لەسەرمانە ڕێزت لێ بگرین، یارمەتیت بدەین و ئەوەی بۆ ولاتمان باشە بیکەین."

لە قەلای مەریوان ژمارەیەک سەرۆکهۆز و سیاسیی و مەلا و ناوداری کورد کۆبوونەوە. لەوێش بڕیاری ئەوە درا کە ڕاپەڕین ساز نەکرێت. بەلام بە دوو نارەزاییینامە کۆتایی بهێنرێت بە کۆبونەوەکە، یەکەمیان بدەن بە بالوێزخانەی دەولەتان و لەمەسەلەی ڕزگاریکردنی کورد و چارەنوسی تێیان بگەیەنن، دووەمیان دەربڕینی نارەزایی بوو بەرامبەر بە سولتەی تورک (٢١/٥).

شێخ مەحمود ئەو ماوانە هەولی لەگەل ڕێنماییکردنی خەلکییدا دەدا، پێی دەوتن: "پێویستە بزانن چۆن بژین و بۆ کێ تێدەکۆشن. دەبێت بە زمانی کوردیی بخوێنن و بنووسن، بۆئەوەی زمانەکەتان بگاتە پلەی زمانە زیندووەکانی جیهان." شێخ مەحمود لای وابوو کە تورکەکان بە ناوی ئایینەوە کوردستانیان داگیر کردبوو (٩٢/٥).

## جەنگی جیهانیی یەکەم

ڕۆژی ١٩١٤/٠٨/٠٢ جەنگی جیهانیی یەکەم دەستی پێ کرد. عوسمانییەکان ڕۆژی ١٩١٤/١١/٠٥ چوونە بەرەی ئەلمانیاوە لەم جەنگەدا. عوسمانییەکان هێزیان لە بەرامبەر ڕوسیادا شانسی نەبوو. سوپای عوسمانیی لە چاو سوپای ولاتە ئەوروپییەکاندا لاواز و کەمچەک و تفاق بوو. عوسمانییەکان

بەرەورووی روسیا بوونەوە. هێزی روسیا لە سەرووی ئێران دەستێکی باشی لە هێزی عوسمانییەکان وەشاند. سوپای روسیی بە کوردستانی ئێراندا هاتەخوارەوە بەبێ ئەوەی هێزێک هەبێت بتوانێت بەرامبەری بووەستێتەوە. دانیشتوانی کوردستانی ئێران لەبەردەمی داگیرکردنی خاکەکەیاندا لە لایەن روسەکانەوە کەوتنە نەهامەتییەوە. ژمارەیەک لە دانیشتوان هەڵهاتن بەرەو کوردستانی عێراق. سەرۆکهۆز و خێڵەکان پەنایان بردە بەر شێخ مەحمود بۆئەوەی هێزێک رێک بخەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی روسەکان. عوسمانییەکانیش لە لای خۆیانەوە هەوڵیان دا بۆ رێکخستنی هێزێک لە کوردەکان خۆیان بۆ راوەستان لەبەردەمی ئەم دابەزینانەی سوپای روسییدا. عوسمانییەکان پەیوەندییان کرد بە شێخ مەحمودەوە بۆئەوەی ناکۆکیی نێوانیان بخەنە ئەولاوەو بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی ژێردەسەڵاتی عوسمانیی، لە بەرامبەر هەندێک باشکردنی باری کورد و ناوچەی کوردستاندا، هێزێک دروست بکات بۆ وەستانەوە دژی سوپای روسیا. شێخ مەحمود سەرەتای ساڵی ١٩١٥ گەڕایەوە بۆ سلێمانی. لە بادینانەوە تا خانەقین کورد لەژێر سەرکردەیی شێخدا کۆبۆوە. هێزێکی کوردیی شانبەشانی سوپای عوسمانیی دژی روسیا پێک هات. هێزی کورد بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمود بەشداریی کرد لە بەربەستکردنی هێرشی سوپای روس بۆ کوردستانی عێراق. سوپای روس شکێنرا و کرایەوە بە دیوی ئێراندا. شێخ مەحمود وەکو پاڵەوان پێشوازیی لەناو میللەتدا لێ کراو بوو بە جێگای پیاهەڵدانی شاعیران، لەوانە شێخ عەبدولحەمید کانی مشکانیی (٨٥/١).

بەریتانیا رۆژی ١٩١٤/١١/٢٢ بەسرەی داگیر کردبوو. حکومەتی عوسمانیی کەوتە رێکخستنی هێز لەناو عەرەب و کورددا. ژمارەیەک لە کوردیش لە هەولێر، موسڵ، کەرکوک، سلێمانییەوە بەسەرکردایەتیی کەسایەتییە کوردەکان بەرێکەوتن بۆ شەڕی دژی بەریتانیا لە بەسرە. یەکێک لەو سەرکردانە شێخ مەحمود بوو کە بە هەزار سوارەوە رووی کردە خوارووی عێراق. ئەم هێزە لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا بە گەرمیی پێشوازیی لە لایەن خەڵکەوە لێ کرا. هەرچییەکیان پێویست بوو بە بێ بەرامبەر پێیان

دەبەخشین. ئەحمەد زەنگەنە کە یەکێک بوو لە بەشدارانی هێزی شێخ مەحمود وەسف دەکات کە گەشتونەتە بەغداد خەڵک لە هەردوو لای جادەوە ریزیان بەستبوو، هەلهەلە و چەپڵەیان بۆ لێ دەدان. بە تەپڵ و دەفەوە گۆرانیی و حەدیسی ئاینییان بەسەردا دەوتن. ژنان لەسەربانە بەرزەکانەوە تەماشای ئەم کاروانەیان دەکرد لە ناوچەی نزیک پردی عەتیق. بەغداد بە پیاو، ژن و منداڵەوە بۆ پێشوازیی برا کوردەکانیان چوبوونە دەرەوە (٨٨/١).
هێزی کورد رووی کردە کوفە و لەوێوە بەرەو سەماوە. حاجی "عەبد جریان" لەوێبوویەکی سەماوەبووە وتویەتی کە خەڵکی سەماوە تامەزرۆ بوون کە شەرەفی ئەوەیان هەبێت شێخ مەحمود و جەنگاوەرەکانی میوانیان بن. شاعیرەکان شیعاریان بەسەردا دەخوێندنەوە، یەکێک لەوانە تایبەت بوو بە شێخ مەحمود کە دەیان وت: "دوولەسەرسێی بەهەشت بۆ (هادی)مان و یەک لەسێکەی تری بۆ کاک ئەحمەد و منداڵەکانی." یان دوولەسەرسێی بەهەشت بۆ (هادی)مان و یەک لەسێکەی تری بۆ شێخ مەحمود و کوردەکانی."
جەنگاوەرەکان رێگای ئاوییان گرت بۆ ناسرەیە کە شوێنی کۆبوونەوەی زۆربەی هێزەکان بوو لە هەموو عێراقەوە. لە ناسرییەوە جەنگاوەرەکان گەشتنە ناوچەی "نەخیلە". هێزی عوسمانیی لە ناوچەی "برجسیە" خڕبوو بووەوە. سلێمان بەگ، کە لە عوسمانییەکان بوو، بوو بە فەرماندەی هەموو هێزەکان. شەڕی سەرەکیی رۆژی ١٩١٥/٠٤/١٢ دەستی پێ کرد. دوو رۆژ دوای ئەوە سوپای بەریتانیی هێرشی کردەوە سەر لەشکری عوسمانیی و لەژێر گوللە و تۆپبارانی بەریتانییدا سوپای عوسمانیی و هێزی جەنگاوەرانی کورد و عەرەب زیانێکی باشیان لێکەوت. لەشکری عوسمانیی شکا. ژمارەی کوژراوانی جەنگاوەرانی کورد و عەرەب حساب کرا بە نزیکەی ٣٠٠٠ کەس. لەناو ناودارانی کورددا شێخ ستار تاڵەبانیی لە گوندی بایاوا و شێخ لەتیف تاڵەبانیی لە گوندی کانی قادر، کە هەردوکیان خەڵکی کەرکوک بوون، کوژران. رەشید پاشا کە پێشتر موتەسەریفی مونتەفیک بوو لە خەڵکی سلێمانی، ئەویش لە کوژراوەکان بوو. فەرماندەی لەشکری عوسمانیی "سلێمان عەسکەریی"ش خۆی کوشت. شێخ مەحمود و سەید ئەحمەدی خانەقا بریندار بوون.

شێخ مەحمود بە هەڵسەنگاندنی شەڕەکە بۆی دەرکەوت کە عوسمانییەکان لە جەنگدا بە بەریتانیای دەدۆڕێنن. لە کشانەوەدا لەناسریە گفتوگۆیەک کرا کە پەیوەندیی بکرێت بە بەریتانیاوە بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوانەوە دەسکەوتێک بۆ کورد بەدی بهێنن. یەکێک لە ئامادەبووەکان روو دەکاتە "تۆفیق وەهبی" و پێی دەڵێت ئەگەر لەبەر شێخ مەحمود نەبووایە ئێستا بانگی تورکەکانی دەکرد هەڵی بواسن (٧/؟). کوردەکان بەخۆیان و هێزەکانیانەوە گەڕانەوە بۆ کوردستان.

بە گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان، عوسمانییەکان کەوتنە بەهێزکردنی لە شەڕیدا دژی داگیرکردنی کوردستان لە لایەن روسیاوە. بە پێی رۆژهەڵاتناسی روسیی "لازاریف" ئەم جارەیان عوسمانییەکان پەیمانیان دا بە شێخ مەحمودی حەفید و سەرکردەکانی تری کورد کە ئۆتۆنۆمییان بدەنێ لە بەرامبەر بە شەڕیاندا دژی روس (٩٥/١).

روسیا لە رێگای سەفوەت بەگەوە پەیوەندیی کرد بە شێخ مەحمودەوە. ناوبراو نامەیەکی شەخسیی نارد بۆ شێخ مەحمود، ئەمە دەقی نامەکە بوو:

لە فەرماندە سەفوەت بەگی نوێنەری سوپای قەیسەری روسەوە بۆ شێخ مەحمود

دوای رێز و سلاو، (ئەحمەد سورێنیی)مان بە قورئانێکەوە نارده لاتان، بۆئەوەی دڵنیابن لە قسەکانمان. لای جەنابتان ئاشکرایە حکومەتی عوسمانیی بەرەو نەمان و توانەوە دەڕوات، سوپا و دەزگای دەوڵەتییان بەرەو وەستان دەچێت، تەنها سوپای کورد نەبێت. ئەوان ناتوانن بەرەنگاریی قەیسەر بکەن.

برام روسەکان خاوەنی سوپایەکی مەزن و چەکی کوشندەن. دڵنیابن کۆتایی جەنگ بەم زوانە لە بەرژەوەندیی ئێمە دەبێت و بەسەرکەوتنی ئێمە کۆتایی دێت. لەبەرئەوە حەز بە برایەتییتان دەکەم، تکایە قسەمان وەرگرن و دەوڵەتی قەیسەریش ئامادەیە بەهەموو جۆرێک یارمەتیتان بدات. ئێمە پێویستمان بە یارمەتیی ئێوەیە، بۆئەوەی بەیارمەتیی هەردولا تورک لە ولاتەکەماندا دەربکەین. من نامەوێت ئێوە دوژمنێکی بەهێز و بەتوانای وەکو دەوڵەتی قەیسەرتان هەبێت. تکایە وەلامم بدەرەوە.

**سەفوەت بەگ**

**سەقز/١٩١٥/٠٩**

"عەبدوالڕەحمان بەیاتی" دەنوسێت "نامەکـە لـەو کاتـەدا نوسـراوە کـە ئەڵمانیا فشاری هێنابووە سەر هێزەکـانی روسـیا لـە سـاحەی شـەڕی رۆژهەلات لە ئەوروپا. سەرکردایەتی روسیی تەماشای شـێخ مـەحمودیان کـردووە وەکـو وەرەقەیـەکی بـراوە لـە رێـڕەوی گـۆڕانی سـتراتیجیی رووداوەکاندا، بە لایەنی کەمەوە لەناوچەی کوردستان، و بەرزکردنەوەی تای تەرازوی روسیا لەوێدا. جگـە لەمـەش بـۆ پەیـداکردنی زەحمـەتیی لەبەردەمی سوپای عوسمانییدا لە بەرەورووبوونەوەی هێزەکانی ئینگلیزدا کە لە خوارووی عێراقەوە هەڵدەکـشان." شـێخ مـەحمود لـە (١٩١٥/٠٩)دا وەلامی نامەکەی بەم جۆرە دایەوە:

لە شێخ مەحمودەوە بۆ سەفوەت بەگی نوێنەری سوپای قەیسەر

دوای سلاو، برام سەفوەت بەگ! من نیشتیمانم لـە درنـدەیی سـوپای قەیسەر دەپارێزم، هیواشم پێی نییەو پێویستیشم بە دیـاری ئـەو نییـە. سوپای قەیسەری خوێنڕێژ کوردی لەناو برد. تۆ چاکم دەناسیت. من لـەو دوژمنە ناترسم کە بیناسم. هەموو هیوام ئەوەیە کورد و کوردسـتان لـەو دوژمنە رزگاری بێت. ئەوەی دەستی یارمەتییمان بۆ درێژ بکات دۆستمانە. وەلامی دوژمنەکانیشمان لە لوولەی تفەنگەکانمانەوە دەدەینەوە (١٨٧/٥).

دڵسۆزت مەحمود

لـە (١٩١٥/٠٣)دا روسـیاو بـەریتانیا رێکـەوتنێکی نهێنییـان مۆرکردبـوو دەربارەی دابەشکردنی زەوی ئێران لە نێوانیانـدا. ئـەم دوو ولاتـە پێـشتریش سالّـی ١٩٠٧ رێکـەوتنێکی لـەم جۆرەیـان لـە نێوانـدا هـەبوو. چالاکییـە سـەربازییەکانی روس هـەر لـە سـەرەتای جەنگـەوە پانتاییـەکی گـەورەی کوردستانی ئێـرانی گرتـەوە. ئـەم هەرێمـە شـوێنێکی سـتراتیجیی بـوو بـۆ تەحـەکومکردن بەسـەر ناوچـەی رۆژهـەلاتی ناوەڕاسـتدا. ئەڵـمانیا و عوسمانییەکان گرنگییـەکی گـەورەیان پـێ دەدا. لـە کاتێکـدا کـە هێزەکـانی بەریتانیا لە "کوت" لە لایەن هێزی عوسمانییەوە دەوری گیرا بوو، هێزی روس

له سەرەتای بەهاری ساڵی (١٩١٦)دا لــە سێ قۆڵــەوە (خانــەقین، ڕەوانــدز، سلێمانی) ڕوویان کردە عێراق. هێزی سەر خانەقین لە لایەن عوسمانییەکانەوە بەرهەڵــستیی کــرا و کرایــەوە بــەودیودا. هێــزی ســەر ڕەوانــدز لــە رایــات و دەربەندەوە گەشتە ڕەواندز و چەند حەفتەیەک لــەوێ مانــەوە. لــە ســەرەتادا بــەهۆی بوغزانــدنی ئیتحادییەکانــەوە خەڵــکێک بــەلای ڕوســەکاندا دایــان دەشکاند، بەڵام خراپەکاریی سوپای ڕوس وا کرد کە هەڵوێــستیان بگۆڕدرێــت. ڕاپۆرتە بەریتانییەکان پیشانی داوە کە لــە خانــەقین و شــوێنەکانی تــر، کــە سوپای ڕوسی تێچووە، ترس و تۆقانێن کەوتۆتە دڵی خەلکەکەوە. ئەمە بــووە هۆی هەڵوێستی خراپ بەرامبەر بــە هێــزی داگیرکــەر لــە عێراقــدا بەگــشتیی (بەریتانیا و ڕوسیا). هێزی ڕوسیی لە قۆڵی سلێمانییەوە "پێنجــوین"ی گــرت و تا شاخی تاریەر لە شارباژێڕ هات (٢٦/٥). شێخ مــەحمود لێی ئــەم هێــزە لــە بەرەی عوسمانییەکاندا لە پێنجوێن، مــەریوان، بانــە جــەنگا. ســوپای ڕوس کرایـــــــــــەوە بـــــــــــە دیـــــــــــوی ئێرانـــــــــــــدا.

دوای ئەم سەرکەوتنە، قوماندانی تورک "حیلمی بــەگ" و "عەباســی بەتلیــسی" کەوتنە ناکۆکیی کوردەکان و قوماندان بە تۆمەتی کەمتەرخــەمیی، حــەوت لــە سەرۆکە کوردەکانی جافی دایە بەر دەسڕێژی لــەناوبردن (٢٧/٥). ســەرچاوەی تورکیی بەو شێوەیە باسی هێزی کوردی کردووە کە گرنگییەک و کاریگەرییــەکی ئــەوتۆی نــەبووە لــە ڕێــڕەوی شــەڕەکاندا، بــە زۆریــی چالاکییــان لەســەر هێرشکردنە سەر سوارەکانی ڕوس بووە. جگە لە دەوریان وەکــو دەلیــل لەبــەر شارەزاییان دەربارەی ناوچەکە، دەســتێکی گــەورەیان هــەبووە لــە ڕاووڕوتی هێزی ڕوسدا کە کشاونەتەوە (٩٨/١).

جەنەراڵ (براتۆڤ)ی ڕوس بۆ سودبینین لە ساردیی نێوان شــێخ مــەحمود و تورک دوو نامە بە دوای یەکدا و شمشێرێک بــە عەبــدولاخانی گولانییــدا، کــە یەکێک بووە لە کوردەکانی ســابلاخ، نــارد بــۆ شــێخ مــەحمود. براتــۆڤ لــە نامەکانییدا دەڵێت کە ئەوان چاویان نەبڕیووەتە وڵاتی کوردان. کوشتنی شــێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود لە لایەن تورکەکانــەوە لــە موســڵ ساڵــی ١٩٠٩ دەهێنێتەوە یادی شێخ مەحمود. تورک بە دوژمنی هەردوو لا لە قەڵــەم دەدات و ئامادەیی خۆی بۆ یارمەتیی کورد پیشان دەدات. شێخ مەحمود لــە وەڵامەکەیــدا

دەست بۆ کردارە خراپەکانی روس رادەکێشێت کە لەگەڵ ئەو نیەتە پاکەدا یەک ناگرنەوە کە براتۆف دەیخاتە روو، هەروەها راسپاردەی دەمییش دەنێرێت بۆ براتۆف. براتۆف لە وەلامدا پەنجە رادەکێشێت بۆ ئەو کوشتارانەی کە لە ناوچەی دیاربەکر، بەتلیس، وان، باشقەلا، عەزیزییە، قارس و ئەردهاندا لە لایەن تورکەوە دەرهەق بە کورد و ئەرمەن کرابوون. لە هەمان کاتدا دان بە خراپەکارییەکانی خۆیاندا دەنێت و هۆیەکەی دەخاتە سەر شانی ئەو ئەرمەنییانەی کە هاتونەتە ناو سوپای روسەوەو دەیانەوێت تۆڵەی خۆیان لە عوسمانیی بسەندنەوە. بەلام براتۆف ئامادەیی خۆیی پیشان دەدات کە بەر لەم خراپەکارییە بگرێت کە بۆ ناوبانگی سەربازیی روس خراپە وەکو شێخ مەحمود بۆی نوسیووە (٣١/٥).

خراپجولانەوەی تورکەکان لەگەڵ کورددا بووە هۆی ئەوەی شێخ مەحمود سەرەتای ساڵی ١٩١٨ لە مەیدانی شەڕ کشایەوە، گەڕایەوە بۆ سلێمانی و جەنگاوەرەکانی چونەوە ماڵی خۆیان. رووداني شۆڕشی (١٧) ئۆکتۆبەری سۆشیالیستیی ساڵی ١٩١٧ بووە هۆی گۆڕینی سیاسەتی روسیا وهەڵوێست لە جەنگ. روسیای سۆشیالیست خۆی لە جەنگ کێشایەوەو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانییدا پێکهاتن. ئەو

بۆشاییەی کشانەوەی روسیا بەجێی هێشت کەوتە بەردەمی بەریتانیا و دەبوو حسابی بۆ بکات.

بەریتانییەکان گفتیان دابوو بە شەریف حسەین دوای تەواوبوونی جەنگ لە بەشە عەرەبییەکەی دەوڵەتی عوسمانییدا ولاتێکی عەرەبیی بۆ دابمەزرێنن. شەریف حسەین لە مانگی شەشی ساڵی (١٩١٦)دا دژی عوسمانییەکان چووە بەرەی بەریتانیاوە لە جەنگەکەدا (٦). شێخ مەحمود پەیوەندیی کرد بە شەریف حسەین، (شەریفی مەکە)وە، بەلام هیچ وەلامدانەوەیەک و هاوکارییەکی دیار لە نێوانیاندا دەرنەکەوت. بەپێی سەرچاوە یەکێک لەو نامانە دەست عوسمانییەکان کەوت و لە ئاکامی ئەمەدا عوسمانییەکان کەوتنە هەوڵی کەمکردنەوەی نفوز و پیلانگێڕیی لە شێخ مەحمود. بە پیلانێک ماڵەکەشیان لە سلێمانی تالان کرد (١٠٠/١).

## هاتنی ئینگلیزەکان بۆ کوردستان

ئینگلیز لە رۆژی (١١)ی مانگی (٣)ی سالّی (١٩١٧)دا بەغدادی داگیر کرد. هێزەکانی بەریتانیا بەردەوامییان دا بە گرتنی عێراق. سوپای بەریتانیی سێ هێزی بە سێ قۆلّدا خستە گەڕ. یەکەم، قۆلّی دیالە بەرەو زنجیرە چیای حەمرین. دووەم، قۆلّی روباری فورات. سێیەم قۆلّی روباری دیجلە. ئەم قۆلّە بەرەو سەروو لە هەموویان پرمەترسیی تر بوو لەبەر هەبوونی هێزی عوسمانیی بە چڕیی. رۆژی ١٩١٧/٠٤/٢٦ سەرۆکی ئەرکانی سوپای بەریتانیی فەرمانی پێشڕەویی دەرکرد بۆ جەنەراڵ مارشاڵ. مارشاڵ لە جێگای جەنەراڵ مۆد، کە بە نەخۆشیی کۆلێرا مرد، دانرابوو (١٠١/١). سەرۆکی ئەفسەرە سیاسییەکان "سێر برسی کۆکس" کەوتە ناردنی نامە و نوێنەر و پەیوەندییکردن بە ژمارەیەک سەرۆک هۆز و کەسایەتیی لە کەرکوک و سلێمانی. کۆکس گفتی سیاسیی و ئابوریی دەدا بەو کەسانە لە بەرامبەر هاوکارییان لەگەڵ بەریتانیادا. ئەم ئامرازە سیاسیەی کۆکس لە بەکارهێنانی گفتدا و رێگا خۆشکردن بۆ هێرشی سوپای بەریتانیی ئەنجامی بەدەست هێنا. ئەمە وای کرد کە کۆکس بە رەسمیی پشتگیریی بەردەوامبوونی سوپای بەریتانیی لە داگیرکردنەکانیدا بکات. روسەکان لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەی داگیرکراویان خراپ بوون ژمارەیەک لە کورد هەڵهاتبوون بۆ ناوچەی ژێر دەسەلاتی عوسمانیی. ئەمە کاری کردبووە سەر هەڵوێستی خەڵک بەرامبەر بە بەریتانیاش. لە رووی سەربازییشەوە بەریتانیا دەبوو شوێنی روسیا پڕ بکاتەوە لە خانەقین. سوپای بەریتانیی لە مانگی دوانزەی سالّی (١٩١٧)دا خانەقینی گرت. خانەقین پێش، کشانەوەی روسیا لە جەنگ لە لایەن روسیاوە گیرا بوو. هەروەها رۆژی ١٩١٨/٠٤/٢٨ کفری گرت و رۆژی دوایی لە (٢٩)ی ئەپریلدا توزخورماتو و لە رۆژی (١٩١٨/٠٥/٠٧)شدا کەرکوکی داگیرکرد (١٠٣/١). بە نزیکبوونەوەی بەریتانیا و بلاوبوونەوەی داگیرکردنەکانی، ژمارەیەک سەرکردەکانی کورد بەتایبەت لە هەمەوەند و یەزیدیی پەیوەندییان کرد بە بەریتانیاوە (١٠٣/١).

شێخ مەحمود و کەسانی تری سیاسیی و ئـازادیخوازییش کەوتبوونـە پەیوەندیی، کۆبوونەوەو نامەگۆڕینەوە لەگەڵ کاربەدەسـتانی ئینگلیـزدا لە خانەقین و کفری و بەغداد. شێخ مەحمود نامەیەکی نارد بۆ "ولـسن"ی نائیبی حاکمی گشتیی عێراق. لە نامەکەیدا نوسی:

"مەبەستی دەوڵەتە گەورەکان لە جەنگدا، هـەروەکو لـە بەیاننامەکەی سەرەک کۆماری ئەمریکا و چەرچڵی شالیاری بەریتانیادا هاتووە، داننانە بە مافی گەلە مافخوراوەکـان و سەربەخۆییاندا. ئێمە بە پێی باوەڕمان بـەم بەیاننامەیـەو بەڵێنەکانی دەوڵەتە گـەورەکان هیوامـان وایـە بـەچاوێکی سۆزەوە سەیری مەسەلەکەمان بکرێـت و لـە رزگـارکردنی کوردسـتان و دەرکـردنی تـورک و بلاوکردنـەوەی بـانگی سەربەخۆییدا یارمەتییمان بدەن (٣٦/٥).

باوەڕپێکراوی کوردان
حەفیدزادە مەحمود

ولسن دەربارەی ئەم نامەیە نوسیویەتی کە نامەکـە بریتیـی بـوو لـە پیرۆزبایی سەرکەوتنی بەریتانیی
و چاوەڕانیی کورد بۆ بوژانەوە لە ژێر سـایەی حـوکمی بەریتانییـدا. جگە لەمە لە نامەکەدا شێخ مەحمود تکـای لـێ کـردووە زامـنی تـەواوی ئەوەی بکـات کـە لـەژێر هـیچ باروزروفێکـدا رێگـا نـەدرێت دەسـەلاتی عوسمانیی جارێکی تر بگەڕێتەوە کوردستان (١٠٤/١). ئینگلیزەکان وەلامیان بـــۆ شـــێخ مـــەحمود نـــارد کـــە نوێنـــەری ئـــەوان بێـــت. شێخ مەحمود و لایەنگرانی کەوتنــە خۆئامـادەکردن بـۆ راپـەڕینێک دژی تورکەکان و دەرکردنیان لە کوردستاندا. وەزارەتی جەنگی بەریتانیی هەڵی سەنگاند کە گرتنی کەرکوک پەلەی تێدا بـووە. ترسـیان پەیـدا کـرد کـە

نــەتوانن پارێزگــاریی شــارەکە بکــەن و کارەســاتێک بێــت بەســەر هێزەکانیاندا. ڕۆژی ١٩١٨/٠٥/٢٤ لە شاری کەرکوک کـشانەوە بـۆ بێجـی. عوسمانییەکان چوونەوە ناو کەرکوک. فەرماندەی سوپای شەش "خـەلیل پاشا" فەرمانی دا بە سەرکردەی هێزی عوسمانیی لــە سـلێمانی "مـستەفا بەگ" کە شێخ مەحمود بگرێت. مستەفا بەگ بانگی شـێخی کـرد بـۆ شـار بۆئەوەی گفتوگۆی دەربارەی کاروباری ناوچەکە لەگەڵدا بکات. بەڵام شێخ مەحمود کە هات گرتیان و لەژێر پاسەوانییەکی توندا نێردرا بۆ کەرکوک. دادگای سەربازیی تورک ڕۆژی ١٩١٨/٠٨/٣٠ بڕیاری لەناوبردنی شـێخی دا. بەڵام لەناوبردنی شێخ مەحمود ئاسان نــەبوو. شـێخ مـەحمود نفـوزێکی زۆری لە سلێمانی و دەرەوەی سلێمانی هەبوو. هێرش بۆ سەر قافڵەکانی هێزی عوسمانیی زیادی کرد. ئەفسەرێکی ئەڵمانیی لە ڕێگای گەڕانەوەیدا لە سلێمانییەوە بۆ کۆیە هێرشی کرایە سەر، چەند کەسێک لە پیاوەکانی کوژران و چەککران. دەوڵەتەکانی سەر ساحەی جەنگ دەیان ویست سـود لە هەموو هێزێک بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ببینن. لەم کاتــەدا جەنــەڕاڵ عــەلی ئیحــسان پاشــا بــوو بــە فەرمانــدەی فەیلــەقی شەشــی ســوپای عوسمانیی.

عەلی ئیحسان پاشا کە لە ئەستەنبوڵەوە گەشــتە موسـڵ حوکمەکــەی لابرد، چاوی کەوت بە شێخ و لــە جیــاتی ئــەوە ڕوتبــەی مارشاڵــی پــێ بەخشی. شێخ مەحمود لە مردن ڕزگاری بوو، لە موسڵەوە گەشتە کەرکوک و لەوێوە بۆ سلێمانی. عوسمانییــەکان فەرمانەکــەی قومانــدانی گـشتیی عەلی ئیحسان پاشایان بڵاو کردەوە (٣٣/٥). عــەلی ئیحــسان پاشــا ٥٠٠٠ لیرەی ئاڵتونی دایە بۆئەوەی هێزێک لە چەند تیپێکـدا (کتائـب) بــەناوی "تەشکیلاتی میللی"یەوە پێک بهێنێت و کاروباری پێ ببات بــەڕێوەوە. ئــەم هێزە بۆئەوەی پاراستنی لای چەپ، کە ڕۆژهەڵاتی هێزەکانی عوسمــانیی دەگرتەوە، لە سلێمانی بپارێزێت. هــەروەها لــە خەتــەکانی هــاتوچۆی ســوپای بــەریتانیی بــدات. بەومەرجــەش کــە هەمیــشە ئامادەبێــت بــۆ یارمەتیدانی سوپای عوسمانیی بەهەموو توانایەکەوە چ لە ڕووی ماددیی و چ لە ڕووی بەشەرییەوە. عەلی ئیحــسان پاشــا فــەرمانی دەرکــرد بــۆ

سەرکردەی "حامییەی سلێمانی" کە چەک و تفـاقی پێویـستی بـداتێ بـۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە. مانگی دەی ساڵی ١٩١٨ کاتی دەستپێکردنی ئـەو پرۆژەیە بوو کە شێخ مەحمود لەگەڵ عـەلی ئیحـسان پاشـادا لەسـەری رێکەوتن (١٠٧/١). بەڵام بوونی شێخ مەحمود لە ژوری لەناوبردندا پرسیار دەخاتـە سـەر ئـەوەی کـە بـە پلانێکـی وا بوترێـت "رێکـەوتن". کشانەوەی هێـزی ئینگلیـز لـە کـەرکوک کەوتـە گـوێی دانیـشتوان لـە کوردستان. ئەم کشانەوەیە لە هەیبـەتی بـەریتانیای هێنایـە خـوارەوە. ژمارەیەک کەس، کە لە ئینگلیز نزیـک بـوو بوونـەوە، لێیـان پاشـگەز بوونەوە. کشانەوەکە بوو بە مایـەی پروپاگەنـدەی عوسمانییـەکان دژی ئینگلیز. دەنگی ئەوە بڵاوبووەوە کە هاوپەیمانەکان شکاون و لـە هـەموو سـاحەیەکی شـەڕ کـشاونەتەوە. بڵاوبوونـەوەی ئـەم پروپاگەندەیـە ئینگلیزەکانی خستە ترسەوە کە راپەڕین لە شوێنە جیاوازەکانی عێراقـدا سەر هەڵبدات. بەڵام سەرکەوتنەکانی بەریتانیا لـە سـوریاو فەلەسـتین هەروەها چوونەدەرەوەی "بولگاریا"ی هاوپەیمانی عوسمانیی لە جەنگ، هانی بەریتانیای دا فەرمان دەرکات بۆ جەنەراڵ مارشاڵ پێشرەویی بکـات لە سـەر هـەردوو لای روبـاری دیجلـە بـەرەو بـاکور. رۆژی ١٩١٨/١٠/٣٠ بەریتانیا موسڵی گرت. فەرماندەی فەیلەقی شەش عـەلی ئیحـسان پاشـا بروسکەیەکی کرد بۆ موتەسەڕیفی سلێمانی عەلی رەزا بەگ بۆ گەڕانـەوە بۆ موسڵ و ئەو هێزەش کە لە سلێمانییدایە بیخاتە ژێر بەڕێوەبەرایەتیی شێخ مەحمودەوە بەناوی دەوڵەتی عوسمانییەوە، بۆئەوەی بەرامبەر بـە هێزی بەریتانیا بووەستێتەوە کە تازە گەڕابوونـەوە بـۆ کـەرکوک پـاش کـشانەوەی هێـزی عوسمـانیی لێـی. موتەسـەڕیفی سـلێمانی لەگـەڵ فەرمانبەرە مەدەنییەکانییدا سلێمانی بەجێ هێشت. هێزێکی سـەربازیی و ژمارەیەک جەندرمەی لەژێر فەرماندەی (ساڵح بـەگ تـابور ئاغاسـی)دا بەجێ هێشت (١٠٨/١).

دوای چەند رۆژێکـی کـەم هێزەکـانی بـەریتانیا "ئاڵـتون کـۆپری" و "هەولێر"یشیان گرت. بەڵام توخنی سلێمانی نەکەوتن لەبەر بوونی هێـزی تورکیی لەژێر دەسەڵاتی شێخ مـەحمودا. شـێخ مـەحمود پـێش گـرتن و

بەردانی لە لایەن عوسمانییەکانەوە، لەگەڵ ئینگلیزەکاندا جارێـک پێـک هاتبوو.

بەڵام ئایا شێخ مەحمود چۆن ئـەو ئاوڕلێدانەوەیـەی عوسمانییـەکان لێک دەداتەوەو چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئـەم پلەوپایەیـەدا دەکـات کـە عوسمانییەکان پێیان بەخشی؟ شێخ مەحمود لـەو بارەیـەوە دەنوسـێت: "تورک ویستی سوێم لێ وەربگرێت، چونکە پێویستی بە من بـوو، منیـان زۆر بە ڕێزەوە ناردەوە بۆ وڵاتەکەم، هاتنەوەی منیش بۆ ئەوە بوو بتوانم پشتگیرییتان بکەم و ڕێگەیەک بدۆزینەوە تا بگەینە ئـەو هیوایـەی بـۆی تێدەکۆشین" (٩٢/٥).

## ڕێککەوتنی کورد و ئینگلیز ساڵی ١٩١٨

شێخ مەحمود کە گەڕایەوە بۆ سلێمانی پەیوەنـدیی کـرد بـە ژمارەیـەک سەرۆکهۆز و سیاسیی و وڵاتپارێزەوە. لـە ماڵـی سـەید عومـەری مـامی کۆبوونەوەیەکیان کرد و بڕیاریان دا کۆدەتایەک دژی عوسمانییەکان ڕێک بخـەن، خاکەکـەیان لـە تورکـەکان پـاک بکەنـەوەو بـە پـشتگیریی هاوپەیمانەکان بە گشتیی و ئینگلیز بە تایبـەتی کـە لـە خاکەکـەدا بـوو سەربەخۆیی کوردستان بەدەست بهێنن (٣٦/٥). ئەم نیازەش تـەریب بـوو بەو هەوای پڕوپاگەندەیەی کـە هاوپەیمانـەکان و بەنـدەکانی سـەرۆکی ئەمەریکیی ودرود ولسن دەربـارەی مـافی مـرۆڤ و سـەربەخۆیی گـەلان دروستیان کرد بوو.

لە کۆبوونەوەکەدا بڕیاریان دا کە وەفـدێک بنێـرن بـۆ کفـری بـۆ لای ئینگلیزەکان بۆئەوەی ئەوانیش پەیوەندیی بکـەن بـە و(لـسن)ی جێگـری حاکمی گشتیی عێراقەوە. گفتوگۆی بەشداربووان ئەوەشی خـستە بـەرچاو کە ڕێتێچوونی ناراستیی ئینگلیزەکانیش لەبەرچاو بگیرێت. وەفدەکە بـە سەرۆکایەتیی "فایەق تۆفیـق" ناسـراو بـە فایـەقی تـاپۆ و ئەندامـەتیی "عیزەت تۆپچی" و "تایەر ئەفەندی" ڕێکخـرا و چـوو بـۆ کفـری. لـەوێوە پەیوەندییان کرت بە (ولسن)ەوە. ئەم گفتوگۆیە ڕەنگە بتوانرێت بە یەکەم

گفتوگـۆی شـێخ مـەحمود لەگـەڵ ئینگلیزەکـان لەقەڵـەم بـدرێت. وەفدەکەی کورد بە سەرۆکایەتیی فایەقی تاپۆ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا لەسەر ئەم بەندانە ڕێککەوتن:

١. هاوپەیمانـەکان دوای دەرکـردنی تـورک دان بـە سـەربەخۆیی کوردستاندا دەنێن بەمەرجێک حکومەتی کوردستانی خـواروو ڕاوێژکـارە سیاسیی و ئابوریی و سەربازییەکانی بـۆ چەنـد ساڵـێک ئینگلیـز بـن. کۆنگرەی ئاشتیی جیهانییش دەبێت یارمەتیی هاوپەیمانەکان بدات و لـە گەڵیان بێت.

٢. ئینگلیز بۆی نییە دەست بخاتە ناو ئیشوکاری نـاوخۆی وڵاتەکـەوە ئەگـەر ڕەزامەنـدیی دەسـەڵاتدارێتی نیـشتیمانیی لەسـەر نـەبێت.

٣. کوردەکان تا سنوری سروشتیی خۆیان وەردەگرن، ئینگلیز چاودێرییان لێ دەکات و هەر ئـەویش یارمـەتییان دەدات بۆئـەوەی بچنـە کۆمەڵـەی گەلانـــەوە بـــۆ ئـــەوەی مافیـــان بپارێزرێـــت.

٤. بەهۆی تەشەنەکردنی گرانیی و برسێتیی لـە کوردسـتاندا، دەوڵـەتی ئینگلیـــز دەبێـــت یارمـــەتی ئـــابوریی کـــورد بـــدات.

٥. دەبێت ئینگلیز چەک و زەخیرەی جەنگ بدات بـە سـوپای کوردەکـان.

٦. نابێت هێزی سوپایی بنێردرێت بۆ کوردستان ئەگەر ڕەزامەندیی هەردوو لای لەسەر نەبێت.

٧. لە کاتی باسکردنی کێشەی مافی چارەنوسی گەلاندا لـە کـۆنگرەی ئاشتی جیهانیی و کۆمەڵەی گەلاندا، هەوڵدان لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە دەدرێـت بـۆ یـەکگرتنی کوردسـتانی ئێـران و کوردسـتانی عێـراق.

دوای گەڕانـــەوەی وەفدەکـــە لـــەکفری شـــێخ مـــەحمود و هاوپەیمانەکانی کۆبوونەوەیەکیان بە نهێنیی لە سلێمانی کرد و بـڕیاری کۆدەتایـەکی سـەربازییان دژی تـورک دا. تورکـەکان بەمـەیان زانی و سەرئەنجام لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە هێزەکانی تورک بێ شـەڕ خۆیـان بدەن بەدەستەوە بەمەرجێک چەکیان نەکەن و نەیان دەنە دەست ئینگلیـز. کوردەکان بەم مەرجە ڕازی بوون و شێخ مەحمود فەرماندەو ئەفسەرەکانی

تـــوركی خـــسته خانووەكـــەی مامیـــەوە. ئینگلیـــز داوای ئـــەم هێـــزە خۆبەدەستەوەدەرەی كرد بەڵام شـێخ مـەحمود تەسـلیمی ئینگلیزەكـانی نەكردن. كۆمەڵێک لەم سەربازە توركانەی لە رێگای سورداشـەوە لەگـەڵ چەند چەكدارێكی لەخوداترسدا رەوانە كرد بگەڕێنەوە بـۆ توركیـا. بـەڵام ئەم هێزە كەوتنە بەر لێدانی خێڵی جافەتیی، زۆربەیان كوشتن و چـەک و تفاقیان بە تاڵان بردن. شێخ مەحمود ئیتر ئەو ژمارەیەی مایەوە لە رێگای سـەقزی ئێرانـــەوە رەوانـــە كـــردەوە بـــۆ وڵاتی خۆیـان (٣٨/٥). دوای رەوانەكردنەوەی توركە دەستبەسەرەكان ژمارەیەک لە سەربازە توركەكان نامەیەكیان لە توركیاوە نارد بۆ حەپسەخانی نەقیب. لە نامەكـەدا وەكـو دایک ناویان هێنابوو. سەربازەكان سوپاسێكی زۆریان كرد بوو كە كـاتی دیلێتییان بەو شێوەیە چاودێریی كردبوون كە دایک لەگەڵ كـوڕی خۆیـدا دەیكات.

## حوكمداریی یەكەمی شێخ مەحمود ١٩١٨

مێجەر نۆئێل لە كفرییەوە هات بۆ داریكەلی و لەوێـشەوە رۆژی (١٦)ی مانگ گەشتە سلێمانی. نۆئێل بەبێ هێزی سەربازیی ژمارەیەک كەسی لـە دوكتۆر، ئەندازیار و پسپۆڕی تر لەگەڵدا بـوو (١١١/١). "بـەدرێژایی رێگـا وەكو نوێنەری هێزی ئازادیبەخش و خۆشیهێن پێشوازیی گەرمیان لێ كرد" (١٦/١٧). رۆژی دوایی (١٧)ی مانگی یانزەی ساڵـی (١٩١٨) كۆبوونەوەیـەكی گـەورە لــە سـلێمانی ســاس كـرا. لــەم كۆبوونەوەیـەدا سیاسـیی و كاربەدەسـتانی ئینگلیـز و خوێنـدەواران و سـەرەک هـۆز و بازرگـان و ناسراوە ئاینییەكان و نوێنەرانی چینەكانی كۆمەڵی تیادا بەشدار بـوون. مێجەر نۆئێل بە پێی ئەو فەرمانەی لە ولسنی حـاكمی گـشتی عێراقـەوە وەری گرتبوو بە زمانی فارسی رایگەیاند كـە شـێخ مـەحمود حوكمـداری كوردستانە و هیواش وایە كە لە داهاتوویەكی نزیكدا دان بە سـەربەخۆیی كوردستانی گەورەشدا بنرێت. مێجەر نۆئێل راوێژكاری سیاسیی و مێجـەر دانلیس راوێژكاری سەربازییە (٣٩/٥). نۆئێل گفتی دا كە ئەوەی ناوچەكان پێویستیانە لە رێكخـستن جێبـەجێی بكـات و لەگـەڵ حكومـەتی تـازەی

دامەزراودا یەکی بخات. هەروەها موچەی ١٥٠٠٠ روپێی (کــە دەیکــردە ١٢٢٥ جونێی ئیستەرلینیی) بۆ شێخ مەحمود بڕییــەوە. ئامادەبووەکــان ســەید عومەری مامی شێخ مەحمودیان هەڵبژارد بۆ موتەسەڕیفی سلێمانی. شێخ محەمەدی برا گەورەی شێخ مەحمود بوو بە قازیی شەرعیی. شــێخ قــادری حەفید کرا بە فەرماندەی گشتیی سوپا. ماجید مستەفاش بوو بــە یــاوەر و سکرتێری سیاسیی شێخ مــەحمود. مێجــەر نۆئێــل بــوو بــە راوێژکــاری سیاسیی و مێجەر دانلیس بە راوێژکاری سەربازیی و دارایی. رەفیق حیلمی بە رەزامەندیی شێخ مەحمود بوو بە وەرگێڕ و نوسەر و فێرکــەری زمــانی کوردیی نۆئێل.

شاری سلێمانی هەژاریی، پیسخۆریی و ناهەمواریی پێــوە دیــار بــوو. نۆئێل بروسکەی نــارد بــۆ ئەرنۆلــد ولــسن یارمــەتیی خواردەمــەنیی و هەروەها تۆوی کشتوکاڵیی بۆ جوتیــاران بنێرێــت. خواردەمــەنیی وەکــو شەکر، چا، ئارد لە مەخزەنەکانی بەغــداد و کەرکوکــەوە هێنــران و بــە خۆڕایی دابەش کران بەسەر دانیشتواندا. پارەیەکی زۆر خرایە بازاڕەوە لە رێگای پێسپێردراو و ئەوانەوە کە پەیوەندییان بە شێخ مەحمودەوە هەبوو (٦٨/٧).

یــەکێک لــە ئەرکــەکانی نۆئێــل نەهێــشتنی پاشمــاوەی دەســەڵاتی عوسمانییەکان بوو. نفوزی عوسمانییەکان لە سلێمانی شلۆق بوو. نوئێل ئەم ئەرکەی چواند بــە راوەشــانی دارێــک بەرەکــەی گــەییووبێت. بــەڵام لابردنی سیستێمی ئیدارەی کــۆن هەڵوەشــاوییەکی بــەپێی لێکدانــەوەی نۆئێل لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا بەجێ دەهێشت کــە بەرپرســیی حکومــەتی بەریتانیای زیاد دەکرد بۆ ئیدارەکردنی ناوچەکە وەکو بەشــێک کــە جیــا نابێتەوە لە عێراق (١١٧/١). نۆئێل کــە نێــردرا بــۆ کوردســتان نەخــشەی سیاسەتی بەریتانیی پێ بوو بۆ ئــەو کاتــە کــە بەئــەنجامی بگەیــەنێت. ناوەڕۆکی سپاردەکەی نۆئێل کە لە ولسنیەوە وەرگرتبوو بریتی بوو لــەم خاڵانەی خوارەوە:

١. مێجەر لە وتووێژدا لەگەڵ سەرۆکەکانی ناوچەکانــدا دەبێــت حــسابی

ئەوە بکات کە دەسەڵاتی سـەربازیی ئینگلیـز ڕێـی تـێ ناچێـت هێزێکـی سوپایی بنێرێـت بـۆ سـلێمانی بۆئـەوەی هەمیـشە لـەوێ بمێنێتـەوە.
٢. مێجەر نۆئێل لەگەڵ سەرۆکە ناوچەییەکاندا ئەو ناوچانە ڕێک دەخـات و دەیانپارێزێـت کـە هێـشتا لـە لایـەن هێـزی سـەربازیی ئینگلیـزەوە داگیرنەکراون.
٣. کەسانی سەر بە دوژمن تەسلیم دەکەنەوەو بەر لە چالاکییـەکانیان دەگـرن و هێزەکـانی ئینگلیـز بـە شـتومەکی پێویـست دەقـەت دەکـەن.
٤. لە سەر بنەمای تێگەشتن لەگەڵ سەرۆکە ناوچەییەکاندا ئەوەی دەکرێت پێویستەو جێگای پیاچونەوەیە لە هەر کاتێکدا بێت.
٥. مێجەر سەرپشکە شێخ مەحمود، ئەگەر دەکرێت، دابنێت بە نوێنەری ئینگلیز لە سلێمانی. هەروەها مێجەر ئەگەر پێی باش بێت دەتوانێـت لـە ناوچەکانی تری وەکو چەمچەماڵ و هەڵەبجەو شوێنانی تر هەمان دانانی وەکو ئەوەی شێخ مەحمود ئەنجام بدات.
٦. بۆ سەرۆکی ئەو خێلانەی باس بکات کە لەگەڵیاندا پەیوەندیی پەیدا دەکات کە هیچ نیازێک لـە ئـارادا نییـە بەڕێوەبەرایەتییـەکی بێگانـەی پێچەوانەی نەریت و ئارەزوەکانی ئەوان دابنێت.
٧. سـەرۆکی خێـڵەکان هـان بـدات یـەکبوونێک بـۆ چـارەی کێـشە گشتییەکانیان بە ڕێنمایی ئەفسەرە سیاسییەکانی بەریتانیی ڕێک بخـەن. داوایان لێ بکات بە پێی قانونی تورکیی یان ئەگەر پێویـست بێـت بـەپێی گونجاندن لە گەڵ پاریزگـاریی و پێشخـستنی ڕێکخـستنی وڵاتەکەیانـدا باجی یاسایی بدەن (٤٨/٢).

نۆئێل ڕێکخستنێکی دەستەڵاتی کاتیی پێک هێنا کە بریتی بوو لـە یەکـەم، دانانی فەرمانبەرێک لە هەر ناوچەیەکدا. ئـەم فەرمانبـەرە لـە ژێـر ڕێنمـایی ئەفسەرێکی سیاسییدا بوو. نۆئێل فەرمانبەرە عەرەب و تورکەکانی بە گـوێرەی توانا لا دەبرد و لە کورد خۆی فەرمانبەری دادەنا (٢٢/١١). دووەم، هەر سـەرۆک خێڵێکیش لـە ڕێگـای شـێخ مـەحمودەوە، کـە فەرمانبـەرێکی موچـەوەرگری حکومیی بوو، لەبەردەمی بەریتانیادا بەرپرسـیار بـوو (١١٧/١). ئـەم سـەرۆک خێڵانەش موچە وەرگری حکومەتەکە بوون.

ولسن خۆشی رۆژی ١٩١٨/١١/٠١ به رێگای ئاسماندا گەیشتە سلێمانی، لەم سەفەردا کاپتن "بیل"یشی لەگەڵ بوو کە داینا بە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی سلێمانی. ولسن لەگەڵ ژمارەی نزیکەی ٦٠ کەس لە سەرۆکە ناسراوەکاندا لە سلێمانی کۆبووەوە. شێخ مەحمود یەکێک بوو لەوان. ژمارەیەک لەم ناسراوانە کوردی رۆژهەلات بوون کە ویستی خۆیان پیشان دا بخرێنە سەر ئەم ئیدارەیە. بەلام ولسن بەمە رازیی نەبوو. دوای ئەم هەنگاوە نۆئێل دەستی کرد بە سەفەر بەژمارەیەکی زۆر لە ناوچە کوردییەکاندا. نۆئێل داوای لە خەلکی ناوچەکان کرد بۆ دانانی سیستێمی حوکمی تازە لە کۆیە، رانیە و رەواندزدا. ناوەڕۆکی ئاگاداریی و رونکردنەوەکانی نۆئێل بۆ دانیشتوانی ناوچەکان لەم خالانەدا بوو:

١. فەرمانبەرانی ئیدارە بەگوێرەی توانا کورد دەبن.

٢. لاوانی کورد لە رکێفی ئەفسەری کورددا سەربازیی دەکەن.

٣. کوردیی زمانی رەسمیی دەبێت.

٤. بەریتانیا یاسا دەگۆڕێت بەشێوەیەک کە لەگەڵ دابونەریتی دەڤەرەکاندا بگونجێت.

٥. دەزگایەکی کۆکردنەوەی باج دادەنرێت بۆ کۆکردنەوەی بڕێک کە پێویستیی دانیشتوانی پێ مەیسەر بکرێت.

٦. نۆئێل پەیمان دەدات کە حکومەتەکەی رێزی دابونەریتی باو لە ناوچە کوردییەکاندا بگرێت. (٢٢١/١)

بۆ ئەم ئەرکانە بەریتانیا ژمارەیەک یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی لە ناوچە کوردییەکاندا دانا. شێخ محەمودیش توانی لە هەندێک شوێن فەرمانبەری باوەڕپێکراوی خۆی دابمەزرێنێت، لەوانە "شێخ ئەمینی سندۆلان" لە رانیە. بابەکر ئاغاش بە پشتگیریی بەریتانیا و دواتر بە لەگەڵدابوونی شێخ مەحمود خۆی کرد بە حاکمی پشدەر.

لە کاتێکدا کە نۆئێل خەریکی بەئەنجام گەیاندنی ئەرکەکانی بوو، شێخ مەحمودیش لە لای خۆیەوە وەکو ئینگلیزەکان هەدەف و سیاسەتێکی مێژوویی خۆی پێ بوو.

## سیاسەتی دەرەوەی شێخ مەحمود

شێخ مەحمود مەزبەتەیەکی ئامادە کرد بۆ "کۆنگرەی سوڵح" لە پاریس. ئەم مەزبەتەیە، کە ژمارەیەک لە کەسایەتییە کوردەکانی ناوچەکە موریان کردبوو، شەریف پاشای دەکرد بەنوێنەر بۆ داواکردنی مافی کورد لە کۆنگرەی سوڵحدا. لەگەڵ ئەم مەزبەتەیەدا نامەیەکیشی بۆ شەریف پاشا خۆی نوسی. ئەم مەزبەتە و نامەیە درا بە رەشید کابان و ئەحمەد بەرزنجی. ئەم دوو کەسە چونە شاری حەڵەبی سوریا بەرەو پاریس. بەڵام لەوێ فەرەنسییەکان گرتیانن و رەوانەی کوردستانیان کردنەوە. ئەم مەزبەتەو نامەیە لە خانوی حوکمداریی شێخ مەحموددا بە ئامادەبوونی مێجەر نۆئێل ئامادەکران. کاتبی ئەم دوو نوسراوە رەفیق حیلمی بوو (٦٥/٧). فەرەنسا و بەریتانیا بە هاوکاریی رێگەیان گرت لەوەی راسپاردەکە بەدەستی شەریف پاشا بگات لە پاریس (١٢٥/١). هەر لەم ماوەیەدا ولسن لەسەر پێشنیاری وەزیری هند سەفەرێکی لە (١٩١٩/٠٢)دا کرد بۆ پاریس بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بارە سیاسییەکە لە کۆنگرەی سوڵحدا ببینێت (٨). بەریتانییەکان رێگایان لە وەفدی میسریش بە سەرۆکایەتیی "سەعد زەغلوڵ" گرت بچێت بۆ پاریس، لەبەر ئەوەی پێیان وابوو دژی سیاسەتیانە. ئەمە بوو بەهۆی راپەرینیی جەماوەریی دژی بەریتانیا لە میسر. کۆنگرەی سوڵح دوای تەواوبوونی جەنگی جیهانیی یەکەم لە پاریس بەسترا. رۆژی ١٩١٩/٠١/١٨ هەتا رۆژی ١٩٢٠/٠١/٢١ درێژەی کێشا. لەو بابەتانەی کە کۆنگرە گفتوگۆی توندی دەربارە کرد دابەشکردنی موڵکی ئەڵمانیا و عوسمانیی بوو لە نێوانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا (١٢٥/١).

شێخ مەحمود و لایەنگرانی بە پێکهێنانی حکومدارییەکە پشتیان لێ نەکردەوەو هەر بەردەوام بوون. ژمارەیەک نامە و مەزبەتەیان ناردە بەردەستی کۆنگرەی ئاشتیی جیهان و کۆمەڵەی گەلان. یەکێک لەو نامانەو یەکەم نامە کە بۆ کۆنگرەی ئاشتی جیهان نێردرا، بریتیی بوو لەمەی خوارەوە:

**بۆ سەرۆکایەتیی کۆنگرەی ئاشتیی جیهانیی/**

**پاریس ١٩١٩/٣/٢٠**

نامەم پێشکەش بە ئێوەی بەڕێز دەکەم کە سەرۆکایەتیی کۆنگرەی ئاشتیی جیهانتان پێ سپێردراوە. هیوای زۆرمان پێتانە کە گوێ لە بانگی هەقی رەوامان بگرن. ئەو بەیانانەی کە لە لایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە لە کاتی یەکەمین جەنگی جیهانییدا دەرکراو ئەو هەموو کوشتار و ماڵوێرانییەی کە داتان بە هیوای رزگارکردنی هەموو گەلانی لاوازی ژێردەستی تورک و سوڵتە سەرکوتکەرەکەی بوون. ئامانجتان لەم شەڕەدا سەربەخۆیی بوو بۆ ئەو گەلانە کە لە نێوانیاندا گەلی کوردیش دێت. گەلی کوردمان یەکێکە لەو گەلە کۆنە ژێردەستانەی حکومەتی تورک کە لە دەمێکەوە بە دەستییەوە دەناڵێنێت. بلاوبوونەوەی ئەم بەیانانەش لەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە موژدەیەکی دڵخۆشکەر بوو بۆمان. لە هەموو شوێنێکی کوردستانەوە گەلی کورد دەنگی خۆی و داخوازییەکانی بەرز دەکاتەوە بۆتان. هەڵگری ئەم مەزبەتانەش "سەید ئەحمەد" و "سەید رەشید زەکی بەگ"ە کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی کوردستانن. بەناوی نوماینەدەی ئێمە و گەلی کورد لە کوردستانەوە هاتنە لاتان. داواتان لێ دەکەین بە داخوازیی نوماینەدەکانمان رازی بن و گوێی هەقیان بۆ شل بکەن و مەزبەتەکانیان پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی جیهانیی بکەن بۆئەوەی ئەوانیش بتوانن ئەم ستەمکارییەی تورکمان لەسەر هەڵگرن. بە یارمەتیتان خۆمان دروست بکەین و نوماینەدەشمان بە موژدەی سەربەستییەوە بگەڕێنەوە.

**سەرۆکی حکومەتی کوردستان**

**شێخ مەحمود حەفید**

**( پشتگیریکردن )**

**بۆ کۆنگرەی ئاشتیی جیهانیی لە پاریس**

وەکو دەزانن هۆی ئەو هەموو خوێنڕشتنەو هاتنی دەوڵەتە گەورەکان بۆ ناو شەڕ بە ئامانجی سەربەستیی و رزگارکردنی گەلانی ژێردەستە بوو. ئەمەش یەکەم و دوا بیری بەشەرەفی ئێوەیە. بەپێی ئەوەی لە بەیاننامەکانتانا هاتووەو خوێندومانەتەوە. گەلی کورد ژمارەی دە ملیۆنە، دوو ملیۆنیان لە کوردستانی خوارووودا دەژین. سەدەکانی پێش ئێستا کورد حکومەتی سەربەخۆی خۆی هەبووەو ئازادیی خۆشی هەموو کاتێک بەدەست هێناوەو پاراستویەتی. بەڵام تورکیا و ئێران هەموو کاتێک تەماعیان کردوینێ، بە ناوی ئایینەوە وڵاتەکەیان داگیرکردووین. سیاسەتەکەی تورکیا و گەورەکردنی دەوڵەتەکەی و شەڕو ئاژاوەی نێوان هەردوو دەوڵەتەکە بوونە هۆی نەمانی حکومەتەکانمان. ماینەوە بە ژێردەستیی، لەگەڵ ئەوەشدا کوردستان نیشتیمانی رەسەنی کورد و سنورێکی سروشتیی تایبەتیی خۆی هەیەو گەلێکی جیاوازی تێدا دەژی. لەم رۆژەدا، کە کۆمەڵە گەورەکەتان دامەزراوە، ئامانجتان رزگارکردنی هەموو گەلانی گێتییە و بوونەتە پەرستگای ئێمەو هیوامان پێتانە کە مافی خۆمان دەسگیربخەن و بۆ گەلانی مافخوراوی تریش ژیانێکی نوێ بگێڕنەوە، نەوەکو خاکەکەیان لێ داگیر بکرێت، خۆشیان ببنە ژێردەستەو کویلەو رێزیان لێ نەگیرێت.

چاوەڕێی دڵسۆزیتان دەکەین سەربەخۆییمان، کە حکومەتی بەریتانیا بڕیاری لەسەر داوە، بپارێزن. پارێزگاریی سەربەخۆییمان و مافمان بەستراوە بە دادپەروەریتانەوە. پێشتان رادەگەیەنم کە نوماینەدەی ئێمە سەید ئەحمەد ئەفەندی و سەیید رەشید زەکی بڕوای تەواومان پێداون، هیوامان وایە رێزیان لێ بگرن و گوێ بۆ داخوازییەکانیان شل بکەن و مافەخوراوەکانیشمان بۆ بگێڕنەوە. نوێنەرەکانیشمان بە خۆشییەوە بنێرنەوە لامان.

سەرۆکی حکومەتی کاتیی کوردستان

شێخ مەحمود حەفید

ئەم پاشکۆیە جگە لە شێخ مەحمود ٣٩ کەس لە سەرهۆز و کەسایەتییە ناودارەکان ئیمزای کردووە. جولەکە، مەسیحیی، کوردی رۆژهەلات و گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگای لەخۆ گرتووە. دوابەدوای ئەم نامەیە لە ناوچەی سەرسنووری سەقز و شاری سەقز خۆیەوە نامەی پشتگیریی بۆ نامەکەی حکومەتی کوردستان لە لایەن ٢٢ کەسایەتییەوە نێردراوە. هەروەها لە هەرێمی سلێمانی و کەرکوک و هەولێر و کۆیەوە نامەی پشتگیریی بەهۆی (شەریف پاشا)وە درا بە کۆنگرەی ئاشتیی جیهانیی لە پاریس. ئەم نامانە لە لایەن چەندەها کەسایەتیی و نوێنەرانی خەڵکی ناوچەکانەوە ئیمزا کرابوون (٤٠/٥).

بەڵام وەکو شێخ مەحمود خۆی پێکا بووی ئیتر "سەربەخۆیی و مافی کورد بەسترابوو بە دادپەروەریی بەریتانیاوە." ئایا بەریتانیا لە راستییدا چی بوو؟

## بەریتانیا، داگیرکەری نوێ

سالانی ١٩١٠ گەرمییەکی سیاسیی و فکریی تازە بۆ رزگاربوون لە کۆنترۆڵی عوسمانیی لە نێو عێراقییەکاندا سەری هەڵدا بوو. ناکۆکیی نێودەوڵەتیی لە جەنگ نزیک دەبووەوە. ئەم ناکۆکییە هەلی دەدا بە بەریتانیا، فەرەنسا و روسیا بۆ لەتکردنی ولایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیی. دەوڵەتی عوسمانیی لە رووی ئیداریی و سەربازیی و هونەرییەوە لەو پێشکەوتنەی رۆژئاوا بەجێمابوو. نەوتیش لە عێراق و ئێراندا بوونی گومانی تێدا نەمابوو.

ناتەبایی نێوانی بەریتانیاو دەوڵەتی عوسمانیی فەزای فراوان دەکرد بۆ نفوزی ئەڵمانیا. بەریتانیا بە ئومێدی نەهێشتنی ناخۆشیی نێوان خۆیان و دەسەلاتی عوسمانیی تا نیووەی یەکەمی سالی (١٩١٤)ش لە گفتوگۆدا بوو. بەلام جەنگ سنوری دانا بۆ ئەم گفتوگۆیە. بەریتانییەکان نەیان دەویست هیچ دەوڵەتێکی ئەوروپی توخنی خلیجی عەرەبیی و ناوچەکە بکەوێت. لاشیان وابوو کە هەڵوێستی دەوڵەتی

عوسمـــانیی لـــه باشـــترین حالـــەتدا بێلایـــەنێکی داخلـــەدڵ دەبـــوو. ڕۆژی ١٩١٤/١٠/١٦ بە فەرمانێکی نهێنیی، بۆمبی، کە ئەو کاتە گـەورەترین ئیستۆڵ بوو لە ٤٧ پاپۆر، بەشـێکی ڕووی کـردە ڕۆژهـەڵاتی ئـەفریقا و بەشێکی ڕووی کردە خاڵێکی دیاریکراو لە خلیجی عەرەبییـدا. ئـەم خاڵـە دیاریکراوە دوایی دەرکەوت بەنـدەری بـەحرەین بـوو. دوای حەفتەیـەک دەوڵەتی عوسمانیی، بە هێرشی بـۆ سـەر ئۆدیـسە، چـووە جەنگـەوە. پاپۆرەکـانی بـەریتانیا ڕۆشـتن بـەرەو دەرگـای شـەتی عـەرەب و لـە (٠٦ـ١١ـ١٩١٤)دا هێرش کرایە سەر فاو (٤). ئینگلیزەکان هەم هەدەفی خۆیان دەزانی و هەم قاچیان دەخستە ناو خـاک و خەڵـکێکەوە کـە لـەمێژ بـوو لێکۆڵینەوەیان تیایاندا کردبوو. ڕۆژی (١٩١٤/١١/٢٢)ش کشان بۆ بەسـرەو ئەوێـــشیان گـــرت. هێزەکـــانی بـــەریتانیا بـــەردەوامییان دا بـــە داگیرکردنەکانیان. ڕۆژی ١٩١٧/٠٣/١١ بەریتانیا (بەغداد)یـشی گـرت. دوای هەشت ڕۆژ ١٩١٧/٠٣/١٧ جەنەراڵ مۆد بـەیانێکی دەرکـرد. لـە بەیانەکـەدا هاتبوو کە یەکـەم، بـەریتانیا وەکـو ڕزگاکـەر نـەک وەکـو داگیرکـەر و تۆڵەسێن هاتۆنەتە ناو شارەکانی عێراقەوە. دووەم، بەریتانیای گـەورە یارمەتیی عێراقییەکان دەدات بۆ ئەوەی خواستی ئـازادیی و سـەربەخۆیی حوکمی وڵاتەکەیان بەدی بهێنن (٨).

ڕۆژی ١٩١٧/١٠/١٧ شۆڕشی سۆشیالیـستیی لـە ڕوسـیا ڕووی دا. دوای ڕۆژێک دەسەڵاتی تازە بەیانی کرد کە ئـەمان دبلۆماسـیی نهێنیـی قبـوڵ ناکەن. پەیمانیان دا کە هەموو ڕێکەوتننامە نهێنییەکانی نێوانی قەیسەرو دەوڵەتە گەورەکان ئاشکرا بکەن. دوای چەنـد حەفتەیـەک نزیکـەی سـەد ڕێکەوتننامە و ژمارەیەکی زۆر لە دۆکۆمێنت و نامـەی دبلۆماسـییان لـە ڕۆژنامە ناوچەگرەکانی خۆیاندا بلاوکردەوە. یەکێک لەو ڕێکەوتننامانـە دەقی سایکس/بیکۆ بوو.

ئەم نهێنیی هەڵماڵینە بوو بە هەواڵێکی جیهانیی و نیەتی بـەریتانیای خستە ڕوو. "مەکتەبی شۆڕش"، کە لە شۆڕشی ساڵـی بیـستی عێراقییـدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو، لـە دوای ئاشـکرابوونی ڕێکەوتننامـەی نـاوبراو چالاکییەکانی کەوتنە گەڕ (٦٩/٩). هـەر لەسـەرەتای ساڵـی (١٩١٨)دا لـە

نەجەف چالاكيى بەرگريى دژى بەريتانيا دەركەوت. رۆژى (١٩١٨/٠٣/١٩)ش بە رێكخستن و دەورى ئەندامانى "كۆمەڵەى نەهزەى ئيسلاميى" كاپتن مارشاڵى حاكمى "نەجەف"يان كوشت.

لە رێكەوتننامەى سايكس بيكۆدا ساڵى ١٩١٦، بەريتانييەكان لەگەڵ فەرەنسييەكاندا رێككەوتبوون كە بەشە عەرەبييەكەى دەوڵەتى عوسمانيى بكەن بە دوو ناوچەى دەستبەسەرداگيراوى بەريتانيى و فەرەنسيى (٦). رۆژى ١٩١٨/٠١/٠٨ چواردە بەندەكەى سەرۆكى ئەمەريكيى دەرچوو. لە بەندى يەكەميدا كۆتايى هێنابوو بە دبلۆماسيى نهێنيى. بەندى پێنجەمى دەربارەى ناكۆكيى بوو لەسەر كۆلۆنييەكان كە چارەسەرى ئازاد، ئاشكرا و بەويژدانى تيا بكرێت. لەم چارەسەركردنەدا بەرژەوەنديى دانيشتوانى كۆلۆنييەكان بێت رەچاو بكرێت. بەندى دوانزەى پەيوەنديى بە گەلانى ژێر دەستەڵاتى عوسمانييەوە هەبوو كە هەلێكى موتڵەقى پارێزراويان بدەنێ بۆ پێشخستنى سەربەخۆيى. ئەم چواردە بەندە بەخێرايى لە هەموو جيهاندا بلاو بۆوە. رۆژنامەكان و لايەنە سياسييەكان گرنگييەكى زۆريان پێ دا. لە عێراق رۆژنامەى "العرب" و رۆژنامەى "تێگەشتنى راستى" و رۆژنامەى "نجمه كەركوك" بە عەرەبيى، كورديى و توركيى بلاويان كردەوە (٧٠/٩). ئەم سێ رۆژنامەيە بەريتانيا لە بەغداد دەريدەكردن. مێجەر سۆن سەرپەرشتيكارى "تێگەشتنى راستى" بووەو (شوكرى فەزلى)يش تيايدا نوسيووە (٣١٧/٣)

بەندەكانى سەرۆكى ئەمەريكيى ودرۆد ولسن حەماسى خەڵكيى لە هەموو لايەكەوە بەرز كردەوە. لە بەغداد لە شەقام و چايخانەدا بوو بە بابەتى باس، بيرى دانانى ئەميرێكى عەرەبيى بۆ عێراق هاتە كايەوە بەلام نەدەزانرا ئەم ئەميرە كێيە؟ (٨)

نۆ رۆژ پێش بەيانكردنى حوكمداريى كوردستان لە سلێمانى، لە رۆژى (١٩١٨/١١/٠٨)دا راگەياندنێكى ئينگليزيى و فەرنسيى بۆ دانيشتوانى عێراق و رۆژهەلات بەگشتيى دەرچوو. ناوەرۆكى راگەياندنەكە بريتيى بوو لەم خالانە: ١. هەردوو ولات دەيانەوێت خەڵكەكە لە پاشماوەى ئەو

کۆیلەیەتیی و چەوسانەوەیە رزگار بکەن کە عوسمانییەکان بەجێیان هێشتبوو. ٢. دەیانەوێت بەڕێوەبەرایەتیی و حکومەتی نیشتیمانیی ئازاد بەگوێرەی ئارەزووی دانیشتوان لە عێراق و سوریادا هەڵبژێردرێن. ٣. لەبەرئەم هەدەفە هەردوو دەوڵەت بڕیاریان داوە کە یارمەتیی دانیشتوان بدەن بۆ ئەم کارانە: ١. دروستکردنی حکومەتەکانیان. ٢. دانپیانان بەو حکومەتانەدا. ٣. دەستنەخستنە کاریانەوە (٨).

## چەکی ریفراندۆم

جێگری حاکمی سیاسیی عێراق ئەی.تی ولسن ئەو بەیانەی رۆژی (١٩١٨/١١/٠٨)ی فەرەنسا و بەریتانیای بەدڵ نەبوو. ولسن رای وابوو گفتدان بە هاووڵاتیان بۆ ئازادیی و هەڵبژاردنی حکومەتان دەبێتە هۆی هاندانیان و سەرئەنجام ئیدارەی بەریتانیی لە گیروگرفتی قورسەوە دەئاڵێنێت. ولسن بروسکەیەکی کرد بۆ وەزیری کۆلۆنیی لە هند و تیایدا بەرهەڵستیی خۆی بەرامبەر گفتی سەربەخۆیی نیشان دا. رۆژی ١٩١٨/١١/١٩ وەزیر لە هندەوە وەلامی دایەوە کە بەیاننامەکە لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیادا ناکۆک نییە. ئایدیاکەی پشتی بە پێشنیارەکانی عەقید لۆرەنس بەستووە بۆ دروستکردنی حکومەتی عەرەبیی سەربەخۆ لەژێر فەرمانی منداڵانی شەریف حسەین لە هەر یەک سوریا و عێراق. لەهەمان کاتدا حسەین مەلیکی حیجاز بێت، ئەم حکومەتانە لەژێر سایەی حکومەتی بەریتانیادا دەبن. ولسن رەدی دایەوە کە پێشنیارەکانی لۆرەنس واقعیی و بەکار نین، پێشنیاری کرد ریفراندۆمی گشتیی بکرێت بۆئەوەی رای خەڵکی وڵاتەکە بزانرێت کە ئایا دەیانەوێت دەوڵەتێکی عێراقیی و حکومەتێکی عەرەبیی دابمەزرێنن کە پێک بێت لە ولایەتەکانی بەسرە، بەغداد و موسڵ یان نا؟ ولسن دەیویست حکومەتی بەریتانیی بخاتە سەر ئەو بڕوایەی کە عێراقییەکان دەیانەوێت کۆنترۆڵی بەریتانیی بەردەوام بێت و حەزیان لە سەربەخۆیی نییە. بەم بۆنەیەوە لە وەزارەتی هندەوە لە رۆژی (١٩١٨/١١/٣٠)دا بروسکەیەک هات بۆ ولسن داوای راپرسیی گشتیی تیادا کرابوو. هاووڵاتیانی عێراق دەبوو وەلامی سێ پرسیار بدەنەوە:

١. ئایا ئارەزوویان لە دەوڵەتێک هەیە کە لە سنوری ولایەتی موسڵەوە تا کەنداوی عەرەبیی یان فارسی درێژ ببێتەوە؟

٢. ئایا لەم حاڵەتەدا ئارەزوویان لە سەرۆکێکی عەرەبیی هەیە کە سەرۆکایەتیی ئەم دەوڵەتە بکات؟

٣. کێیە ئەو سەرۆکەی دەیانەوێت لەم حاڵەتەدا؟

لە بروسکەکەدا هاتبوو کە زۆر گرنگە بە لایانەوە دەربڕینی رای دانیشتوانی ناوچەکان دەربارەی ئەو کێشانە راستیی بن، بەشێوەیەک کە بەیانکردنی بۆ جیهان دەربڕینێکی پاکی رای خەڵکی عێراق بێت (٨).

ولسن هەر کە بروسکەکەی وەرگرت کەوتە کۆبوونەوە بە ئەفسەرە حاکمەکانی لە پارێزگاکان و قەزاکاندا. داوای لێ کردن کە بکەونە حەملەی پەیداکردنی وەڵامی ئەو سێ پرسیارە لەناو دانیشتواندا. بەڵام ولسن نەی دەشاردەوە کە وەڵامێک پەیدا بکەن ئارەزووی مانەوەی خەڵکی عێراق لەژێر سایەی بەریتانیادا بگەیەنێت. بەم پێیە ئەفسەرە بەریتانییەکان داوایان لە ئەهلی شارەکان دەکرد مەزبەتە کۆ بکەنەوە تیایدا داوا بکەن کە ئەو حاڵەتەی هەبوو بەردەوام بێت. هەندێکیان لەوەش زیاتر دەڕۆشتن بەوەی کە داوایان لە خەڵکیی دەکرد ئارەزوی مانەوەی پاراستنی موتڵەقی بەریتانیی بکەن، یاخود دانانی ئەمیرێک لەژێر چاودێریی بەریتانیادا.

بۆ گفتوگۆ دەربارەی ریفراندۆم ولسن داوای لە قازی شیعە و سونیی کرد هەریەکەیان ٢٥ کەس ئامادە بکات بۆ بەشداریی کۆبوونەوەیەک رۆژی ١٩١٩/٠١/٢٢. هەروەها داوای لە حاخامی یەهودیی کرد ٢٠ کەس و لە مەسیحییەکان ١٠ کەس ئامادە بکەن.

کۆبوونەوەکە بە ئەنجامێک دەرچوو کە داوای "حکومەتێکی عەرەبیی دەکرد لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا بەدەر لە چاودێریی بەریتانیی. ولسن و دەستەڵاتەکەی بەم ئەنجامە نارەحەت بوون. داوای لە لایەنگرانی، کە ژمارەیەکی کەم بوون، کرد کۆبوونەوەکە بەجێ بهێڵن. نوێنەرانی سونە و شیعە نارەزاییان لەم هەڵسوکەوتەی ولسن دەربڕی. یەکێتییەکی بێ وێنەیان پیشان دا لە دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆ پشتبەست بە ئەنجومەنێکی

هەڵبژێردراو. بەم بۆنەیەوە هەڵوێستنامەیەکیان دا بە دەسەڵاتی بەریتانیی بریتیی بوو لەمەی خوارەوە:

"وەکو زانراوە مەبەستی هەردوو دەوڵەت بەریتانیای گەورەو فەرەنسا ئەوەیە کە گەلانی رۆژهەڵات ئازاد بکەن و حکومەت و ئیدارەی نیشتیمانییان بۆ دابنێن. لە پراکتیکدا دامەزراندنی ئەم حکومەت و ئیدارانە لە هەر یەک لە سوریا و عێراقدا دەبێت بەپێی ئەوەی کە دانیشتوانی نیشتیمانیی هەڵیان دەبژێرن. ئێمە نوێنەری شیعەو سوننەی بەغداد و دەوروبەرین، بەگوێرەی ئەوەی کە ئێمە نەتەوەیەکی عەرەبیی ئیسلامیین، وا بۆ وڵاتی عێراق، کە لە موسڵی باکورەوە درێژ دەبێتەوە بۆ کەنداوی فارسیی، یەک دەوڵەتمان هەڵبژارد کە مەلیکێکی عەرەبیی موسوڵمان سەرۆکی بێت، ئەویش یەکێک لە نەوەکانی گەورەمان شەریف حسەین بێت. ئەم دەوڵەتە بەستراببێت بە ئەنجومەنێکی یاسادانانی نیشتیمانییەوە کە بەغداد بارەگای بێت."

جولەکەکان رەتیان کردەوە ئیمزای ئەم دەقە بکەن. هەندێک سەرۆک تایەفەی مەسیحییان بەلای خۆیاندا راکێشا کە ئەوانیش ئیمزای نەکەن. لە جیاتی ئەوە لە لای خۆیانەوە نامەیەکیان بەرزکردەوە داوای مانەوەی عێراقیان کرد لەژێر ئیدارەی بەریتانییدا (٨).

بەم پێیە دوو هێڵی سیاسیی جیاواز لە عێراقدا دەرکەوت. یەکەمیان سیاسەتی سەربەخۆبوونی خەڵکی عێراق و دووەمیان سیاسەتی داگیرکردنی عێراق بوو لە لایەن بەریتانیاوە. ئەم رووداوە لە راستییدا پیشانی لایەنە نیشتیمانییەکانی دا کە گفتی هاوپەیمانەکان و بەندەکانی ولسن قسەی بەتاڵن. لەسەرەتادا نارەزایی گەشتە کازمییە. زاناکان و ناسراوەکانی ئەوێش نامەیەکیان بە هەمان ناوەڕۆکەوە دا بە ولسن. نارەزایی و داواکاریی گەشتنە شارەکانی فوراتی ناوەراست، حلە، موسەیەب، کوفە، کەربەلا و نەجەف. ئەم بەرهەڵستییە جەماوەرییە پەرەی سەند تا بوو بە "شۆرشی بیست"ی عێراق رۆژی ١٩٢٠/٠٦/٣٠. (ولسن)یش لای خۆیەوە بەردەوام بوو لە پەیداکردنی مەزبەتە و ناودا بۆ پشتگیریی هەدەفەکەی خۆی. تا گەیشتە ئەوەی بروسکەیەک لە رێگای

وەزارەتی هندەوە لێ بدات بۆ حکومەتەکەی تیایدا بنوسێت: "زۆربە لە عێراقدا نایانەوێت گۆڕان لە حوکمی بەرقەراردا ببێت و دەیانەوێت لەژێر چاودێریی بەریتانیادا بمێننەوە. کەمەیەکیش ئەمیرێکی عەرەبییان دەوێت بە لیژنەیەکی تەشریعیی و دەستورەوە." ولسن لە بروسکەکەیدا پێشنیاری کرد کە مەندوبێکی سامی بۆ عێراق دابنرێت و وەزیری عێراقیی لە عەرەب و ناعەرب کە سەر بە بەریتانیابن یارمەتیی ئەم مەندوبە بدەن (٨). زوهێر دوجەیلی رای وایە دوای ٨٤ ساڵ دانانی دەسەلاتی "گارنەر" و "برێمەر" دوای روخانی سەددام لێچوی ئەم ئایدیا ئینگلیزییە بوو. بەلام حکومەتی بەریتانیی بە پێشنیارەکانی ولسن رازی نەبوو. وەلامیان دایەوە کە هەوڵ بدات چارەسەرێکی باشتر بدۆزێتەوە.لە وەلامەکەدا داوایان لێ کرد بچێت بۆ کۆنگرەی سولح بۆ پاریس بۆئەوەی لە نزیکەوە ئاگای لە گفتوگۆکانی ئەوێ بێت. ولسن دوای سەفەرەکەی گۆڕانێک هات بە سەر بۆچونەکانیدا. رۆژی ١٩١٩/٠٣/١٩ بروسکەیەکی کرد بۆ حکومەتەکەی و داوای لێ کردن رێگای بدەن بە دامەزراندنی لیژنەیەکی تەشریعیی ناوەند مەندوبێکی سامیی سەرۆکی بێت و عەرەبیش سەرەوکاری بەڕێوەبەرایەتییە جێبەجێکەرە جیاوازەکانی بکات. بەلام دەبێت بە تەنیشت هەر یەکێک لەوانەوە سکرتێرێکی بەریتانیی هەبێت (٨).

کردەوەی داگیرکەرانەی بەریتانییەکان لە زۆر شوێنی کوردستانیشدا بەتایبەت لە ساڵی بیستدا بوو بە هۆی بەیەکادان. چالاکیی پێشمەرگەیەتیی ناوچەکانی زاخۆ، عەمادیی، موسڵ، خانەقین و کفری گرتەوە. بەلام لە سلێمانی سیاسەتێکی پێشکەوتوو، کە بەری مێژوویەکی دورودرێژ بوو، بەرەنگاری بەریتانیا بووەوە. هەر لە سەرەتای ساڵی (١٩١٩)ەوە سیاسەتی داگیرکەرانەی بەریتانیا و سیاسەتی ناشونالیستانەی کورد لە حوکمدارییەکەی شێخ مەحمودا بەرەو خاڵی یەکتربڕین چوون. شێخ مەحمود و لایەنگرانی هەنگاویان دەنا بۆ دەوڵەتی کوردیی، بەلام ئینگلیزەکان ئەوانیان بۆ نۆکەریی دەویست.

### یەك حکومەت و دوو سیاسەت

بیروباوەڕ و سیاسەتی ناشونالیستانەی شێخ مەحمود و دەستە سیاسییەکەی لە مانگی دووی ساڵی (۱۹۱۹)دا تەشەنەی کرد بۆ کفری، کەرکوک و ڕەواندز. ولسن بڕیاری دا کە ناوچەکە ئیتر لە بەغدادەوە ڕاستەوخۆ ئیدارە بکرێت. بانگی حاکمە سیاسییە بەریتانییەکانی کرد بۆ کۆنگرەیەک لە بەغداد لە سەرەتای مانگی ئازاری (۱۹۱۹)دا. لەم کۆبوونەوەیەدا مێجەر نۆئێل، سۆن، لچمەن، ۆکەر، گوردن و کەسانی دی کە زانیاریی دەستی یەکەمیان دەربارەی ناوچەکە هەبوو بەشدار بوون. دوای گفتوگۆ و هەڵسەنگاندن، بڕیار درا کە مێجەر سۆن جێگای مێجەر نۆئێل بگرێتەوە. نۆئێل بەم بڕیارە ڕازی بوو (۱/۱۳۰). نۆئێل لە جیاتی کارە کۆنەکەی ئەرکی گەڕانێکی بە کوردستانی تورکیادا کەوتە بەر. بەڵام کابتن بیلی یاریدەدەری بە ئیش نێردرا بۆ دەرەوەی سلێمانی. لەم ڕۆشتنەیدا ئەحمەد فایەق بەگی وەکو وەرگێڕ و نوسەر لەگەڵدا چوو (۷/۸۷).

مێجەر سۆن لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری (۱۹۱۹)دا بوو بە حاکمی سیاسیی سلێمانی. کە مێجەر سۆن بە فڕۆکە لە سلێمانی نیشتەوە نزیکەی ۵۰۰ سوار و ۱۰۰۰ پیادە چوو بوون بۆ موشیرئاوا بۆ پێشوازیی. بەڵام مێجەر سۆن لە تەوقەکردندا خۆی لە شێخ مەحمود پەرێز گرت. شێخ مەحمود شوێنەکەی چۆڵ کرد و گەڕایەوە. بەدوای شێخ مەحموددا جەماوەرەکە بلاوەیان لێ کرد و بەریتانییەکان هەر خۆیان مانەوە (۳/٤٦٤).

سیاسەتی تازەی ئینگلیزەکان بەرامبەر بە کورد لەم کردەوانەدا دەرکەوتن:

۱. ئینگلیزەکان ناوچەی کفری و کەرکوکیان لە سلێمانی کردەوە. لە مانگی (۳)دا پارێزگای کەرکوکیان پێک هێنا. دواتر، ڕەواندزیان لە مانگی شەشدا لە سلێمانی کردەوەو لە پێکهێنانی هەولێردا (کۆیە)یان خستە سەر.

۲. مێجەر سۆن کەوتە پەیوەندیی بە سەرۆک هۆزەکانەوەو هاندانیان دژی شێخ مەحمود. ناکۆکیی نێوانی شێخ مەحمود و بەریتانییەکان لە لایەک و شێخ مەحمود و کەسانی سەر بە ئینگلیز لە لایەکی ترەوە دەستی پێ کرد.

۳. ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە دامەزراندنی هێزێک کە بە ڕوکەش لە ژێر

فەرماندەیی شێخ قادری برای شێخ مەحموددا بوو. بەڵام لە راستییدا مێجەر دانلیس بەڕێوەی دەبرد. ئەم هێزە لە سەربازی کورد و ژمارەیەک لە ئەفسەرە کۆنەکانی سوپای عوسمانیی دروست کرا بە ناوی هێزی "لیڤی"یەوە.

٤. ژمارەیەک لە کەسانی فارس، هندیی، بلوج و ئەفغانیی کە بەریتانییەکان بۆ خزمەتکاریی و نوسەریی لەگەڵ خۆیان هێنابوویانن، دەستدرێژییان دەکردە سەر خەڵک بەبێ ئەوەی سۆن هیچ سنورێکیان بۆ دابنێت.

٥. ئینگلیزەکان ژمارەیەک لە ناسراو و سەرخێڵەکانیان پارەو ساماندار دەکرد بە مەبەستی دژایەتیی شێخ مەحمود.

٦. موچەکەی شێخ مەحمودیان بە بیانوی کەمیی داهاتی کوردستان و بێپارەییەوە هێنایە خوارەوە بۆ دە هەزار روپی لە مانگێکدا.

٧. کابتن بیل کەوتە دامەزراندنی موختار و ئاغا لەناو عەشیرەتەکاندا لە شار و دەوروبەریدا لە کەسانێک کە رقیان لە شێخ مەحمود و نزیکەکانی دەردەبڕی.

٨. کابتن بیل هانی عەشایەرەکانی دەدا دژی لایەنگران و دامەزراوانی حکومەتەکەی کورد. کاتێک کە لە هاندانی عەشایەرەکانی رانیەدا دژی شێخ ئەمینی سندۆلان ژێر کەوت، پەنای بردە بەر حاکمی سلێمانی و سەرئەنجام شێخ بروسکەیەکی نارد بۆ عەشایەرەکان کە گوێڕایەڵی سیاسییەکانی بەریتانیی بن و بڕیاری پێویست بدەن دەربارەی شێخ ئەمین (١٣٢/١)

٩. بەریتانییەکان بە چاوێکی سوکەوە لەگەڵ دانیشتواندا جوڵانەوەو خراپەکارییان لەگەڵدا دەکردن. میللەت لەژێرەوە تا هات پڕ بوو لێیان (١٠٨/٧).

رەفیق حیلمی دەگێڕێتەوە کە مێجەر سۆن بوو بە قەرەقوش لە خەڵکیی. رۆژ نەبوو لەسەر تەرسی وڵاخ چەند کەسێک سزا نەدات. کە سۆن دەچوو بۆ بازاڕ دەبوو خاوەن دوکاندارەکان لەبەری راست بنەوە.

ڕێبوار خۆی لادا و ڕێگای بۆ چۆڵ بکات. پۆلیس یان جاسوسێک لەرزی لێ بهاتایە دەبوو خەڵکیی بچن بۆ لایان. "حەیومە فەنی" کوڕی پیاوێکی حەماڵی گومرگ بوو، لەو دەورەدا بوو بە فەرماندەی مەرکەز. جارێک توشی لەرزوتا بوو خەڵکی سلێمانی پۆل پۆل چون بۆ سەردانی بەوانەشەوە کە خۆیان زۆر بە گەورە دەزانی.

سۆن لە ڕێگای پرۆژەی جادەو ڕێگا ڕاکێشانەوە ژمارەیەکی زۆر لە کورد عەرەب و عەجەمی لەژێر دەستی "عەزیز خان"ێکی فەیلییدا بەناوی ئەندازیار، چاودێری کرێکارەوە خستبووە دەوری سلێمانیەوە. عەزیز خان پیاوێکی نەخوێندەوار و ترزل و توش بوو. چاوی بەری عەرزی نەدەبینی و دوای سۆن هەر خۆی حساب بوو. زۆربەی چاودێرەکان نەخوێندەوار بوون. ئەمانە ڕێگایان ڕاست دەکردەوەو ڕێکیان دەخست. لەسەر ئاوەڕۆ پردیان دروست دەکرد. بۆ ئەم پرۆژانە دراوێکی ئێجگار زۆر سەرف دەکرا. بەشێکی زۆری ئەم پارانە لە سندوقی میریی دەردەچوو. دەچووە ژێر دەسەلاتی "عەزیز خان"ەوە لەوێشەوە دەچووە گیرفانی سۆنەوە (١٠٨١/٧) شێخ مەحمود نامەیەکی نارد بۆ ولسن. لە نامەکەیدا نوسیبووی: "کورد داوای ئازادیی دەکەن. ئەگەر ئەم هەقە لە ماوەیەکی نزیکدا وەرنەگرن، ناتوانم پەیمانی ڕەدکرنەوەیان بدەم. لەبەرئەوە بە ناوی خۆم و هەموو کوردەوە تکا دەکەم هەڵسوکەوتی سیاسەتی ناڕەواتان بگۆڕن، هەروەها پیاوی سیاسەتی ئێستاتان سۆن لابەرن بە یەکێکی دیکە کە سەنگین تر و پرماناتر بێت."

بەلام هەڵوێستی کورد سیاسەتی ئینگلیزەکانی نەگۆڕی. ڕۆژی ١٩١٩/٠٣/١٥ کاپتن "لیز"یان کردبوو بە یاریدەدەری حاکمی سیاسیی لە کفری. کاپتن کەوتە پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەندێک سەرۆک عەشیرەتەکانی بەگزادەی جاف و خانمی وەسمان پاشا بەتایبەت. بەهاتنی مانگی چواری ساڵی ١٩١٩ ژمارەیەکی زۆر لە عەشایەر لە دەسەلاتی کورد جیا بوو بوونەوە.

دەسەڵاتی کوردیش لای خۆیەوە کەوتە خۆی. دەستیان کرد بە کۆبوونەوەو لێکۆڵینەوەی ڕەوشەکە و هەنگاونان. شێخ مەحمود باوەڕپێکراوەکانی خۆی نارد بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق بۆ پەیوەندیی کردن بە ناسراوەکانەوە. لەوە دەکۆڵینەوە کە هەڵوێستی ئەو ناوچانە چۆنە بەرامبەر بە ئینگلیز. لە زۆربەی شارەکان ئینگلیزەکان بوو بوون بە ناحەز. ناوبەناو لە حاکمەکانیان دەکوژرا. کەسانی چاک و ئاسایی لێیان دەتەکانەوە. لە زۆربەی شارەکانی عێراقدا بە نهێنیی ڕێکخراو دروست دەکرا. جەماوەر لە بەڵێنەکانی بەریتانیا بێ هیوا بوو بوو. ژمارەیەک بە لای تورکەکاندا دەیان شکانەوە (١٠٦/٧).
شێخ مەحمود بە نهێنیی پەیوەندیی کرد بە مەحمود خانی دزڵییەوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ لەشکرکێشیی. شێخ مەحمود وەڵامی نارد بۆ مەحمود خان کە بە بیانوی زیارەتی کاک ئەحمەدی شێخەوە بێت بۆ سلێمانی. ئەفسەری سیاسیی لە هەڵەبجە "لیز" بە پەلە ئاگاداری مەحمود خانی کردەوە کە دوژمنایەتیی بەریتانیا مەترسیی لە بەردەمدایە (١٣٤/١).
بەڵام مەحمود خان ڕۆژی ١٩١٩/٠٥/٢١ بە ٣٠٠ چەکدارەوە هاتە ناوچەی سلێمانی. مێجەر سۆن وەڵامی نارد بۆ شێخ مەحمود کەوا مەحمود خانی دزڵی گەشتۆتە شارباژێڕ. پێشنیاری کرد کە تەنها دە کەسی بە بێ چەک لەگەڵدا بێتە ناو شارەوە. ئەگینا شێخ مەحمود لە قسەی سۆن دەردەچێت. شێخ لە وەڵامدا وتی: "نەبووە بە نەریت ڕێگا لە کەس بگیرێت بێت بۆ زیارەتی کاک ئەحمەدی شێخ."

سۆن بەشەو هاتوچۆی لە شارەکەدا قەدەغە کردبوو. ئینگلیزەکان لیوایەکیان هێنابووە قەراغ شار و خێوەتیان هەڵدابوو. لەناو شاردا جەماوەر جوڵەی تێکەوت، هاتنە سەر جادەو ڕۆشتن بەرەو ماڵی شێخ مەحمود. خەڵکەکە هاواریان کرد: "شێخ مەحمود تۆ لەگەڵ تاجی بەریتانییدایت یان لەگەڵ ئێمەدایت؟" شێخ مەحمود لە وەڵامدا وتی: "تاجم ناوێت، ڕەزابوونی گەل ڕەزابوون منە. سەربەخۆییەک ئینگلیز بیدات توانەوەو نەمانە، تا دوا هەناسەی ژیانم لەگەڵ ئێوەدام" (٥٣/٥). شێخ مەحمود بیری وابوو کە بڵێت: "نامەوێت ژینی ئەسارەت، بەسمە عومری

گومرەهیی. نای خەمە سەر خۆم بە دەستی موددەعیی تاجی شاهیی. قەد بە ئەمری دوژمنانم نامەوێت فەرمانڕەهیی."

کورد وەفدێکی بە سەرۆکایەتیی عیزەت نەجیب نارد بۆ لای بەریتانییەکان و داواکارییەکانی کوردیان خستەوە پێش. بەڵام ئەوان دایانەوە دواوە. شێخ مەحمود چووە ناو جەماوەرەکەوەو روویان کردە سەرا. ئەفسەر و سەربازە کوردەکان لەجیاتی ئەوەی تەقە لە راپەرینەکە بکەن، چوونە پاڵ ئەفسەری وڵاتپارێز عیزەت نەجیب. بە فەرمانی شێخ مەحمود، عیزەت نەجیب ئاڵای بەریتانیای لەسەر بینای ئیدارەی بەریتانییەکان داگرت و لە جێگایدا ئاڵای کوردستانی هەڵ کرت. شێخ مەحمود وتی: "ئاڵاکەیان بە جوانیی بۆ قەد بکەن و بیاندەنەوە با بچن لە وڵاتی خۆیان هەڵی بکەن."

شەڕ لە نێوانی مەحمود خانی دزلی و هێزی لیڤیدا دامەزرا. هێزی لیڤی لەژێر فەرماندەی "دانلیس"دا بە ٢٠٠٠ پیادەو ٤٠٠ سوارەوە کەوتنە شەڕ. لە شەڕەکەدا ئەفسەر "رەشیدی عاسیە خان" و دوو ئەفسەری ئینگلیز کوژران و "مێجەر دانلیس"یش گیرا. کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندیی و ئەحمەد بەگی ساحێبقران ژمارەیەکیان لێ هەڵبڕین بەرەو کەرکوک (٥٤/٥). زۆربەی پاشماوەی ئەم هێزەی لیڤی چوونە ناو هێزەکەی مەحمود خانەوە.

کاتێک کە جەماوەری خەڵکەکە رووی کردە شەڕەکە بۆ یارمەتی مەحمود خان، هێزی لیڤی بە تەواویی شکا بوو. مێجەر سۆن پێش گەیشتنی مەحمود خان، گرینهاوسی کردبوو بە جێگری خۆی (١١٥/٧). سۆن هەڵهات بۆ هەڵەبجە. لە هەڵەبجە هەوڵی دا بە یارمەتیی هەندێک لە بەگزادەی جاف لەشکرکێشیی بکات بەڵام بۆی سەر نەچوو، لەوێوە رووی کردە بەغداد (٥٤/٥).

شێخ مەحمود زوو ئینگلیزەکانی لە "دەبۆکە" کۆکردەوە بۆئەوەی لە دەستدرێژیی جەماوەر بیان پارێزێت و بە رێزەوە لەگەڵیاندا جولایەوە. هەواڵ دوای دوو رۆژ گەشتە بەغداد. دەسەڵاتی کورد هێزێکی بە فەرماندەی شێخ کەریم ئامادە کرد بۆ گرتنی هەڵەبجە. بڕیاریان دا حامید بەگی جاف

هەڵەبجە رزگار بکات و ببێت بە حاکمی ئەوێ. بەڵام دوو شەبەیخونیان کرد بۆ سەر بنکەی حاکمی سیاسیی بەریتانیی بە بێ ئەوەی ئەنجامێکی تەواو بدات بەدەستەوە (١٣٨/١).

ولسن بە فڕۆکە هات بۆ سلێمانی و بەیانێکی بۆ شێخ مەحمود خستە خوارەوە. داوای کرد شێخ مەحمود بچێت بۆ بەغداد بۆ گفتوگۆ. شێخ مەحمود هەندێک مەرجی دانا بۆ ئەم چاوپێکەوتنە بەڵام ولسن نەچووە ژێری (١١٦/٧). ولسن لە سلێمانییەوە چووە سەر هەڵەبجەو لەوێ نامەیەکی دەستخەتی بۆ حاکمی سیاسیی خستە خوارەوە کە بەیارمەتی خانمی وەسمان پاشا دەربچێت. خانم دواتر لە پاداشتی دەرکردن و خزمەتی ئینگلیزەکاندا پاشناوی "خان بەهادۆر"ی وەرگرت. دوای دەستبەسەراگرتنی شار لە لایەن شۆڕشگێڕە کوردەکانەوە، لایەنگرانی شۆڕش زیادی کرد. دەسەڵاتی کورد هێڵی تەلەگرافی نێوانی سلێمانی و (کەرکوک)یان بڕی بوو بۆ نەگەیشتنی هەواڵ بە بەریتانییەکان لە کەرکوک. هەروەها هێزەکانی شۆڕش دەستیان گرت بە سەر کاروانێکدا کە لە کفرییەوە دەهات بۆ سلێمانی. لەم کاروانە پارە و ژمارەیەک تفەنگ و ئەسپ دەست شۆڕشگێڕان کەوت (١٣٦/١).

شێخ مەحمود رۆژی ١٩١٩/٠٥/٢٢ دوو فەرمان و بەیانی ژمارە یەکی شۆڕشی دەرکرد. بە فەرمانی یەکەم لیژنەیەکی پێک هێنا بۆ کاروباری تەقەتکردنی سوپای کوردستان بە تفاق. ئەم لیژنەیە بە سەرۆکایەتیی سەید عومەر و ئەندامەتیی ئەحمەد سەبری خواجا، سەید کەریم سەید ئەحمەد و شێخ عەلی سەرکار پێک هات. بە فەرمانی دووەم ئەنجومەنێکی دانا بۆ بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری حکومەتەکە لەو کاتانەدا کە حوکمدار شێخ مەحمود لە دەرەوەی سلێمانی پایتەخت بێت. ئەم لیژنەیە پێک هات لەم ناوانەی خوارەوە:

١. سەید عومەر، سەرۆک (پێشتر موتەسەریف بوو)
٢. ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی ساحێبقران، حەمدی. (پێشتر بەڕێوەبەری شارەوانیی بوو)
٣. سەید کەریم سەید ئەحمەد.

٤.سالّح پاشا.
٥. ئەحمەد خواجا.
٦. حەمەد بەگی قادر بەگ.

بەلام بەیانەکە بریتیی بوو لەمەی خوارەوە:
"بە فەرمانی حوکمداری کوردستان سەرکردەی گشتیی "مەحمودی کوڕی سەعید"، سوپای کورد دەستی دایە چەک. بە هۆی ناڕەوایی، پارچەکردنی گەلی کورد، خراپەکاریی، لادان لە پەیمانی دانی مافەکان بە کورد لە لایەن ئینگلیزە بەریتانییەکانەوە، رۆژی ۱۹۱۹/۰٥/۲۱ یەکەم رۆژی شۆڕشی کوردە لەبەردەمی بەریتانیای گەورەدا (٥٠٥/٣).

**مەحمود**
**حوکمدار و فەرماندەی گشتیی**

## لێکدانەوەی مێژوویی

لە سالانی (۱۸۷۸ـ۱۸۸۰)دا سیاسەتی داگیرکردنی ولاتان و دەستگرتن بەسەر جیهاندا لە لایەن ولاتە ئەورووپییەکانەوە کەوتە گەشکردن. ئەم دەرکەوتە یەکەم جار لە بەریتانیاوە دەستی پێ کرد. چونکە بەریتانیا یەکەم دەوڵەت بوو لە ناردنەدەرەوەی خەڵوزی بەردین، دەرهێنان و پیشەسازیی مێتال و پیشەسازیی چنیندا. جگە لەمە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا گەورەترین ئستۆڵی دەریایی هەبوو کە لە توانایدا بوو زۆربەی رێڕەوە دەریاییە ستراتیجییەکانی جیهان بپارێزێت. "لەندەن"ی پایتەخت لە گرنگترین شوێنە جیهانییەکانی دراو بوو. چڕبوونەوەی سەرمایەو پیشەسازیی لە بەریتانیادا هێزێک و سیاسەتێکی دروست کرد کە لە ئاستێکدا بوو یەکەم، رێگا بگرێت لە ولاتە ئەورووپییەکانی دی کار بکەنە سەر بەرژەوەندییەکانی و دووەم، ئیمتیازەکانی دەرەوەی ئەورووپای بپارێزێت. بەریتانیا لە سالانی (۱۸۸۰ـــ۱۸۹۰)دا نیمچە پارێزەری ئەفغانستان و سنوری هند بوو. لە چین و ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا لە

الكورد الذي راى انهم لن يرضوا بأقل من حمرين كحدود وعليه، فقد شكك في مسالة تخليهم عن الشيخ[1].

واستنتج تقرير بريطاني بوضوح ان هذه التصريح لم يأتي بنتيجة ملموسة لأنه جاء متأخراً جداً ولمكانة الشيخ محمود كما تكهن بها نوئيل كانت قوية جداً[2].

وبعد هذه المرحلة شهدت الفترة اللاحقة ١٩٢٣-١٩٢٦ تطورات أخرى على الساحة الكوردية لمختلف الإطراف الكوردية، البريطانية، التركية والعراقية وفي ظل هذه الوضع الدولي لعب الشيخ محمود أيضا دوره في تزعم الحركة الكوردية في كوردستان الجنوبية بأمل التأثير على الأوضاع وتسخيرها لتحقيق استقلال ذلك الجزء الكوردي.

## الخاتمة

١- ظهر الشيخ محمود بعد انتهاء الحرب العالمية الأولى كأحد الشخصيات البارزة في كوردستان الجنوبية التي لعبت دورها في مسار الأحداث السياسية ومصير المنطقة. وكان عاملاً في مجيء البريطانيين إلى كوردستان بعد الاتصال بهم والتنسيق معهم للحيلولة دون عودة الأتراك لكوردستان وضمان المساعدة البريطانية للنهوض و التقدم فيها.

٢- كانت معرفة السياسة البريطانية بالكورد وكوردستان أولية، حيث كان دخولهم لأراضي كوردستان جديداً وحتمت عليهم هذه التجربة الاستعمارية الجديدة الإلمام بالمسألة الكوردية وعليه كانت سياستهم الكوردية وخططهم لإدارة وتحديد مصير كوردستان، يتسم بتعدد الآراء وتناقضها وغموضها والتخبط في أحيان اخرى. وكان احد نتائج ذلك التناقض مع الآمال الكوردية، او حتى الأصطدام معها في بعض الأحيان.

---

(١) عثمان علي ، م.س ، ص٤١٦.

(٢) ن. م ، ص٤١٨.

٣- اتسم الموقف البريطاني من الشيخ في بدايته بالايجابية والتوافق الذي خلقه الوضع القائم من إدارة بريطانية-كوردية مشتركة في منطقة السليمانية وإنحائها. ولكن هذا الموقف تغير لاعتبارات سياسية تعلقت برغبة الساسة البريطانية في بغداد في انتهاج سياسة حصر وتحديد السلطات الكوردية الممثلة بإدارة الشيخ محمود وإحلال إدارة مباشرة بريطانية محلها تدريجياً على غرار المناطق الأخرى من مسيوثؤتاميا.

٤- افرزت هذه الخطوة نتائج سلبية من ضمنها، إندلاع انتفاضة كوردية ونفي الشيخ محمود وتدهور العلاقة الكوردية البريطانية. انعكس إختلاف الراي على تحليل وتفسير كل من الضابطين السياسيين (اللذين تناوباً على الإدارة في السليمانية) لأسباب الانتفاضة وسلوك الشيخ ودوره في هذا الأحداث.

٥- اتفاق الآراء البريطانية على عودة الشيخ إلى كوردستان وفك أسرة بعد التطورات التي شهدتها المنطقة وبروز تحديات جديدة وتنصيبه حكمدار على السليمانية وأنحائها.

٦- استياء العلاقة بين الجانبيين لعدم أتفاق الطرفين في الأهداف وتناقض مصالحهما مما أدى بالجانب البريطاني إلى تجاهل مطالب الشيخ ثم إنذاره فيما بعد واستخدم القوة.

٧- وبالنتيجة يمكن تمد الشيخ محمود جزءاً من المسألة الكوردية في كوردستان الجنوبية في الفترة المهمة المتناولة في بحثنا هذا.

## قائمة المصادر


**المصادر باللغة العربية:**

١- احمد عثمان ابوبكر، كردستان في عهد السلام (بعد الحرب العالمية الأولى)، (اربيل ،٢٠٠١).

٢- ارنولد ولسن، بلاد مابين النهرين بين ولائين ،ترجمة : فؤاد جميل ، (بغداد،١٩٧١).

٣- س.ج.ادموندز، ترك وكرد وعرب ،ترجمة: جرجس فتح الله، (بغداد،١٩٧١).

٤- إليزابيث بيرغوين، جيرترود بيل وأوراقها الشخصية ١٩١٤-١٩٢٦ ،ترجمة:نمير عباس ،
(عمان،٢٠٠٢).

٥- عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦-دراسة تاريخية وثائقية ، (اربيل،٢٠٠٣).

٦- وليد حمدي، الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية ، (لندن ،١٩٩١)

**المصادر باللغة الكوردية:**

١- احمد تقى، خهباتى گهلى كورد له ياداشتهكانى احمد تقىدا، (بغداد ،١٩٧٠).

٢- رسول هاوار ،شيّخ محمود قارهمان و دهولّهتهكهى خوارووى كوردستان ، به(١)و(٢) ، (لندن ،١٩٩١).

٣- رفيق حلمي ،ياداشت ، بة(١)ء(٢) ، (سليّمانى ،١٩٨٨).

٤- رۆبرت ئۆلسن، راپهرينى شيّخ سعيدى پيران ،وهرگيّرانى:ابوبكر خۆشناو ،(سليّمانى ،١٩٩٩).

**المجلات:**

١- احمد عثمان ابوبكر ، مقترحات لإدارة مناطق كوردية بعد الحرب العالمية الأولى، مجلة كاروان، ع(٤٨) ، أيلول ١٩٨٦.

٢- مذكرة حول الشيخ محمود، إعداد: الكابتن:ب.هولت،ترجمة: أزاد گرمياني،مجلة راية الإسلام،ع(١)،آذار ١٩٩٦.

**المصادر باللغة الانكليزية:**

1- Derk kinnan, Kurds and Kurdistan, (London, 1970).

(١)

## وتەیەکی پێویست:

سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٨ز، لەبەر شاڵاوی ئیقلیمگیریی ئەو هێرش و کیمیاویی بارانەی لەلایەن هێزەکانی (سەدام حسین)ەوە بۆ سەر ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عێراق کرا، ناچاربووین بە هەر دەردەسەریی و دژواریی و لێبڕانێك بوو، لە بناری چیای (ئاسۆس)ەوە دەربازبووین و چووینە کوردستانی ئێران و لەوێش لە شاری (سەقز)ی شیرین و جوانکیلەدا گیرساماوەو لەسەرەتادا هەر زوو بەهۆی هەندێ دۆستی دێرینەمەوە، لەگەڵ بنەماڵەی شێخەکانی گوندی (دۆزەخدەرە) ناسیاوییم پەیداکردو ئەوانیش لوتفیان نواند، نەوازشێکی زۆر کوردانەو جگەرسۆزانەیان کردین و لە سنووری توانای خۆیان بەدەر، یارمەتییان داین.

(دۆزەخدەرە)، گوندێکی زۆر بچکۆلەی سەر بە شاری سەقزەو نزیکەی (٥) کیلۆمەترێك لە خۆرهەڵاتی باکووری سەقزەوە دوور دەبێ. گوندەکە لە دەمێکەوە بەهۆی ماڵەباوانی بنەماڵەی سەیید عەبدولقادرەوە (١٨٧٣-١٩٥٧ز)، لەگەڵ بنەماڵەی کاك ئەحمەدی شێخ (١٧٩٢-١٨٨٧ز)ی سلێمانییەوە، دۆستایەتی دێرین و ڕاستەقینەو پتەویان پەیدا کردووە، ئیتر ئەوە دوای ئەوەو تائێستاش ئەم دۆستایەتییە هەر بەردەوامە.

ئەم دۆستایەتییە لە سەردەمی شێخ مەحموودی حەفید (١٨٨١-١٩٥٦/١٠/٩)دا، زیاتر گەشەی کردووە، کە هاوتەمەنی (سەیید عەبدولقادر) بووە. دۆستایەتییەکەیان ئەوەندە توندو پتەو بووە، زۆر جار لە سنووری پێوەندی نێوان شێخ و خەلیفەی تێپەڕاندووەو وەك نەوەکانیان دەیگێڕنەوە، لە هەموو کات و سەردەمێکی خۆشی و ناخۆشیدا، لە

سەردەمی ئەوپەڕی دەسەڵاتی شێخ مەحموودا، کە حوکمداری کوردستان بووە، تا ئەوپەڕی بێدەسەڵاتیی شێخی نەمر، کە لەدوای ژیانی ئاوارەیی و دەست بەسەرییەکەی، لە بەغداد هەڵاتووەو بۆ نیشتمان گەڕاوەتەوەو لە گوندی (داریکەلی) گۆشەگیر بووە، هەمیشە بەسەر سنووری توند داخراوو قایمکراوی هەردوو دەوڵەتی عێراق و ئێراندا، نامەی بەردەوام و هاتووچۆ لەنێوانیاندا بەردەوام بووە، هەر ئەوەکانی سەیید عەبدولقادر دەیگێڕنەوە، کاتێ کە هەواڵی کۆچی دوایی شێخی نەمر، بە شێخ عەبدولقادر گەیشتووە، ئیتر لە سوێی شێخ مەحموود، زۆر نەڕیاوەو نەخۆش کەوتووەو دوو مانگ دوای کۆچی شێخ مەحموود لە (۱۹۵۷/۱۲/۲۳ز-۱۳٤۹/۱۰/۲هەتاوی) کۆچی دوایی کردووە، هەر لەبەر ئەمە، ئەوانەی لە نزیکی (شێخ)ەوە ئاگاداری دۆستایەتیی هەمەلایەنەی شێخ مەحموود بوون، چاکتر شارەزای ئەم پێوەندیو دۆستایەتییە قووڵە بوون، بۆیە شاعیرێکی میللی وەك: بەنگینە- حاجی باقی (۱۹۰۸-۱۹۷۲ز)، کە شێخیی نەمری خۆشدەویست، لەو شیعرە بڵاوەیدا، کە بۆ کۆچی دوایی شێخ مەحموودی نووسیوەو سەرەتاکەی بەمجۆرە دەست پێدەکات:

ئەی دڵ ! کۆستی وا، هەر نەبینراوە
بۆ هەڵناقرچێی بەدەم جەفاوە!
هاوار ! بەندی دڵ، بڕا بە جاریٚ
قەڵای قەومی کورد، ڕووخایە خواریٚ

لە بەیتێکیدا ئاماژەی بۆ ئەو دۆستایەتییە توندەی نێوان شێخ مەحموودوماڵباتی شێخانی (دۆزەخدەرە) کردووەو دەڵێت:

ڕادیۆ بانگی دا، لە دۆزەخدەرە
(شێخ) وەفاتی کرد، بۆ کورد خەتەرە[1]

---

[1] دیوانی حاجی باقی (بەنگینە)، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی عوسمان محەمەد هەورامی، سلێمانی، چاپەمەنی دیلان، چاپی یەکەم، ل٦٧.

لــــەماوەی تەمــــەنی دۆســــتایەتیی (شــێخ مــــەحموود) و (ســــەیید عەبــدولقادر)دا، (١٣) نامــەی شــێخی نــەمر، نــەوەکانی ســەیید عەبــدولقادر پــارێزراون، کــە شــێوەی پارێزگــاریی ئــەم نامانــە، ئەوەنــدە بــە پیرۆزیــی و رێــزەوە هــەڵگیراون، تەنانــەت زەرف (پاکــەت)ی نامــەکان وەك خۆیــان مــاون، بــەجۆرێکیش هــەڵگیراون، کــە ئەگــەر هــەر ســەیری پشتی زەرفــەکان بکرێــو ســەیری مێــژووی ســەر نامــەکانی ناویــان نــەکرێ، وا دەزانــرێ هــەر چــەند مانگێکــە نێــردراون، لەکاتێکــدا دوو نامــەیان، کــە هــی ســەردەمی حوکمــداریی کوردستانە، مێژوویان نزیکەی (٨٠-٩٠) ساڵێك لەمەوبەرە.

ســەیر لەوەدایــە، شــێخی نــەمر ئەوەنــدە گونــدی (دۆزەخــدەرە)ی لا شــیرین بــووە، دڵــی نــەهاتووە لەســــەر پــشتی زەرفــەکان و ســــەردێری ســــەرەتای نامــــەکان بنووســــێ: (دۆزەخــــدەرە)، بــــەڵکوو لای خۆیــــەوە بــــە (جەننــــەت دەرە)ی ناوناوەو تکای لە نزیکانی خۆیشی کردووە، تا هەروای ناوبەرن.

شــــایانی باســــە، پێوەنــــدیی شــــێخی نــــەمرو ماڵبــــاتی شــــێخانی (دۆزەخــدەرە)، لــە ســنووری ئــەم نامانــە بــەربڵاوترو چــڕە، کــە وەك نــەوەکانی بنەماڵــەی (ســــەیید عەبــدولقادر) دەیگێڕنــــەوە، لــــەکاتی جــــەنگی یەکــــەمی جیهانیــــدا، کــــاتێ لەشــــکری ڕووســــی لــــە خۆرئــــاوای ئێرانــــەوە، ڕووەو (مــــەریوان)و (پێنجــوین) بــەرەو کوردســــتانی باشــوور هــاتوون، شــێخی نــەمر بــۆ بــەرپێگرتنیان بــە لەشــکری کــوردەوە هاتۆتــە نزیــك پێنجــوین و ژمارەیــەکی زۆر لــە جــەماوەری کوردســتانی ئێــران، لــە لەشــکری (شــێخ)دا پێــشمەرگە بــوون، کــە ئەنــدامان و خزمــانی ماڵبــاتی شــێخانی (دۆزەخــدەرە)ش لــەم هەڵوێــستەدا بــــە دڵ و بــــە گیــــان لەگــــەڵی بــــوون... دوای ئەمــــەش وەك بیرەوەرییــەکانی زێــوەر (١٨٧٥-١٩٤٦)ی شــاعیر لــە(گەنجینــەی مــەردان)و شــێخ لــەتیف حەفیــد (١٩١٧-١٩٧٢) دەیگێڕنــەوە، لــە تێــشکانەکەی شــەڕی (دەربەنــدی بازیــان)دا، کــە ژمارەیــەکی زۆری لەشــکرەکەو بنەماڵــەی شــێخی نــەمر، ئــاوارەبوون و ڕوویــان لــە کوردســتانی ئێــران کــردووەو لــە مــەریوان و بانــەو ســەقزدا گیرســاونەتەوە، لەلایــەن بنەماڵــەی دۆزەخــدەرەوە پێــشوازیی

شـایان کـراون و داڵـده دراون و حەسـێنراونەتەوەو سـەرلەنوێ بـۆ مەیـدانی خـــەبات ئامادەکراونەتـــەوە.. دواتـــریش لـــەکاتی حوکمدارییەکەیـــدا، ڕوونـاکبیری ناسـراوی وەك (سـەیید ڕەئـووف ضـیائی)، کـە ئـەویش هـەر (سـەقز)ییـەو لەگـەڵ شـێخانی دۆزەخـدەرەدا خزمـە، لـە سلێمانی لای شێخ هەمەکارە بووە.

نـاوەڕۆکی ئـەم چـەپکە نامەیـەی شـێخ مـەحموود بـۆ سـەیید عەبـدولقادری دۆزەخـدەرە، هـەموویان بـاس و بابـەتی دۆسـتایەتی ئـامێزن و بـریتین لـە کاروبـاری تایبـەتی هـەردوو دۆسـت. بـەڵام ئـەوەی جێـی سـەرنج و دڵخۆشـییە، چـوار لـەم نامانـەی (شـێخ) بـە کـوردی، بـۆ دۆسـتێکی وەك عەبـدولقادر، لـە پارچـەیەکی تـری کوردسـتاندا نووسـراون، کـە لـەو سـەردەمەدا زمـانی کـوردی تێـدا قـات و قـڕ کـراوەو نیـشانەی ئەوەشـە، کـە سەیید عەبدولقادر زانیۆێتی کوردی بخوێنێتەوە.

هاوکـات (٤) نامەشـیان لـەکاتی حوکمدارییەکـەی شـێخ مـەحمووددا نووسـراون، کـە لـە دامێنـی هـەر نامەیەکیانـدا، لەسـەروو نـاوی خۆیـەوە دەنووسـێ: مـەلیکی کوردسـتان. ئـەم چـەپکە نامەیـەی بـۆ سـەیید عەبـدلقادری دۆزەخـدەرە نووسـراون، مێـژوویان لـە (١٩٢٠-١٩٤٧)ن دەخایـەنێ. هەرچـەندە لێـرەدا دەبـێ ئـەوەش بڵـێم، کـە چ ئـەو نامانـەی بـە فارسـی و چ ئەوانـەش بـە کـوردی بـۆ بنەماڵـەی دۆزەخـدەرە نووسـراون نووسـیارەکانیان کـوردی و فارسـی زان نـەبوون و ئاسـتی خوێندەواریـشیان زۆر باڵا نەبووە.

وەك لەسـەرووتریش ئامـاژەم پێـدا، لەبـەر ئـەوەی نـاوەڕۆکی زۆربـەی ئـەم نامانـە، تایبـەتن بـە کاروبـاری دۆسـتایەتی هـەردوولاوە بـە پێویـستم نـەزانی سـەرنج و لەنگـەری زۆریـان ڕابگـرم، بـەڵام دواتـر سـەرنجێکی گـشتی لەسەر پوختەی ناوەڕۆکیان دەردەبڕم.

(٢)

هـەر لـەو ماوەیـەدا کـە لـە سـەقز بـووم، زۆر زوو لەگـەڵ بنەماڵـەی بـەڕێزان کاکـە سـەیید عەبـدولقادری (سـیادەت)ی شـاعیر کاکـە سـەیید مـستەفای تورجـانی، کـوڕانی خوالێخۆشـبوو: حـاجی بابەشـێخ (١٨٧٦-١٩٥٩ن)ی سـەرۆك وەزیرانـی کۆمـاری کوردسـتاندا ناسـیاویی و دۆسـتایەتی بـەتین و بەتایبـەتیش لەگـەڵ کـاك سـەیید مـستەفادا پەیـدا کـرد، کـە بـەهۆی پلەوپایـەی دێرینـەو ناوبـانگ و پێوەنـدی کۆمەڵایـەتی بـەربڵاوی جـەنابی باوکیانـەوە، بەڵگەنامەیـەکی هەمـەجۆرەی زۆریـان لـەلا کۆبۆتـەوە، لـەناو ئـەو بەڵگەنامانەشـدا، وەڵامنامەیـەکی شـێخ مـەحموود بـوو بـۆ "حـاجی بابەشـێخ" کـە بـە مێـژووی (١٩٣٠/٩/٣١ن) نووسـرابوو. نامەکـە بـە زمـانی فارسـی و خـەتێکی خـۆش و پەخـشانێکی بـەتین و چـڕ دارێژراوە.

لـەم وەڵامنامەیـدا دەردەکـەوێ، کـە پێـشتر جـەنابی حـاجی بابەشـێخ لەلایـەن دەوڵـەتی شاهەنـشایی ئێرانـەوە، تکـا لـە حـاجی بابەشـێخ کرابـێ، تـا بـەهۆی دۆسـتایەتییانەوە لەگـەڵ شـێخ مـەحمووددا، داوای گـرتن، یـان بەدەسـتەوەدانی (حەمـە ڕەشـیدخانی بانـە)، لـە شـێخ مـەحموود بکـات، کـە لـەو کاتـەدا لـە دەسـت ئێـران هـەڵاتووە. واتـە: لـە سـاڵی (١٩٣٠ن)دا ئـەم هـەردوو کەسـایەتییە کـوردە، پلـەو پایەیـەکی دەوڵـەت و ڕێکخـراوو حیزبێکیـان نییـە، چـونکە وەك دەزانـین لـەو سـاڵانەدا (شـێخ) دەسـەڵاتی حوکمـداریی کوردسـتانی نـەماوەو بـە تایبـەتیش لـەکاتی نووسـینی ئـەم نامەیـەدا، سـلێمانی جێهێـشتووەو لـە ناوچـەکانی شـارباژێرو پێنجوێنـدا دەژیـو ئـەم نامەیـەش ڕێکەوتـە لەگـەڵ هەڵـچوون و ڕۆژانـی جـەماوەری دەڤـەری سـلێمانی و دەوروبـەری بـە تایبـەتی و زۆربـەی ناوچـە کوردنیـشینەکانی کوردسـتانی عێـراق،

چونکه ئەم نامەیە هەفتەیەك دوای خۆپیشاندان و ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی (١٩٣٠/٩/٦ن) نووسراوە، بەڵگەی ئەوەیە، کە شێخ لەم کاتەدا دەسەڵاتی ئیداریی و یاسایی بەسەر دەوڵەتی عیراقدا ناڕوات تا داوا لە هێزو بەرپرسانی عێراق بکات (حەمە ڕەشیدخانی بانە) یان بۆ دەسگیر بکات و بە دەسەڵاتدارانی ئێرانیان بداتەوە. هاوکات (حاجی بابەشێخ)یش هێشتا نەبۆتە سەرۆك وەزیرانی کۆماری کوردستان. لەبەر ئەوە بەرپرسانی دەوڵەتی شاهەنشایی ئێران ئەم هەلومەرجەیان هەڵسەنگاندووەو زانیویانە لەم سەروبەندەدا شێخ مەحموود لە دەوڵەتی عێراق تووڕەو داخ لەدڵەو خۆسازدانیشە بۆ تۆڵەکردنەوەی قوربانیانی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی و ئەگەر لەم کاتەدا سەرۆك خێڵێکی کوردی وەك (حەمە ڕەشید خانی بانە)یش بە ناوی ئەوەی لە دەوڵەتی ئێران یاخی ببێ و بچێتە پاڵ دەوڵەتی عیراق، ئەوا شێخ مەحموود بە چاوی ناحەزو دوژمنی کورد سەیری ئەو سەرخێڵە دەکات و تۆڵەی ئەم هاوکاریکردنەی دەوڵەتی عێراقی لێدەکاتەوە. بۆیە دەوڵەتی ئێران بەزیرەکییەوە ئەم هەلە دەقۆزنەوەو لەم دەرفەتدا داوایان لە حاجی بابەشێخ کردووە، تا تکای دەستگیرکردنی (حەمە ڕەشیدخانی بانە) یان لە شێخ مەحموود بۆ بکات، کە لەم سەروو بەندەدا بە خۆی و لەشکرەکەیەوە لە ناوچەکانی شاربازێڕو پێنجوین دایەو ئەو هەردوو ناوچەیەیش سەرەڕێی هاتوچۆی دەربازبوونی (حەمە ڕەشید خانی بانە)یە، لە سنوورەکانی هەردوو دەوڵەتی عێراق و ئێرانەوە.

نامەکە جگە لەوەی بەڵگەیە بۆ پلەوپایەو دەسەڵات و ناوبانگی ئەم دوو کەسایەتییە گەورەیەی هەردوو کوردستانی عیراق و ئێران، لای گەورە بەرپرسانی دەوڵەتی ئێران، هاوکات بە ناوەڕۆکەکەیدا دەردەکەوێ، کە شێخ مەحموود هەر لەبنەڕەتەوە دەزانێ کە ئەم داوایە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بەرەو ڕووی (حاجی

بابەشێخ) کراوەتەوە، هەر لەبەر ئەمە دەزانێ کە وەڵامەکەیشی بەرچاوی کاربەدەستانی ئێران دەگاتەوە، بۆیە بە گیانێکی دیپلۆماسیانە، سەرەڕای ئەوەی گلەیی زۆر لە دەوڵەتی ئێران دەکات، لە هەمان کاتدا خۆی و (حاجی بابەشێخ)یشی لەو داوایە دەرباز کردووە:

"سەبارەت بە بابەتی نامەکەو محەممەد ڕەشیدخانی وێنەیی و سەرلەبەری بەگزادەی (بانە)یش، وردەکارییەکی واتان فەرمووە، کە بەگوێرەی بۆچوونی هێژاتان بێ، دەبێ ناوبراو لە عەمرو نۆی منی خزمەتگوزارتاندا هەڵسوکەوت بکات! هەر لەبەر ئەمەشە هۆی نەوازشی ئەوتان، لە من داوا فەرمووە! پەنا بەخوا لەم بوختانە گەورەیە، کە دەبێ لای ئەم دڵسۆزەی خۆتانەوە ڕاستیی ببیستن و بە دڵسۆزییەوە عەرزتان دەکەم، کە بەو هۆیەوە لە جەنابی هێژاتان دۆستتن، کەمتر گومان دەکەم، بۆیە دەبێ باوەڕ بفەرموون، کە هەرچییان عەرزکردوون، هەمووی دەست هەڵبەستی ناحەزان و ناپاکان بووەو هەرگیزو بۆ هیچ کارێکیش ڕووی لە ئێمە نەناوە، تا ببمە ڕاوێژکاری، یان بەرپرسیان، ئەگینا گومان دەبرێ، کە پێشتریش و دواتریش خزمەتی هەمەجۆرەم بە حکوومەتی مەزنی ئێران کردبێ و بە (با)ی بدەم! خۆشتان دەزانن کە هیچ پاداشتێکی کاری چاکەم لە حکوومەتی مەزن وەرنەگرتۆتەوە، لەکاتێکدا هەمیشەیش تەقەللای ئەوە دەدەم تا سەرەڕای ئەوەی ڕەزامەندیی دەوڵەتی مەزن بە دەست بهێنم، کەچی پاداشتەکەی هەر بە گەورەترکردنی ناحەزانی من و نزمترکردنەوەی دۆستانی من شکاوەتەوە. لەپاڵ ئەمانەشدا هێشتا تا گیان لە جەستەمدا بێ، لە چاکەی دەوڵەتی مەزن ......... سەرەڕای ئەوەی ئەو ئامۆزا بەڕێزەم دەیڵێت، کە هەرچی لەو بارەیەوە بفەرموێ، دەبێ بە گیان ئەنجامی بدەم و بە شانازییەوە جێبەجێی بکەم. بەڵام لەم بابەتەوە ئەم دۆستەتان پۆزش دەخوازێ، کە ئەگەر هاتوچۆی

خەڵكی، بە هۆیەك بزانن، ئەوا نەخێرو خانەدانی كاك ئەحمەد (خوا ڕووی موبارەك بكات)، لە هەموو جیهانی ئیسلامییەوە زیارەتی دەكرێ و ئەوەش پێچەوانەی ڕەوشت و ئایینە، ئەگەر ڕێگە لە خەڵكی بگرین، جگە لەوەی كە ناوبراو، ناوبەناوێك هەر بە مەبەستی زیارەت هاتووەو ئەمەش نەبۆتە مایەی پێوەندیی ئێمەو ئەوان و لە عەقلیشەوە دوورە، كە بەبێ سەردانی ڕاستەوخۆی ئەوان، خۆمان بە ئامۆژگاریكارو بەرپرسی ئەوان دابنێین. هیوادارم لەم ڕووەوە گلەیی نەفەرموون و بەندەی موخلیسیشتان بۆ هەمیشەو بۆ بەسەركردنەوەی كاروباری هێژاتان ئامادەم. تكاو خۆزگەشم ئەوەیە، بەڵكو بە سۆزەوە عەرزتان دەكەم، كە ئەو پلەو پایەو ڕێزەی لە سایەی خواوە ئێستا هەتانە، بیقۆزنەوەو كاروباری موسڵمانانی پێ ڕاپەرێنن و نەبنە سۆنگەی تەنگ پێهەڵچنینتان، كە من پێم وایە ڕەزامەندیی خوای مەزن، دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەو مانەوەی هەمیشە. ئیتر (لوقمان)یش پێویستی بە فێركردن نییە".

(٣)

لە سەرنجێكی گشتیی ناوەڕۆكی ئەم چەپكە نامەیەدا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی، لە سەروبەری ڕستەو كۆپلەو پەرەگرافی ئەم نامانەدا، گیان و باوەڕی شێخ مەحموودی حەفید، بە ئایینی ئیسلامگەرایی، ڕەنگ دەداتەوە، كە ئەم باوەڕە لە تەمەنی چارەكە سەدەی ئەم نامانەو لە قۆناغەكانی ئەوپەڕی دەسەڵاتی شێخ مەحمووددا، لە حوكمداری كوردستانەوە، بۆ ژیانی گۆشەگیریی، لە گوندێكی وەك (داریكەلی)دا، هەمان هەست لە یەكەمین ئەم چەپكە نامەیەدا، تا دوایەمین نامە، بە هەمان جریوە دەدرەوشێتەوە، كە ئەم باوەڕە چەسپیوە، دەشێ بكرێتە

دەلاقەیەك بۆ ئەوانەی فیکری ئەم سەرکردە کوردە بخوێننەوەو بزانن ئەم فاکتەرەی ئایینە، زەبرو کاردانەوەی چەند لەسەر چارەنووسی کوردو ناسنامەی بزووتنەوەکەی بووەو لەم بوارەشدا ئەم ڕستانە، لە دەقی چەند نامەیەکی شێخدا، وەك نموونە دەهێنینەوە:

"هەموو ئاوات و کۆششێکی من، لەپێناوی پاراستنی ئایین و ئەم کۆمەڵە کوردە ئیسلامەدایە، بە هیمەتی پێشینانی خۆمان، کە هەر بەمجۆرەیان کردووە، تەقەللای پارێزگاریکردنی موسڵمان لەژێر پەنجەی کافراندا دەدەین. خوای مەزن سەرتان بخات و بە پیشتیوانی خوا نائومێد نەبین. ئەوانەش کەوا ڕێبازی تەریقەت دەشێوێنن و لەگەڵ ئەم زنجیرەی بنەچە پاکەدا، دوژمنایەتی دروست دەکەن، پیرانی تەریقەت، بەگوێرەی حەق، حەقیان لێ دەسێنێ و بەسزای خۆیانیان دەگەیەنن و لە باوك و باپیریانەوە لە دین بێبەشیان دەکەن"[3]

یان:

"هەروەك چۆن ئێمە بۆ بووژاندنەوەی ئایین تێدەکۆشین، یان چۆن جەنابی هێژاتان لەم دنیا، کەوتوونەتە ناو دۆزەخەوە، بە پشتیوانی خوا لە دنیای دواییدا لە بەهەشتدا دەبێ، لە دوعای خێریش نابێ لە یادم بفەرموون".

بە پشتیوانی خوا هیواخوازم بە دوو رکاعەتی نوێژی سوننەت، لەسەر بەرماڵە موبارەکەکەتان، بە پلەی دەروێشی بگەم".[4]

یان:

"قوربان، بەهۆی ئەو خەونەوە، کە پێشتر دیبووم، کاتێ خۆی بە خزمەت حەزرەتی سەروەریی جیهان گەیشتم، ئیتر لای خۆمەوە هیچ گومانێکم لە سەییدایەتی و نەجابەتی هێژاتانەوە نەماوە"[5]

---

[3] نامەی ٧ی مارتی ١٢٤٠.
[4] نامەی ٣ی نیسانی ١٩٤٧.
[5] نامەی ١٣ی ئەیلولی ١٩٣٠.

(١)

بخدمت جناب شيخ عبدالقادر دام مجده

قوربان دەستت ماچ ئەكەم

كاغذت رسيد از مژده سلامتى آن محب خيلى مسرور شدم از خصوص رفع حرج هرچندى ممكن باشد سعى خواهم كرد اين كاغذرا براى معتمد خودم جناب يوزباشى ماجد افندى نويشته كه در حكومت سفر سعى و تسهيلاتى بكند پاكترا بلا تأجيل روانه فرمائيد. حال پاره براى خريدن املاك ندارم آن پاره كه (؟) املاك صرف مىكنم در راه جهاد اكبر و براى مجاهدين صرف ميكنم. زياده درحفظ خدا باشيد محبم.

٢٥ تشرين اول ٣٩

ملك كردستان

بۆ خزمەتی جەنابی شێخ عەبدولقادر[6]، خوا هەر سەروەریی بەردەوام بکات

نامەکەتان گەیشت لە مژدەی سەلامەتی‌ی ئەو خۆشەویستە، زۆر دڵشاد بووم. سەبارەت بە لابردنی خەرجییەکەش ئەوەندەی لەتوانامدابێ، دریغیم نەکردووە. ئەم نامەیەشم بۆ جێ‌متمانەی خۆم، جەنابی یووزباشی ماجد ئەفەندی[7] نووسیوە، کە لە فەرمانڕەوایەتی‌ی (سەقز)دایە، تا تەقەللا

[6] سەیید عەبدولقادری دۆزەخ دەرە کوڕی سەیید محەمەد کوڕی سەیید ئیسماعیلی دوورەمە. پەیوەندیی دۆستایەتیی لەگەڵ شێخدا هی ڕۆژانی شەڕی پرووسە لە یەکەم جەنگی جیهانیدا. دوای بەدیل گیرانی شێخیش، کە بنەماڵەو کەس‌وکارو لایەنگرانی ئاوارەی ئەو دیو بوون، سەیید عەبدولقادر بەدەنگیانەوە هات و هاوکاری و کۆمەکی کردن. دۆزەخدەرەیش، دێیەکی سەر بە شاری سەقزەو نزیک بە باکووری ڕۆژهەڵاتیەتی. شێخ لەبەر خۆشەویستی‌ی سەیید عەبدولقادرو بۆ وەفاداری نواندن ناوەکەیی گۆڕیوە بە جەننەتدەرە.

[7] مەبەست ماجد مستەفای ئەفسەرێکی لەشکری شێخ مەحموودە.

بــدات و ئاســانكاری لــەو ڕووەوە بكــات. نامەكــە بــەبێ ڕاگیركــردن ڕەوانــە بفــەرموون. ئێــستا بــۆ كــڕینی زەوی وزار، پــارەم نییــەو ئــەو پارەیــەی كــە بــۆ كـــڕینی زەوی وزاری ســـەرف دەكـــەم، لـــەپێناوی جیهـــادی گـــەورەو بـــۆ موجاهیدینی سەرف دەكەم. لەوە زیاتر، لە پەنای خوادا بن. خۆشەویستم.

٢٥ی تشرینی دووەمی ٣٩[8]

مەلیكی كوردستان

(٢)

خدمت رشادت و سعادتمآب جناب شیخ عبدالقادر دام لقاه

بعــد از عــرض ســلام واحترامــات رقیمــهء زیبــا مــرقم اینجانــب فرمــوده بودیــد واصــل دســت تعظیم گــردید از انــسانیت و الطــاف و مــژدهء عافیت آن جنــاب عــالی بــسیار مــسرور و ممنــون شــدم امیــداورم دائمــا در كمــال عافیـت وصـحت بـوده باشـید، غایـه و كوشـش مـن صـرف بـرای محافظـهء دیانـت و ایـن كتلـهء كـورد اسـلام اسـت مـا بـه همـت اجـداد خـود (بـدین گـونـه؟) بمحافظــهء مــسلمان از زیــر پنجــهء كفــار تــشبث كــردهام (امــل) اســت؟ خــدای لایــزال موفــقتــان فرماینــد و محــروم نــشویم انــشاءالله آنانكــه از خــط طریقــت تجــاوز وبــااین ســلالهء طــاهره عــداوت پــیش آورد پــیران طریقــه ( ؟) حــق و اورا بــه مجــازات خــود میرســاند وجدالجــد دردنیــاو قیامت از دین محروم میفرماید.

چـون مـا بـرای احیـای دیانـت سـعی میكنـیم دیگـر چـون جنـاب عـالی دردنیــا بــه دوزع (دوزخ) افتــادهایــد انــشاءالله در قیامــت جنــت مكانــت میباشد باید از دعای خیر غافلم نفرماید.

٧ مارت ٣٤٠ ملك كردستان

---

[8] ساڵەكە ڕۆمییەو دەكاتە ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣.

بۆ خزمەتی جوامێرو بنەچە بەختەوەر

جەنابی شێخ عەبدولقادر خوا بیپارێزێ

دوای پێشکەشکردنی ڕێزو سڵاو. نامە جوان و ڕازاوەکەی بۆ ئەم لایەنەتان فەرموبوو، بە دەستی سوپاسگوزاریم گەیشت، لە پیاوەتی و لوتف و مژدەی چاکبوونەی ئەو جەنابە، یەکجار دڵشاد بووم و قەدرزانیم کرد، هیوادارم هەمیشە لەوپەڕی لەش ساغی و سەلامەتیدا بن. هەموو ئاوات و کۆششێکی من، لەپێناوی پاراستنی ئایین و ئەم کۆمەڵە کوردە ئیسلامەدایەو ئێمەش بە هیممەتی پێشینانی خۆمان، کە هەر بەم جۆرەیان کردووە تەقەللای پارێزگارکردنی موسڵمانان، لەژێر پەنجەی کافرانسدا دەدەین. خوای مەزن سەرتان بخات و بە پشتیوانیی خوا نائومێد نەبین. ئەوانەش کەوا ڕێبازی تەریقەت دەشێوێنن و لەگەڵ ئەم زنجیرەی بنەچە پاکەدا دوژمنایەتی دروست دەکەن، پیرانی تەریقەت، بەگوێرەی حەق، حەقیان لێ دەسێنێ و بە سزای خۆیانیان دەگەیەنن و لە باوك و باپیرەوە لە دین بێبەشیان دەکەن.

هەروەك چۆن ئێمە بۆ بووژاندنەوەی ئایین تێدەکۆشین، یان چۆن جەنابی هێژاتان، لەم دنیا کەوتوونەتە ناو دۆزەخەوە[9]، بە پشتیوانیی خوا لە دنیای دواییدا، جێگاتان لە بەهەشتدا دەبێ. لە دوعای خێریش نابێ لەیادم بفەرموون.

٧ی مارتی ٣٤٠[10]

---

[9] مەبەستی لەلایەکەوە لەوەیە، کە لە گوندی (دۆزەخ دەرە)دا دەژی و شێوە گاڵتەکردنێکی برایانەیشی تێدایە، لەلایەکی تریشەوە ستایشی ئەو خواپەرستییەی دەکات، کە لە هەموو خۆشیی و بەختەوەریی ئەم دنیایە، دەستی داشتووەو ئازار لە خواپەرستییەکەیدا دەچێژێ.

[10] ڕۆمییەو دەکاتە ٧ی مارتی ١٩٢٤.

۳۰/۹/۱۳

خدمت حضرت مستطاب عموی زادهء محترم آقای حاجی بابا شیخ دام فضله العالی

پس از عرض سلام واحترام لایقه دستخط مبارك واصل و خواندن سطورش موجب ستر همه الم و رفع همه غم گردید قربان سبب به رؤیای که سابق دیده‌ام وجناب سید عبدالحکیم میداند بلکه بمراتب بیان نموده‌ام وقتی بخدمت حضرت فخر عالم ٤۳ رسیدم شك از سیادت و نجابت جنابعالی ندارم مع هذا هرگز از صداقت و دوستی آن جناب بلکه هرچه اظهار فرموده مطابق واقع دانسته ومیدانم و ازینطرف نیز مخلص‌را بدوست حقیقی و ارادتمند صمیمی محسوب فرمایند راجع به مسئله مرقومهء محمد رشید خان وینه و سایر بگزادهای بانه شرحی بیان فرموده مبنی بأینکه بزغم جنابعالی درتحت امر و نهی ارادتمند حرکات مینمایند و ازاین جهت اظهار فراح جویی و نوازش ایشان از من فرموده‌اند سبحانك هذا بهتان عظیم از مخلص خودتان راستی بشنوند و صداقتاً عرض مینمایم زیرا از جنابعالی دوستی کمتر گمان میبرم باور بفرمایند هرچه عرض کرده‌اند بستهء مغرضین و مفسدین است و هرگز برای هیچ کاری مراجعت به ما نکرده‌اند تا که مستشار ویا آمر ایشان شوم والا گمان مبرند که سابق و لاحق خدمتی متعدده به حکومت علیه ایران رسانید به باد دهم و باوجود خودتان میدانند هیچ جزای نیکی از حکومت علیه ندیده‌ام دائما درصدد رضامندی حکومت علیه هستم وجزایش ترقی مغرضان اینجانب وپستی دوستان من است بهرحال تا جانی در بدن دارم از خیرخواهی دولت علیه ........ باوجود اظهار ان عموی زادهء محترم که ما طالبم هرچه راجع به من .... در انجام آن بجان منّت دارم

لیکن از این قضیه مخلص معذرت مینمایم اگر آمدشد عامەرا سبب میدانند خیر خاندان حضرت کاك احمد قدس الله روحه عالم اسلامی قصد نمایند و خلاف دیانت کە مانع شویم غیر از این کە گاه گاهی محض زیارت امدەاند وسیلەء ارتباط ما وایشان نیست واز عقل دوراست بدون مراجعەء ایشان خودرا بە ناصح و آمر ایشان محسوب نمایم امیدوارم گلە نفرمایند مخلص دائما برای ارجاع امورات بە جنابعالی ما حاضرم. رجا و خواهشی دارم بلکە مشفقانە عرض مینمایم همین موقع احترام کە حالا الحمد لله بدست دارند فرصت غنیمت شمارند واز اصلاح کار مسلمین مضایقە نفرمایند بە خیال رضای خدای تعالی واسطەء ترقی پایندە و بی‌زوال خواهد بود دیگر لقمان را آموختن نشاید.

محب

(ئیمزای مەحموود)

بۆ خزمەتی حەزرەتی بنەچە چاك، ئامۆزای بەڕێزم جەنابی حاجی بابەشێخ، چاكەو پیاوەتیی هەر بەردەوام بێ

دوای پێشكەشكردنی عەرزی سڵاوو ڕێزی شایان، نامەی دەستنووسی موبارەكتان گەیشت و خوێندنەوەی دێڕەكانی بوونە مایەی باركردنی هەموو ئازارو باركردنی هەموو خەمێك.

قوربان. بەهۆی ئەو خەونەوە، كە پێشتر دیبووم و جەنابی سەیید عەبدولحەكیمیش دەیزانێ و تەنانەت چەند جارێكیش گێڕاومەتەوە، كاتێ بە خزمەتی حەزرەتی سەروەری جیهان گەیشتم، ئیتر لای خۆمەوە هیچ گومانێكم لە سەییدایەتی و نەجابەتی هێژاتان نەماوە" بۆیە هەرگیز لە ڕاستگۆیی و دۆستایەتی ئەو جەنابە گومانێكم نییەو هەرچییان فەرمووە، هەمووی ڕاست بووەو وەك خۆی دەرچووە. دەزانم

لـە بەرامبـەردا مـنی دڵسۆزیـشتان بـە دۆسـتی ڕاسـتەقینەو خزمـەتگوزاری بێچەندو چوونی خۆتانم لەهەژمار دەفەرموون.

ســەبارەت بــە بابــەتی نامەکــەو محەمــەد ڕەشــیدخانی وێنــەیی و ســەرلەبەری بــەگزادەی (بانــە)ش، وردەکارییــەکی واتــان فــەرمووە، کــە بــەگوێرەی بۆچــوونی هێــژاتان، نــاوبراو لــە عومرونــۆێ منــی خزمەتگوزارتانــدا هەڵــسوکەوت دەکــات ! هــەر لەبــەر ئەوەشــە هــۆی نەوازشــی ئــەوتان لــە مــن داوا فــەرمووە ! پــەنا بــە خــوا لــەم بوختانــە گەورەیــە، کــە دەبــێ لای ئــەم دڵسۆزەی خۆتانــەوە ڕاسـتیی ببیـستن و بـە دڵـسۆزییەوە عــەرزتان دەکــەم، کــە بــەو هۆیــەوە لــە جــەنابی هێــژاتان دۆســتتر، کــەمتر گومــان دەکــەم، بۆیــە دەبــێ بــاوەڕ بفــەرموون، کــە هەرچــییان عــەرز کــردوون، هــەمووی دەســت هەڵبەســتی ناحــەزان و ناپاکـان بـووەو هـەرگیزو بـۆ هـیچ کـارێکیش ڕووی لـە ئێمـە نـەناوە، تابیمـە ڕاوێـژکار، یـان بەرپرسـیان. ئـەگینا گومـان دەبـرێ کـە پێـشتریش و دواتـریش خزمـەتی هەمـەجۆرەم بـە حکوومـەتی مـەزنی ئێـران کردبـێ و بـە (بـا)ی بـدەم ! خۆشـتان دەزانـن کـە هـیچ پاداشـێکی کـاری چـاکەم لـە حکوومـەتی مـەزن وەرنەگرتۆتـەوە، لەکاتێکـدا هەمیـشەش تەقـەللای ئـەوە دەدەم تـا سـەرەڕای ئـەوەی ڕەزامەنـدیی دەوڵـەتی مـەزن بەدەسـت بهێـنم، کەچــی پاداشــتەکەی هــەر بەگــەورەترکردنی ناحــەزانی مــن و نزمترکردنـەوەی دۆسـتایەتیی مـن شـکاوەتەوە. لـەپاڵ ئەمانەشـدا هێـشتا تـا گیـان لەجەسـتەمدا بـێ، لـە چـاکەی دەوڵـەتی مـەزن .......... سـەرباری ئـەوەی ئـەو ئـامۆزا بـەڕێزەم دەیڵێـت، کـە دەبـێ هەرچـی لـەو بارەیـەوە بفــەرمویێ، دەبــێ بــە گیــان ئــەنجامی بــدەمو بەشــانازییەوە جێبــەجێی بکــەم. بــەڵام لــەم بابەتــەوە ئــەم دۆســتەتان پــۆزش دەخــوازێ، کەئەگــەر هاتوچـۆی گـشتیی خـەڵك، بەهۆیـەك بـزانن، ئـەوا نـەخێرو خانـەدانی کـاك ئەحمـەد (خـوا ڕۆحـی موبـارەك بکـات)، لـە هـەموو جیهـانی ئیـسلامییەوە زیـارەتی دەکـرێو ئـەوەش پێـچەوانەی ڕەوشـت و ئایینـە، ئەگـەر ڕێگـە لـە

خـەڵك بگـرین، جگـە لـەوەی كـە نـاوبراو، ناوبـەناوێك هـەر بـە مەبەسـتی زیـارەت هـاتووەو ئەمـەش نەبۆتـە مایـەی پێوەنـدیی ئێمـەو ئـەوان و لەعەقلیـشەوە دوورە، كـە بـەبێ سـەردانی ڕاسـتەوخۆی ئـەوان، خۆمـان بـە ئامۆژگاریكـارو بەرپرسـی ئـەوان دابنێـنین. هیـوادارم لـەم ڕووەوە گلـەیی نەفـەرموون و بەنـدەی موخلیسیـشتان بـۆ هەمیـشەو بـۆ بەسـەركردنەوەی كاروبـاری هێـژاتان ئامـادەم. تكـاو خۆزگەشـم ئەوەیـە، بـەڵكوو بەسـۆزەوە عـەرزتان دەكـەم، كـە ئـەو پلەوپایـەو ڕێـزەی لەسـایەی خـواوە ئێـستا هەتانـە، بیقۆزنـەوەو كاروبـاری موسـڵمانانی پێ‌ڕابپـەڕێنن و نەبنـە سـۆنگەی تـەنگ پێ‌هەڵـچنینیان، كـە مـن پـێم وایـە ڕەزامەنـدیی خـوای مـەزن، دەبێتـە هـۆی بەرزبوونـەوەو مانـەوەی هەمیـشە. ئیتر (لوقمـان)یـش پێویستی بە فێركردن نییە.

دڵسۆزتان

مەحموود

(٤)

بۆ مقامی بەرزو خەلیفەی پیری ڕۆشن ضمیر

جەنابی سەیید عەبدولقادر جەننەت دەرە (جەنەدەرە)

لـەدوای بـەیانی ئیخلاصـییەت كاغـەزی موبارەكتـانم وەرگـرت. خوێندمـەوەو بـووە سـەبەبی زیـادیی نـووری چـاوم ئـەحواڵت پرسـیبووین، واین لە داریكـەلی وە لـەطیـفـیش وا لـە بەغدا. بـە كـەرەمی خـواوە چـاوەڕێی هاتنـەوەین. طـەڵـەبی دوعـای خێـر ئەكـەین و ثـانییـەن بـە واسـیطەی دەروێش كەریمـەوە جووتـێ گـۆرەوی و جووتـێ دەستكێـشتان نـاردبوو، پـێم گەیـشت. چـاوی كوڕەكـان مـاچ ئەكـەم. ئیظهـاری تەئەسـوفتان فـەرمووبوو لـە بـەعـضـێ ڕێگەوە، بڵێم چی ئەبێت:

یارب سـتەدی ملك زدسـتی چومەنی

دادی بە محـنتی نی مـەردی نی زنی

اگر گردش روزگار بنده معلوم شـــــد

پيش تو چه دەفزنی، چە شمشسيرزنی

دووبـاره بـه فـەحوای (لاتقنـت– لاتقـنط) ... نابـێ مـەئيووس بـبن. ان الله معنا: باقی تەمەنناى مەسرووريیەتی دین و (دینو) دنیاو ئاخیرەتتان ئەکەم.

مەحموود 1941/12/21

* نامەکە لەبنەرەتـدا بـە ڕێنوسـی کـوردی ئـەو سـەردەمە نووسـرابوو. بۆ زیاتر تێگەیشتنی خوێنەران بەمجۆرەم نووسییەوە.

(5)

قوربان خاڵۆ سەيید عەبدولقادر دەستەکانت ماچ ئەکەم

کاغـەزت گەیـشت، خوێندمـەوە، لـە سـەلامەتیتان مەسـروورو بـە ئەحواڵپرسـی مـەمنوون بـووم. بـۆ جیهـەتی بەنـدەزادە: لـەتیف ئیظهـارتـان فـەرمووە ئـەوا حکومـەت وەعـدەی داوە بـەم نزدیکانـە (نزیکانـە) بیهێنێتـەوە، ئـەمما پـەنا بـەخوا. جووتـێ جـوارب (گـۆرەوی)ت هەدییـە فـەرمووبوو، گەیـشت، تەشـەککورو دوعـای خێرتـان ئەکـەم، چـاوی مەخـدوومان مـاچ ئەکـەم، خـوای عالـەمییان بەرقـەراریان بفـەرموێ. لەسـەر ئـەمری ئێـوە کاغـەزمان نووسـی بـۆ سـەلیم خـان. ئـەمڕۆ هەشـت ڕۆژە جـەلال[11] چـووە بەد(وای) لەتیفدا، بزانین خوا تەقدیری چۆنە. باقی ئیحتیرام

موخلیستان

مەحموود

1942/3/4

ئـەبێ دائیمـە بەچـاوی لوتفـەوە تەماشـای کـاك عەبـدوڵڵا بکـەن (بەکەن!) کوڕێ بەئەدەبە.

---

[11] جەلال، مەبەست لە شێخ جەلال (1907–1962/10/10)ی شێخ ئەحمەدی برای شێخ مەحموودو (دواتر زڕکوری شێخ مەحموود)ە.

(٦)

مـەقامی موحتـەرەم پـیری ( پیـری! ) ڕۆشـن ضـەمـیر جـەنابی ئەسـسەید عەبدولقادر

جەننەتدەرە

لـەدوا(ی) عـەرزی دەسـت ماچـکردن، پیاوەکانمـان گـل دایـەوە، تـا (لـەطیـف) دێتـە ئێـرەو جـەنابی کۆلۆنێـلْ (لایـن) تەشـریف بێـرن (بێـرن!)، ئەمرەکـەی (ئـەمری کـە) لێ وەرگـرین بـو سـەر حـاکمی سیاسـی (سـفە)، تـا ئیـستیرادی ئەملاکـەکان بکاتـەوە. ئـەمرتان فـەرموو تیـغبەنـد بـۆ مەخـدوومی مەخـدوومزادە (وە) بـرازات کاکەحەمـە، شـەش دانـەمان تەقـدیم یـەعنی هەدییـە کـرد. شـێخ عـەلی لـە خوشەویـستانی (ئـە!) ئێمەیـە، وامـان بەچـاك زانـی لـە خزمـەت ئێـوە (ایـوە) دابـێ، تـا جـواب ئەگێڕمەوە (اگیرمەوە). باقی ئیحتیرام !

مەحمود

١٩٤٢/٣/٢٩

(٧)

حضوری اقای محترم

الـسید عبـدالقادری یادگـاری حـضرت پـیری روشـن ضـمیر حـضرة کاك احمد

پـس از عـرض اخـلاص و آرزومنـدی (آرزومنـدی)، لطـف نامـەی (لطفنـامـەء) مبارکتـان (مبارەکتـان) رسـید زیـارت نمـودم اظهـار گلـە از تکاهـل نمودنـد مخلـص فرمـودە حاشـا در حـین مراسلەء (مراسلە) بـە اول یـا اولیـای اموری بریطـانیـای عظمـی مراجعـت شـد وعـدە گـرفتم کـە قـصور از نیکـی ننماینـد. قربـان بجـسب حقـوقی دولی و (وە) معاهـدەی بـین دولـتین اولیـای امـور بریطانیـا (بایـد !؟) دسـت تـصرف بـە امـوری

حکومــت علیـــەی ایـــران نمـی برنـــد امـــر بـــسفارت از طهـــران و (وە) او بحکومــت پارسـیان التمـاس میفرمایـنـد دولـتین عظمـی بـرای شخـصی یـا عمــر و زیـد معاهــدەی (!) دولی برایــشان (بریــشان) نمـی نمایـنـد ... دیگـر حــضرت خجـستەصفات (تــان !) مــسلکی شـیخی التمــاس بــرای فقــرا وە (!) تـــن دادن تکیـــە (تـــون داوەن) وە شـــکری حـــضرت بـــاری جلّـــە (وە !) علـی کـاری دیگـر ندارنـد بـیشـك اولیایـانی (اولیاهـای) امـور بنـا بخـاطری مـسلك هــیچ نــوع یــد معاملـەی بیفــراز نیکــی نمیفرمایـنـد. لطیــف و(وە) کاکە حسین و شیخ محمد بعرض دست بوسی مصدّعند !

و (وە) نــوری چـشمان شــیخ بهاالــدین (بهاءالـدین) و (وە) کاکــە حــسین و حــسام الــدین و (وە) محــی الــدین و (وە) علاالــدین (علاءالــدین) دیــدە بوسانم وبرادرزادە کذا دیگر هەمرا بحضرت مئان سپردم. باقی احترام

مخلصتان

محمود

لاحقــە: مخلـص خـدای حـضرت تـان شـیخ علـی بعـرض دسـت دامـن بوسی مصدع است (مصدعست !)

١٩٤٢/٥/٢٤

بـــۆ خزمـــەتی جـــەنابی بـــەڕێز عەبـــدولقادری یادگـــاری پـــیری دەروون ڕووناك حەزرەتی کاك ئەحمەد

دوای پێـــــشکەشکردنی ئـــــیخلاس و ئارەزوومەنـــــدی، لوتفنامـــــە موبارەکەکـــەتان گەیـــشت و زیـــارەتم کـــرد. گلـــەییتان لـــە تەمـــەڵی بەنـــدەی موخلیـــستان فـــەرمووبوو، نـــەخێرو حاشـــا، چـــونکە هـــەر لـــە ســـەروەختی نامەکـــەدا، پێوەنـــدی بـــە بـــەرپرس یـــان بەرپرســـانی کاروبـــاری دەوڵـــەتی مـــەزنی بریتانیـــاوە کـــراوەو بـــەڵێنم وەرگرتـــووە کـــە ئـــەوانیان هەرچـــی کـــارێکی باشـــیان لەدەســـت دێـــت، درێغـــی نەکـــەن. قوربـــان ! بـــەگوێرەی

یاسـای نێودەوڵـەتی و پەیماننامـەی نێـوان هـەردوو دەوڵـەت، بەرپرسـانی کاروبـاری بریتانیـا ........... دەسـت لـە کاروبـاری حکوومـەتی ئێـران وەرنـادەن و کارەکـەی باڵیۆزخانـە، یـا لەرێگـەی تارانـەوە، یـان داوا لـە حکومـەتی پارسـیان (ئێـران) دەفـەرموون و دەوڵـەتانی گـەورەش لەبـەر خـاتری کـاری شەخـسی، یـان فـلان و فیـسار پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی پێـك نـاهێنن. ئـیتر حـەزرەتی ڕەوشـت موبارەکانـەتان بـۆ ڕێبـازی شـێخایەتی و بـۆ ڕاپەڕانـدنی کـاری هـەژاران و پشت پێبەسـتن و سوپاسـی حـەزرەتی یـەزدان تـەرخان بفـەرموون و ئـەو شـتانەی تـر، کـاری خـەڵکانی تـرەو بێگومـان بەرپرسـانی کاروبارەکـانیش، لەبـەر خـاتری هـیچ جـۆرە ڕێبازێك، لە چاکە زیاتر، لە کاری کەس وەرنادەن.

لـەطیـفەو شـێخ حـسێن و شـێخ محەمـەد، عـەرزی دەسـت ماچـکردنیان بـۆ نـووری چـاوان شـێخ بـەهادین و کاکەحـسێن و حیـسامەدین و محێـدین و عـەلادین هەیـەو چـاویان مـاچ ئەکـەمو دیـسانیش بـۆ برازاکـانم بـە حەزرەتی خوای گەورە دەسپێرم. باقی ئیحتیرام.

موخلیستان

مەحموود

٩٤٢/٥/٢٤

پاشـکۆ: مـوخلیس و فیـدای حـەزرەتتان: شـێخ عـەلی، عـەرزی دەسـت ماچکردنتانی هەیە.

* سـەرلەبەری دەقـی نامەکـە، بـە زمـانێکی فارسـی زۆر شـپرزەو بێسـەروبەرو بـێ هـیچ بناغەیـەکی یاسـاو ڕێـسای ڕێزمـان نووسـراوەو لـە زۆر شـوێندا، خـۆم بـەزۆرو بـە بۆچـوونی خـۆم ڕستەسـازیم بـۆ ڕێـك خستووە.

(٨)

بۆ یادگاری حەضرەتی پیری ڕۆشن ضەمیر سید عبدالقادر دام عمره

لەدوا(ی) عەرضی ئیحتیرامی لائیقە، کاغەذی پڕ دوعاو بەرەکەتان گەیشت. لە هیممەتو لوطفتان طەڵەب ئەکەین دائیما بۆ هەموومان لە دوعا (دوعای؟) غافڵمان مەکەن وەکوو نەتان کردووین. حامیلی کاغەذ(ن) سەیید ئەحمەد بەیانی ناساغی کرد، خوا لە ئێمە (ایمە)ت نەستێنێ. هەدییەی دەروێشانەتان کە زیاترە لە کەرەمی پادشایەك گەیشت. بۆ جیهەتی موڵکەکان تەشەبوث بێشك ئەکەم بە قونسوڵی سلێمانی.

عەرضی سەلامم لە جەنابی خاڵۆ شێخ ئەمین تەقدیم ئەکەم. چاوی کوڕەکانی ماچ ئەکەم. دوعای خێریان بۆ ئەکەم و لەطیفو باباعەلی دەستتان ماچ ئەکەن. والسلام.

حەفید زادە

مەحموود

٩٤٤/٤/١٩

(٩)

مقامی منیع خیلفی پیروشن ضمیر خالوی شیخ عبدالقادر افندی جنت دره انشاءالله في جنات عالیه

پس از اهدای اخلاصیت و محبت خویشاوندی (خوی شاوندی !) وارثیت التفات نامەرا بدو دست اعتزاز گرفتە و بدیدەی اشتیاق خواندە همە وقت دعا (لـ ؟) دوام بقاتان از حق تعالا (تعالی) تمنا (تمنی) دارم امیدوارم هیچ وقت در حین حضور داعی را فراموش نفرمایند و بحضوری قلبی (ارتد) چشمی (چشم) مخدومان میبوسم از رب منان در طلبم بردوام بطول عمر (بحشم !؟) رالی مرتبی درویشی (درویشی!) وسرافراز گردید.

انشاءالله امیدوارم بخدا بدو رکعت ادای سنت بر سری سجّادەی مبارکتان بمرتبی درویشی (درویشی) برسم. بە کوردی عەرضت ئەکەم گۆرەوەیەکانت لە پێئەکەم، لە دەست نەچم بەخوا.

عەرضی اخلاصیّت و محبت در خدمت بهاالدین (بهاءالدین) پربها دارم.

کاکە بهاالدین ئاگادار (ئاگاهداری) عالی ! با کاك عەبدوڵلاّ رجادارم

محمود

١٩٤٧/٤/٣

# وەفدی شێخ مەحموود بۆ کۆنفرانسی ئاشتی
## ٢٠ ی ئازار- سەرەتای ئۆکتۆبەری ١٩١٩
## بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا

❖ د.نەجاتی عەبدوڵلا

پاریس- ٢٠٠٦

ڕەنگە باسێکی وەك وەفدی شێخ مەحموود بۆ کۆنفرانسی ئاشتی ساڵی ١٩١٩ لە هەموو لایەنەکانی دیکەی مێژووی بزووتنەوەی شێخ مەحموود کەمتر لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بۆ کرابێ و تەنانەت بیرەوەری نووسەکانی شێخ مەحموودیش لە باشترین حاڵەتدا لە چەند دێرێك زیاتریان لەمبارەیەوە نەنووسیووە کە وادەبێ زانیارییەکانی ئەم چەند دێرەش لەگەڵ یەك ناکۆك بن. ڕەفیق حیلمی، لە (یادداشت)ەکەی خۆیدا لەمبارەیەوە دەنووسێ: " *من خۆم نووسەری (مەزبەتە) و (نامە) تایبەتییەکە بوم کە نێررا بۆ "شەریف پاشا". ئەمانە بە ( ڕەشید کابان) و (سەید ئەحمەد) ی بەرزەنجی دا ڕەوانەی (پاریس) کرا*" و بە قسەی ناوبراو مەزبەتەکە "*لە ماڵی حوکمدار نووسراوە*".[1] لای شێخ لەتیفی حەفید مەزبەتەکە و نامەکان مێژووی ٢٠ ی ئاداری ١٩١٩ یان بەسەرەوەیە[2]. ئەحمەد خواجە تەنها بە دوو دێرێك دەنووسێ " نێرراوەکان سید ئەحمەد و ڕەشید زەکی بە پاسپۆرت و خواهشی پیاوە باوەڕپێکراوەکانی بریتانیا گەیشتنە (حەلەب) لەوێ لە لایەن فرەنسزەکانەوە مەزبەتەکەیان لێسێنرا و پاشەو پاش گێڕایانەوە بۆ کوردستان"[3]. ئەمە هەموو ئەو زانیاریانەیە کە لەبارەی وەفدی شێخ مەحموودەوە زانراو بێ.

---

[1] ڕەفیق حلمی، *یادداشت: کوردستانی عراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود*، بەشی یەکەم، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٨٨، لا: ٦٥-٦٦

[2] *یادداشتەکانی شێخ (لەتیف) ی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی حەفید*، کەمال نووری مەعروف ساغی کردۆتەوە، چاپی یەکەم، ١٩٩٥، لا: ٤٠-٤٩ . ئەمە لەگەڵ ئەو زانیاریانە ناکۆکە کە ڕەفیق حیلمی دوایەتی چونکو ئەمەی دوایی لە ڕۆژی ٢٠ ی شوباتی ١٩١٩ چۆتە کۆیە تا حوزەیرانی هەمان ساڵ هەر لە کۆیە ماوەتەوە ( یادداشت، هەمان سەرچاوە، لا: ٨٧- ١٦١). ڕەشید زەکی وەك دواتر دەبینین لە مەزبەتەکەیدا دەڵێ (٢٠ ئادار ئێمە سلێمانی-مان جێهێشتبوو) ئیدی نازانم چۆن ئەم نامانە لای شێخ لەتیف ڕۆژی ٢٠ ی ئاداریان بەسەرەوەیە!

[3] ئەحمەد خواجە، *چیم دی*، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٦٨، ٢٢

ئـەم باســەی ئێمــە پــشت ئەســتوور بــە بەڵگەنامــە فرەنــسییەکانی کۆنسلخانەکانی فرانسا لە حەلەب و بەیروت ئامادە کراوە کە ئێستە تەواوی ئەم بەڵگەنامانە لە ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا پارێزراون و ئەوە بۆ یەکەمجارە کە لێرەدا بڵاودەبنەوە .

# I

جۆرج پیکۆ، کۆمیسێری بەرزی حکومەتی فرانسا لە بەیرووت لە نامەی ژمارە ٣٠٥ ی ڕۆژی ٢٣ ی تەمووزی ١٩١٩ کە لە بەیرووتەوە بۆ ستیفێن پیشۆنی وەزیری دەرەوەی فرانسای نووسیووە دەنووسێ:

*" دوو وەفدی کوردستان، سەید ئەحمەد ئەفەندی، ئەندامی بنەماڵەی شێخ مەحموودی کاندیدی حکومەتی کوردستان و ڕەشید زەکی وەفدی سلێمانیی کوردستانی جنووبی بەمزوانە دوای گەشتێکی درێژ لە ڕێگەی بەغدا-حەلەب گەیشتنە بەیرووت و داوایان لێکردم بۆ سەفەری فرانسا ئاسانکاریان بۆ بکەم. فەرمانی توند لە سەرکردەی گشتی لەبارەی ئەم دوو کەسەوە هاتووە کە هەموو ئیمکانیەتێکیان لەمبارەیەوە بوەستێنرێ و ئەوە پیشانبدرێ کە هاوپەیمانەکانمان پابەندی ئەوەن کە دەنگی خەڵکی کوردستان نەگاتە ئەورووپا. ئەم دوو وەفدە نامەیەکیان ئاراستە کردم کە هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەدا وەرگێڕاوەکەی بۆ بەڕێزتان دەنێرم کە بریتین لە داخوازینامەی گشتی و ئارەزوویانە بیخەنە بەردەمی حکومەتی کۆماری (فرانسا). وێنەیەکی دەقا ودەقی ئەم بەڵگەنامانە دراونەتە وەفدی ئەمریکی کە هاتبوونە بەیرووت و گوێ بیستی ڕەشید زەکی بوون "*[٤].

---

[٤] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا، ڕۆژهەڵات ١٩١٨-١٩١٩ ( کوردستان-قەفقاز)، بەرگی ١١، نامەی جۆرج پیکۆ بۆ وەزیری دەرەوەی فرانسا- ( داخوازینامەکانی خەڵکی کوردستان)، نامەی ژمارە ٣٠٥ ی ڕۆژی ٢٣ ی تەمموزی ١٩١٩

ڕەشید زەکی لە مەزبەتەکەیدا کە بە تورکی عوسمانلی نووسییەوەو بە ناوی وەفدی سلێمانیی حکومەتی جنووبی لە ڕۆژی ٦ ی تەمووزی ١٩١٩ لە بەیروت لە هۆتێلی ئەمریکا نووسیوویە و ئاراستەی بەڕێز کۆمیسێری پایە بەرزی حکومەتی فرانسی کردووە لە بەیرووت، لەم نامەیەدا بە دوور و درێژی باسی سەفەری وەفدەکە دەگێڕێتەوە هەر لە دەرچوونیانەوە لە سلێمانی تا ڕۆژی نووسینی مەزبەتەکە. لە سەرەتای نامەکەیدا دەنووسێ: " من وەفدی کوردستانی خوارووم، ئەمانەی خوارەوە ڕادەگەیەنم: حکومەتی کورد کە لە سلێمانی پێکهاتووە ئەم (ناوچانە) دەگرێتەوە: لە ماردین تا سنە بەرەو باکور بە ( سنە) شەوە، لە ورمێ وە تا باش قەڵا. لەکاتی ڕووخانی کەرکووك، پێش ئاگربەس هەموو دانیشتوانی کەرکووك بە تێکرایی شێخ مەحموود- ئەندامی بنەماڵەی پیرۆزی شێخەکانی بەرزەنجییان بە پاشای خۆیان هەڵبژارد "[٥].

بە گوێرەی مەزبەتەکەی ڕەشید زەکی، وەفدی شێخ مەحموود ڕۆژی ٢٠ ی ئاداری ١٩١٩ لە سلێمانی بەدەرکەوتوون و ٦ ڕۆژ دواتر گەیشتونەتە بەغدا. واتە دەبێ ڕۆژی ٢٥ یان ٢٦ ی ئادار گەیشتبنە بەغدا. ڕۆژی ٢٧ ی ئادار، لە بەغدا بە فەرمانی کۆمیسێری بالای ئینگلیز بە نووسراوی ژمارە ٥/ ١٢٣ کە لەلایەن ئۆفیسی کۆمیسێری سیڤیل دەرچووە ڕێگەی سەفەرکردنیان پێدەدەن و بەو پێیەی کەوا " ڕێگەی بۆمبای زۆر پر ئاستەم و درێژببووە، بە ڕێککەوتن لە گەڵ بەڕیوەبەری حاکمی عێراق ها ول ڕێکدەکەون تا لە ڕێگەی زەمینی بەغدا-حەلەب سەفەر بکەن". ئەمە دەقی ئەم نوسراوە ڕەسمییە کە بە ئینگلیزی لە بەغدا و بە ئیمزای ویلسن نووسراوە و ڕوخسەتی سەفەرکردنیان پێدراوە:

---

[٥] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا، ڕۆژهەڵات ١٩١٨-١٩١٩ ( کوردستان-قەفقاز)، بەرگی ، ١١مەزبەتەی ڕەشید زەکی بابان بۆ کۆمیسێری بەرزی حکومەتی فرانسا لە بەیرووت، ڕۆژی ٦ ی تەمموزی ١٩١٩.

**ژماره ۲** **(کۆپی)**

**۱۲۳/٥**

**ئۆفیسی کۆمیسێری سیڤیل**

**بەغدا**

**۲۷ ی ئاداری ۱۹۱۹**

*هەڵگری ئەم نامەیە سەید ئەحمەد، لە خزمانی شێخ مەحموودی دەسەڵاتداری کوردستانی جنووبییە کە ئێستە سەرکردەی ئێستەی ئەم بەشەی نەتەوەی کوردە. سەید ئەحمەد بە ڕەزامەندی کۆمیسێری سیڤیل لە میزۆپۆتامیا لە ڕێگەی مووسڵ، نەسیبین و حەلەب بۆ سەروکاری کاروباری ئێستەی نەتەوەی کورد دەچێتە پاریس بۆ بەردەم کۆنفرەنسی ئاشتی.*

*بڕی پارەی ٥٥٠ لیرەی تورکی لە لایەن شێخ مەحموود بە ناوی مەسرووفاتی سەید ئەحمەد بۆ خەرجیی سەفەرەکەی دانراوە. داواکراوە کە سەید ئەحمەد ئاسانکاری بۆ بکرێ بۆ ڕاکێشانی ئەو برە پارەیەی کە پێویستی دەبێ. هەموو ئەوە برە پارەیەی کە ڕادەکێشرێ دەبێ لە پشت ئەم نامەیە بنووسرێت و تەلگرافی تایبەتی بۆ ئەم نووسینگەیە بنێردرێت. ڕەشید ئەفەندی هاوەڵی سەید ئەحمەد دەکات و پێشبینی دەکرێ کە وەرگێڕێکیش لە حەلەب بەگەڵ گروپەکە بکەوێ[٦].*

*سەرهەنگی دووەم*

*ئۆفیسی کۆمیسێری سیڤیل*

*ڕەشید زەکی لە مەزبەتەکەیدا بە دوور ودرێژی باسی گەشتەکەی خۆیان بۆ حەلەب دەگێڕێتەوە و دەنووسێ:*

---

[٦] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا، ڕۆژهەلات ۱۹۱۸-۱۹۱۹ ( کوردستان- قەفقاز)، بەرگی ۱۱، نامەی سەرکاری کۆمیسێریای فرانسا لە سووریا و ئەرمینیا بۆ وەزیری دەرەوەی فرانسا، بەیرووت، ۲٥ ی ئابی ۱۹۱۹، پاشکۆی ژماره ۲.

"، لە ماوەی ١٠ ڕۆژدا گەیشتینە حەلەب. ئەو پاسەپۆرتەی کە لە بەغدا بۆمان ئامادەکرابوو هەر تا حەلەب دیاریکرابوو و بۆ بەردەوامی ڕێگە دەبوایە پەنا بۆ ماژۆر براێن ببەین، کە ئەویش یەکەمجار بەغدای ئاگادارکردەوەو بۆ وەڵام وەگیرخستن چەند ڕۆژێك چاوەڕێمان کرد، وەك دواتر ماژۆر خۆی پێی ڕاگەیاندین کە وەڵامی بەغدا ئەوەیە کە ئەوان ڕازین بەڵام دەبێ پرسەکە بخرێتە بەردەم سەرکردایەتی گشتی لە میسر و دیمەشق، چەند ڕۆژێك دواتر ئاگاداریان کردینەوە کە وەڵامی سەفەرەکەمان هاتۆتەوە، ژێنرال ئەللینبی هات ئاگاداریکردینەوە کە وەفدی کوردی بۆ نوێنەرایەتیکردنی نەتەوەی کورد لە لایەن لەندەنەوە ڕێگەی پێدراوە و ئەوان ڕۆیشتوون و چیتر پێویست بە چوونی کەسانی دیکە ناکات."[٧].

ڕەشید زەکی، دوای ئەوەی ٤٠ ڕۆژ لە حەلەب[٨] چاوەڕوانی دەکات بۆ ئەوەی ئەنجامێکی دەستگیربکەوێ دەچێتە بەیروت بەڵام" هەر ئەو دەمەی لە بەیروت بە بوونی منیان زانی، ناچاریان کردم بگەڕێمەوە حەلەب و بە تەلگراف هەموو لایەکیان لە من ئاگادارکردەوە. کۆمیسێری سیاسیی نیشتەجێی بەیرووت، بەڕێز مارگار بایەخی بە ڕەوشی من دەدا و وادەی پێدام ئاسانکاری سەفەرم بۆ بکات، بەڵام هێندەی نەبرد ئەو تێلگرامەی کە بۆ ژێنرال ئەللینبی هاتبوو بۆی دووپاتکردمەوە، کە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە ناردنی ڕەشید زەکی و سەید ئەحمەد شتێکی زیادە. دواتر بەو بیانووەی کە ئاو و هەوای بەیرووت شێدارە فەرمانی بۆ دەرکردم بچمەوە حەلەب. لەو لای دیکەوە هاوخەباتکارەکەم سەید ئەحمەد کە لە دیمەشق بوو فەرمانی بۆ هاتووە ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوە حەلەب و ئەوە چەند ڕۆژێکە هیچ دەنگ و باسێکی نازانم. لەسەر داوای خۆم و بۆ درێژکردنەوەی ماوەی مانەوەم لێرەدا

---

[٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٨] مەزبەتەکەی ڕەشید زەکی ڕۆژی ٦ ی تەمووزی ١٩١٩ لە بەیرووت نووسراوە، بۆیە ئەگەر ٤٠ ڕۆژ لە ٦ ی تەمموز دەربکەین، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەبێ بڵێین وەفدی شێخ مەحموود دەورووبەری ٢٣ ی ئایاری ١٩١٩ گەیشتوونەتە حەلەب.

*بۆ کاری تەواو تایبەتیی خۆم ڕوخسەتی یەك هەفتەیان بۆ درێژکردمەوە لەگەڵ فەرمانی ئەوەی کە ڕۆژی ٨ ی تەمووز دەبێ بڕۆم".*

وەفدی شێخ مەحموود لە سەروبەندی گەیشتن دەبن بۆ حەلەب کاتێك شێخ مەحموود ڕۆژی ٢٣ ی ئایاری ١٩١٩ لە دژی ئینگلیز رادەپەڕێ و ئەمە واتای ئەوەبوو هەموو پێوەندییەکی سیاسیی و عەسکەری نێوان شێخ مەحموود و ئینگلیز دەپچڕێ‌و لە هەمان کاتیشدا واتای کۆتایی هاتنی ئەرکەکانی وەفدی شێخ مەحموودیشی دەگەیاندو دواتریش کاتێك سوپای ئینگلیز ڕۆژی ١٨ ی حوزەیران، بە قسەی کۆنسلی فرانسی لە بەغدا، شارل ڕۆ گوتەنی بە بێ ئاستەنگ دەربەندی بازیانیان گرتەوەو شێخ مەحموود بە دیل گیرا ئیدی لە واقیعدا شتێك بە ناوی وەفدی شێخ مەحموود نەمایەوە و ئینگلیز کەوتە کات کوشتن و دژایەتیکردنی وەفدی شێخ مەحموود. ڕەشید زەکی لە مەزبەتەکەی خۆیدا بۆ کۆمیسێری پایەبەرزی کۆماری فرانسا باسی بێهیوایی خۆیی و مامەڵەی خراپی هاوپەیمانەکان دەکات و بە گوێرەی مەزبەتەکە بێت وەفدی کوردی نیمچە دەستبەسەر بوونە و لە مەزبەتەکەیدا داوای ئازاد بوونی خۆشی دەکات:

" ئامانج لەم عەریزەیە ئەوەیە کە بەڕێزتان لە کاروبارەکان و بێهیوایی خۆم ئاگاداربکەمەوە، کە بێهیوایی نەتەوەیەکە کە بەمشێوەیە مامەڵە لەگەڵ وەفدەکانی کراو ئاستەنگ و کۆسپیان هێنرایە پێش بەو ئامانجەی ڕێگەی سەفەری پاریسم لێبگرن، ئەوان دەزانن کە هەرکات گەیشتمە پاریس هەموو شتەکان دەخەمە ڕوو، ئەوەی کە ئینگلیزەکان نایانەوێ. هەربۆیە من سەرنجی کۆمیسێری بەرزی فرانسا بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە کۆنفرەنسی ئاشتی لەو وردەکاریانە ئاگاداربکاتەوە تا بتوانن بەگوێرەی تێرمەکانی ئاخاوتنی سەرۆك ویلسن کە هەموو دونیا پشتیوانی لێکرد، فەرمانی ئازادبوونم دەربکەن. دەبێ ئەوە لەبەرچاوبگیرێ کە کورد نەتەوەیەکی ئەو هێندە گەورەیە کە بەشێکی لە ئێران و بەشێکی دیکەشی لە تورکیایە و لە چەند

مليۆنێك پێكهاتووه. نەتەوەیەكی كۆن و خاوەن مێژوویێكی خۆراگر، ڕاست و ڕەوان، بەوەفایە و شایانی ئەوەیە بەتەك ئەندامە فرانسییەكانەوە شوێنێكی لە كۆنفرەنسی ئاشتی هەبێ. لەوەتای چوار مانگە وەك سەرگەردانێك لێرە و لەوێ ئەسووڕێمەوە، ئەتوانم گەواهی ئەوەتان بۆ بدەم كە كوردەكانی جنووبی، ئەو چاكەیە لەبیرناكەن كە لەگەڵیان كراوە، لەبەرانبەر بەرژەوەندییەكانی دۆستەكانیان خۆیان ئەكەنە قوربانی و خۆیان سەربەرز ئەبین چاكە بكەن، زیاد لەوەش زۆر ئەستیارن لەبەرامبەر ئاستەمیەكاندا و وزە و بەرگری نیشان ئەدەن. كوردستان زەوی و زارەكەی ئێجگار بەر بڵاو و نەكێڵراوە و چەندین (كان)ی لێیە، هەموو چەشنە میوە و ئاژەڵێك، هەڵبەت نابێ ئەوەش لە بیربكەین كە خەڵكەكەی زۆر لە نەتەوەكانی دیكە زیاتر پێویستیان بە یارمەتی هەیە. من منەتبارتان ئەبم بە ناوی مرۆڤایەتییەوە ئەم داخوازینامانەی خوارەوە كە خواستی هەموو كوردەكانن بگەیەننە بەردەست حكومەتی فرانسا.

١- سەربەخۆییەكی تەواو، بەبێ قەید و شەرت بدرێتە حكومەتی كوردستانی جنووبی لە ژێر حاكمیەتی شێخ مەحموود كە نشینگەكەی لە سلێمانی دەبێ،

٢- فەرمانی سەفەر كردنم بە ئەمان بۆ فرانسا دەربكرێ،

٣- هەموو جۆرە چەوساندنەوەیەك كە لە دەرەوە دێن دژ بە كوردەكانی دانیشتوانی جنووبی ڕابگیرێ.

٤- من هانا وەبەر بەخشندەیی میهرەبانانەی حكومەتی فرانسا دەبەم بەو جۆرەی كە بە پێویستی دەزانێ بێت بە هانای كۆمەگی دانیشتوانانی سلێمانی كە بە قۆناغێكی زۆر سەخت دا تێپەڕدەبن.

٥- من ڕاگەیاندنی زۆر گرینگتر و زۆر ڕاشكاوانە ترم پێیە ئەگەر ئێوە حەزبكەن چاوپێكەوتنێكم لەگەڵدا ڕێكبخەن.

٦- ڕێگەدان بە ئەمان وئازادی بۆ كەسیی خۆم بۆ ئەوەی بتوانم پێوەندی بكرم.

٧- وێنەیەكی ئەم نامەیە دراوە بە كۆمسیۆنی ئەمریكی.

*٨- ئەوە لەیاد مەکەن کە مەلیکی کوردستانی جنووبی و بندەستەکانی هاوسۆزیی ڕاستەقینەتان بۆ ڕەوانە دەکەن و داوای پشتگیریتان لێدەکەن.*

*٩- منیش لە لایەن خۆمەوە ڕێزی تایبەتی خۆمتان پێشکەش دەکەم و لێتان دەپاڕێمەوە داخوازییەکانم بگەیەننە شوێنی مەبەست"*[٩].

*ڕەشید زەکی*

*وەفدی سلێمانیی کوردستانی جنووبی*

# II

بە گوێرەی ئەو دەکۆمێنت و فایلانەی کە ئێستە لە ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا لە پاریس پارێزراون دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە زۆر نامەو نامەکاری تایبەت بە وەفدی شێخ مەحموود دیار نین و ئەمە لە زۆر جێگەدا لەناو گومانمان دەهێڵێتەوە، بە نموونە سەرکاری کۆمیسێریای بەرزی فرانسا لە سوریاو ئەرمینیا لە بەیرووتەوە لە نامەی ڕۆژی ٢٥ ی ئابی ١٩١٩ بۆ وەزیری دەرەوەی فرانسای نووسیووە " شەرەفی ئەوم هەیە هاوپێچ لەگەڵ ئەم نووسراوە، سێ نامە بۆ جەنابتان ڕەوانە بکەم کە یەك لە دوای یەك بۆ سەرۆکی کۆنفرەنسی ئاشتی، سەرۆکی کۆمەڵەی گەلان و دواجار بۆ شەریف پاشا، وەك بالیۆزی تورکیا لە ستۆکهۆلم و نوێنەری داخوازییەکانی کوردەکان لە پاریس نێردراون"[١٠]. بە داخەوە ئەم نامانە کە هەموویان لە بارەی کوردستانی جنووبین و زۆر پێدەچێ ئەمانە هەمان ئەو نامەو

---

[٩] بۆ دەقی تەواوی وەرگێردراوی کوردیی مەزبەتەکە و کۆپی ئۆریژینالی عوسمانلی و وەرگێراوی فرەنسەوی مەزبەتەکە بڕوانە: نەجاتی عەبدوڵڵا، *شێخ مەحمودی حەفید زادە لە بەڵگەنامەی فرانسی دا ١٩١٩-١٩٢٤*، یەکەم بەرگ، سلێمانی ٢٠٠٦.

[١٠] بڕوانە ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا، (*لە بارەی کوردستانی جنووبییەوە*)، نامەی سەرکاری کۆمیسێریای فرانسا لە سووریا و ئەرمێنیا بۆ وەزیری دەرەوەی فرانسا، بەیرووت، ٢٥ ی ئابی ١٩١٩.

مەزبەتەیە بن کە ڕەفیق حیلمی لە "یادداشت" ەکەی خۆیدا باسیان دەکات کەچی هەموویان (لە کاتی ئێستەدا) ونن و لە ناو ئەرشیڤدا نەماون و یان لانی کەم لە ئەمڕۆدا لەبەر دەستدا نین.

وا دیارە شەڕی شێخ مەحموود لەگەڵ ئینگلیزو دواتر دوای بەدیلگرتنی شێخ مەحموود، وەفدی کوردی هیچ دەرەتانێکیان بۆ نەماوەتەوە جگە لەوەی لە دەرگەی ئەفسەرو کاربەدەستانی حکومەتی فرانسی بدەن بەڵکو لەم ڕێگەیەوە بتوانن ڕاستەوخۆ دەروویەك بۆ سەفەری فرانسا بکەنەوە.

*ڕۆژی ١٨ ی ئابی ١٩١٩ سەید ئەحمەد، نوێنەری شێخ مەحموود لە دیمەشق، مەزبەتەیەك دەداتە کۆلۆنێل کوس، ئەفسەری پێوەندی* حکومەتی فرانسا لە دیمەشق *و لەوێدا خۆی وەك* "وەفدی حکومەتی کوردستانی جنووبی دەناسێنێ کە لە لایەن حوکەمەتەکەیەوە بۆ نوێنەرایەتی کورد بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی *ناردرابێ*"[11] *کە بەداخەوە ئەم مەزبەتەیە تەنها نوسخیەکی زۆر کاڵی وەرگێڕاوە فرەنسییەکەی ماوەو گرینگە لێرەدا کەمێك ناوەڕۆکی ئەم مەزبەتەیە ڕوونبکەینەوە.*

*ئەوەی لە هەمووی زیاتر زۆر زەق لەو مەزبەتەی سەید ئەحمەد هەستی پێدەکرێ ئەو خیتابییە کوردستانییە کە وەك نوێنەری وڵاتێکی سەربەخۆو گەلێکی ئازاد قسە دەکات و هیچ ئینتیمایەکی بۆ عێراقی عەرەبی نییە*" کوردستانی جنووبی کەوتۆتە نێوان عێراق و ئێران لەوەتای ٦٢ ساڵ دەبێ سەربەخۆیی خۆی لە دەستداوە ئەوە بەمزوانە دەبێتە نۆ مانگ بەگوێرەی هەلومەرجی گرێدراوی نێوان ئەم وڵاتەو حکومەتی ئینگلیز کە ئێستە بە ناوی هێزی هاوپەیمانەکانەوە عێراقی داگیرکردووە، سەربەخۆیی خۆی وەچنگ خستۆتەوە"

*سەید ئەحمەد زۆر جەسوورانە قامك دەخاتە سەر ڕاستییەکان و هۆیەکانی ڕاپەرینی چکداری کورد دژ بە ئینگلیز ڕووندەکاتەوە:*

---

[11] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا، مەزبەتەی سەید ئەحمەد بۆ کۆلۆنێك کووس، ئەفسەری حکومەتی فرانسا لە دیمەشق، ڕۆژی ١٨ ی ئابی ١٩١٩.

" ئەركێك كە خرابووە سەرشانم، دەبووایە بڕۆیشتمایە پاریس، كەچی بە بیانووی ئەوەی گوایە ئەفسەرانی پێوەندیی ئینگلیز چاوەڕوانی زانیارین لە بارەی پرسی منەوە، لە دیمەشق گلدرامەوە. لە كاتی چاوەڕوانیدا بیستم فەوجی ئینگلیز بەمەبەستی شەڕكردن لەگەڵ بۆلشەویكەكانی ڕووس و ئیتحادییەكانی تورك لە ناو ولاتەكەم، هەڵیانكوتاوەتە سەر هاوخەباتكارەكانم و زۆر دڵڕەقانە كەوتوونەتە خوێن ڕشتنی خەڵكی بێگوناه، لەكاتێكدا ئەمە زۆر ڕوون و لەبەرچاوە كە داب و نەریت و ترادسیۆنی كورد لەگەڵ پرەنسیپی بۆلشەویكەكان ناگونجێ. من ئەوەتان بۆ دووپات دەكەمەوە كە ئەو ڕابوونە میللییانەی لە ولاتەكەم بەرپابوون لە سۆنگەی ئەم مۆتیڤانەی خوارەوە سەریانهەڵداوە:

١- چەوساندنەوە و زولم زۆر دژ بە گەلی كورد.

٢- دەستێوەردانی دەسەلاتكارانی سەربازیی (ئینگلیـن) لە كاروباری ناوەخۆی حكومەتەكەم.

كورد كە نەیتوانی بەرگەی ئەم حاڵەتانە بگرێ، پەنای بردە بەر چەك و پێی وابوو تاكە ڕێگەیە بۆ بەرگری لە خۆ كردن. بێگومان ئەو دەستێوەردانە سەربازیەی ئینگلیز كە لە ولاتەكەم دەكران تەنها یەك ئامانجیان لەبەرچاو بوو كە ئاژاوەی تێدا بنێنەوە و لەوێشەوە بەدوای ئەوەدا بگەڕێن بێ توانایی حكومەتەكەم بسەلمێنن". سەید ئەحمەد لە دوا وتەیەدا داوا لە ئەفسەری پێوەندی حكومەتی فرانسا دەكات تا " ناوەڕۆكەكەی بگەیەننە حكومەتی فرانسا كە بە بێ وەستان داكۆكی لە ئازادی گەلانی چەوساوە دەكات. ئێمە لێتان دەپاڕێننەوە كۆتاییێك بۆ ئەم جۆرە كارانە دابنێن لە ولاتەكەم"[١٢]. بەلام هەموو ئەم هەوڵ و تەقەلایانەی وەفدی شێخ مەحموود هیچێكیان لێوە شین نەبوو و فرانسا نە هیچ بەرژەوەندییەكی لە كوردستانی جنووبی دا هەبوو و نە ئەو توانایەشی هەبوو دەست لە كاروباری ناوچەیەك وەربدات كە بە

[١٢] ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا، مەزبەتەی سەید ئەحمەد بۆ كۆلۆنێل كووس، ئەفسەری حكومەتی فرانسا لە دیمەشق، ڕۆژی ١٨ ی ئابی ١٩١٩.

# حکومەتی خوارووی کوردستان،
# لەبەردەم شالاوی ڕاگەیاندنی دژدا
# (بە نموونەی ڕۆژنامەنووسیی)

❖ د. محەمەد دلێر ئەمین میسری

## پێشەکی

ڕاگەیاندن، بە هەموو جۆرو بەش و ڕەگەزەکانیەوە،پرۆسەی گەیاندنی پەیامی سەرچاوەیە، بۆ کەس یان ناوەندێکی دیاریکراو، بە مەبەستی گۆڕینی ئاراستە و ورووژاندنی جۆرێك لە خولیاو هەوڵی سەپاندنی بیرو گۆڕانی ئاکارو بزاوتی سیاسی‌یان کۆمەلآیەتی .... هتد. ئەکرێ بلێین وەك دامەزراوەیەکی کۆمەلآیەتی کارئەکات و پێداویستیەکی ژیانی ڕۆژانەیە، بەپێی سەردەم و قۆناغ و کات, شێوە و ناوەڕۆك و کەناڵی گەیاندنی ئەگۆڕێ وەك ئۆتوگریت ئەڵی: دەربڕینی بابەتیانەی هزر و گیان و ئارەزوو و ئاراستەی جەماوەری لە یەك کاتدا ."١"

دیارە ئەم خواست و ئارەزووانە وەك هەر دیاریەکی تری ناو بواری فیکری‌و سەرنج و ئارەزووی خۆسەپاندن لە ململانێ و دژایەتیدایە، جا لە نێوان دوو کەس یان دوو گروپ و دوو نەتەوەدا بێت.

لەبواری سیاسەت و داخوازی میللیدا، هەمیشە خواستی سەربەخۆیی و ڕزگاری بوون لەژێر هەژموونی داگیرکەر, ڕووبەڕووی سەرکوت و پەلاماربوونەوە بۆتەوە, سەرەتا بە هێرشی ڕاگەیاندن و دواتر بە هێرشی لەشکر و گرتن و وێرانکاری.

بەمانایەکی‌تر پرۆسەی ڕاگەیاندن دوو باڵەو بە دوو ئاراستەی دژ بەیەك کارئەکەن، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی دژ (الاعلام و الاعلام المضاد) ئەکرێ هەر یەکەیان بۆ مەرامی خۆی هەموو شێوازێکی ڕەواو ناڕەوا بەکاربەرێ، بەلآم زیاتر ڕاگەیاندنی دژ پەی بە ڕێگا چەوتەکان ئەبات و لە کاتی شەڕی جەستەیدا, شەڕی دەروونی خەست ئەکاتەوەو هەموو شێوازە گونجاوەکانی بەکاردەهێنرێ.

قۆناغی یەکەمین دەسەڵاتی سیاسیی کورد لە سەدەی پێشوودا،لەگەڵ ئەوەی توانی ڕۆژنامە نووسیی وەك کەناڵێکی نوێ و مۆدێرن بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی خواست و ئامانجەکانی بەکاربهێنێ و قەڵەمی ئەدیب و نووسەرە دیار و ناودارەکان لەسەر خوانی پیشەیەکی شارستانی کۆبکاتەوە, لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندنی دژ بە شێوەی زارەکی و بڵاوکراوە, بەردەوام کاری کردووە و هەوڵی بەردەوامی داوە پێگەی دەسەڵاتەکە لەق بکات و متمانەی لە ناو خەڵکدا بخاتە بەر گومان و ڕێگا بۆ داگیرکەران خۆش کات کە ئەو بەشە سەربەخۆیەی کوردستانی باشوور بخەنەوە ژێر ڕکێفی داگیرکەری نوێ و جارێکی تر بیلکێنەوە بە عێراقێکی پڕ کێشەی ئیتنی و مەزهەبی‌و کۆمەڵایەتی, دیارە ئەو هەوڵی دژە ڕاگەیاندنە بەشێکی کاریگەر بووە لە بەرنامە سەربازی و بۆمباباران و هەڵگەڕانەوەی هۆزو خێڵەکان.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ دیاریکردنی ڕەگەزەکانی ڕاگەیاندنی دژ لەو سەردەمەدا،ئاشکراکردنی سەرداوەکانی ئەو هەولانە بەو بەڵگە و نموونانەی لە ڕۆژنامەکاندا باس کراون لەگەڵ ئەو چالاکی یە سنووردارەی دەستە بژێر لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا ئەنجامیان داوە بۆ ڕەوینەوەی ئەو تەمتومانە لەسەر خواستە ڕەواو بەرنامە سیاسیەکەی.

# هەڵگیرسانی شەڕی دەروونی
# لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە

"ئەو کاتەی ئینگلیز وەك براوەیەکی شەڕ لە مانگی ئازاری ۱۹۱۷ دا بەغدای داگیر کرد، لە هەوڵی خۆ نزیك کردنەوە بووە لە کورد و کەوتە ناردنی پەیامی دۆستانە و بەڵێن نامە و گفتی شیرین لە ڕێگای ڕۆژنامەی ((تێگەیشتنی ڕاستی)) یەوە کەلە سەرەتای ۱۹۱۸ دا لە بەغدا بە زمانی کوردی دەردەچوو (مێجەرسۆن) کە پێشتر وەك گەڕیدەیەك بە ناوی (میرزا غولام حوسەینی شیرازی یەوە)"[۲] هاتبووە کوردستان و شارەزایی باشی لە ئاکارو بیروڕای کورداندا هەبوو، سەرنووسەرو بەڕێوەبەری بوو، هەوڵی دا لە ڕێگای ئەو ٦٧ ژمارەیەوە , کورد لە سۆزە ئاینییەکەی دابڕی کە زیاتر بەلای دەوڵەتی عوسمانی و تورکدا نەشکایەوە و لە بری ئەوە بەرەو هەست و سۆزێکی نەتەوەیی ئاراستەیان بکات , کە لەم بەرنامەیەدا سەرکەوتوونەبوو، بەهۆی دووری شوێنی ڕۆژنامەکە لە کوردستان و کەمینەی خوێندەوارو ناڕۆشنی سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە کورد، ململانێی ئینگلیزو تورك لە کوردستانی باشووردا زیاتر لە ڕووی ڕاگەیاندن و ڕگەیاندنی دژەوە گـژبۆوە بەتایبەت دوای شکستی یەکەمین حوکمدارێتی شێخ محموود کە تەنیا حەوت مانگ و یەك ڕۆژی خایاند ۱۹۱۸/۱۱/۱ تا ۱۹۱۹/٦/۱۹ و ئینگلیز ڕاستەخۆ کاروباری سلێمانی یان گرتەوە دەست، ئەو ڕەوشە نائارامیەی لە سلێمانی و دەوروبەردا هاتە ئاراوە , زەمینە لەباربوو بۆ ڕاگەیاندنی دژ، پاشە گەزبوونەوەی ئینگلیز لە بەڵێنەکانیان و ئەو توندو تیژیەی دەستیان دایە (( شەش هەفتەی یەکەم دووای گەڕانەوە یان سەرقاڵی سزادانی شۆڕشگێڕان بوون و تەنیا بەناو سلێمانی یەوە نەوەستان، بەڵکو کەوتوونەتە کێوماڵی پانتاییەکی فراوانی هەرێمی سلێمانی ))"[۳]

میٚجەرسۆن، کە لە ١٩١٩/٧/١ەوە لە سلێمانی دەست بەکاربوو, گرنگی و بایەخی ڕاگەیاندنی ئەزانی، هەر لەبەرئەوە ویستی ئەو مەرامەی لە (تێگەیشتنی ڕاستی‌دا) دا بە ئەنجامی نەگەیاندبوو, لە ڕۆژنامەیەکی تردا دووبارەی بکاتەوەو ئەمجارەیان لە ناو چەقی کوردستانی باشووردا, هەربۆ ئەم مەبەستە چاپخانەیەکی نیو داشتی هێناو لە ڕۆژی ٢٩/نیسانی/١٩٢٠ دا یەکەم ژمارەی (پێشکەوتن)ی بلأوکردەوە بووە ئامرازی پروپاگەندەی سیاسی ئینگلیز بوو, هەر لەبەرئەوەش (زۆری بەشان و باهووی دەوڵەتی بەریتانیاو ڕۆڵی شارستانیانەی لە جیهاندا هەڵگوت، لەبەڕێوەبەری کوردستاندا بۆ میٚجەرسۆن هاوکار بوو) "٤" (پێشکەوتن) وەك پانۆڕامایەکی کۆمەلأیەتی و سیاسی سلێمانی و ناوچەکە, ئاگاداری ئاراستە سیاسی‌و بۆچوون و قسە و قسەلۆکی ناو خەڵك بوو, هەر لەبەر ئەوە هەوڵی داوە بە زمانی سادە و سەتیر ئامێز بەرپەرچی پروپاگەندە و واتەواتی ناو خەڵك بداتەوە بە تایبەت ئەو قسەلۆکانەی لە لایەن لایەنگرانی تورك و دژە ئینگلیزەکانەوە ئەکران و مەبەستیان بوو سیاسەتی ئینگلیز قێزەون بکەن, ئەم ڕۆژنامەیە زۆر بەبایەخەوە ئەو دەنگوباسە زارەکیانەی ئەگواستەوە بۆ ناو ڕۆژنامەکە و وەلأمی کورت وچڕو سادەی ئەدانەوە, گۆشەی ((قصەی پروپوچ)) کە بێناو یان بە پیتی خواسراو نووسەرەکەی دیاری ئەکرا, نموونەی ئەو لایەنە دژەیە, بۆ نموونە ئەنووسێ ((هەندێ کەس ئەم ڕۆژەیان پێ خۆش نییە, شەمشەمەکوێرەیش ڕووناکی پێ خۆش نیە)) "٥" دیارە مەبەست لەوانەیە دژ بە داگیرکاری ئینگلیزەکانن, هەر لەم گۆشەیەوە (قصەی پروپوچ) پروپاگەندەکان ئەنووسران و وەلأم ئەدرانەوە:

(ئەڵێن تورکەکان تێکنیشتون، چاکتریش تێکئەنیشتن) (مستەفا کەمال کەر دەرچوو لە کەرەکانی ئێمەش کەرتر)

(حکومەت ناهێڵێ ڕاوی چێرك بکرێ , ئێمەش وەك تورك ڕاوی حاجی لەق لەق ئەکەین)) ژنی دەمێردی هەیە بە شەرعی بۆ شەوێك)

((جەجاڵ هەڵساوە وا لە ڕووسیایە)) ((ئەڵمان دەستی کردۆتەوە بەشەڕ، بە کچێنی هیچی پێ نەکرا ئەمجا بەبێوەژنی )) گەلێکی تر لەم ڕستە ئاشکراو ڕاستەوخۆیانە کە کاردانەوەی ئەو ناوەندەیە وەك ڕۆژنامەکە ئەڵی دەنگوباسی ناو بازاڕ چیە ؟ لە هەزار ئاش ئەکەن و یەکێکی ناماڵنەوە)) یان (درۆ و دەلەسە زۆرە هەمووی دەست هەڵبەستە)"٦" نووسەری ئەم ستوونە کەسێکە تا ئێسك لەگەڵ مەرام و خواستی ئینگلیزدایە هەر لەبەر ئەوەش لەکات و شوێنی خۆیدا وەڵام ئەداتەوەو هەوڵ ئەدات ئەو پروپاگەندە شاراوانە بە نووسین و ئاشکرا پووچەڵ بکاتەوە.

دیارە لە پاڵ ئەو وەڵامدانەوەیەدا ، ڕۆژنامەی ((پێشکەوتن ))، وەك سەروتار لە هەندێ ژمارەدا، بەرپەرچی ئەو فشارەی قسەی ناو خەڵکی داوەتە کە ئینگلیز بە نهێنی کوردستان جێ ئەهێڵێ و جارێکی تر دەسەلاتی تورك و ئێران دێتەوە، لە سەروتاری ژمارە ١١ ی ڕۆژی ٨ ی تەموزدا ئەنووسێ ((ئەی مردووی درۆتان مرێ .... دەمێکە زۆر زۆر دەمێکە ئەم مینجەمینج و ورتەورتانە دەبینم ئەڵێن حکومەت لێرە نامێنێ، هەر وا بزانە دەرچوو ، بەجێی دەهێڵن، کەلوپەلیان لە پێشەوە ڕۆی ، عەسکەریان لە عێراقدا نەما ، هەرایە، دەست کرایەوە بە شەڕ، حاکم ڕۆی یا ئەڕوات ، ئەمانی تریش دەڕۆن .... هەروا بزانە پاشا بەلەشکریەوە گەیشت .. بەم ئێران و توران تێکەڵ ئەکرێ .. لە چل و پێنج هەزار ئاش ئەکەن.....هتد ))"٧" ناڕەزایی خەڵکی سلێمانی لە ڕەفتارەکانی مێجەرسۆن و گژبوون ئاڵۆزی بارودۆخە سیاسیەکە بە لایەنگرانی شێخ و نیشتمان پەروەرانی هانداوە مژدە بە خەڵکی بدەن کە گەڕانەوەی شێخ و دەسەلاتی کوردی نزیکە و ڕۆژی ئینگلیز لە ئابوونە، دیارە ئەو واتەواتە زۆر کاریگەربووەو ورەو ئومێدی بەبەرخەڵکدا کردۆتەوەو دەسەلاتی ئینگلیزی جارس کردووە، بەڵگەی ئەم بۆچوونە ئەو بانگەوازەیەکە ڕۆژنامەی پێشکەوتن، ژ ٦٥ی ڕۆژی ٢١/جولای/١٩٢١ بلاوی کردۆتەوەو ئەنووسێ ((لەبەر ئەمە لەناو شاردا هەنێ قسەی درۆ بلاوکراوەتەوە وا مناسب بینرا کە ئیعلانی خوارەوە بلاوبکرێتەوە:

(هێشتا حکومەت هیچ نیەتی نییە بهێڵێت شێخ محموود بێتەوە بۆ عێراق یا کوردستان, شێخ عبدالقادرو شێخ غەریب و سەیید ئەحمەد ئێستا لە بەغدادن و لەوێش دەمێنن)

مەبەست لەو نموونانەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) دەرخستنی ئەو هەل و مەرجە گونجاوەیە بۆ تەشەنەو بلاوبوونەوەی پروپاگەندە لەو ناوچەیەی جێی ململانێی تورك و ئینگلیز لە لایەك و شێخ محموودی نەمرو هێزە نەیارەکانی بە تایبەت ئینگلیز لە لایەکی ترەوە.

(پروپاگەندە و واتەوات)) کە شێوازی ڕاگەیاندنی دژە بەم پێیە پێناسەکراو ((بریتی یە لە بلاوکردنەوەی زانیاریو ڕووداو کە لەوانەیە ڕاست بێت یان درۆبێت, بەمەبەست خولقاندنی جۆرە بیرکردنەوە و بۆچوون و چالاکیەك کەمەبەستە ڕووبدات و لەبەرژەوەندی ئەو لایەن و تاقم و کەسەی کە سەرچاوەی پروپاگەندەیە))"٨" چەند جۆری هەیە (سپی و ڕەش و خۆڵەمێشی) ((واتە وات) یان ((قاو)) (ئەو قسە و قسەلۆکەیە کە لە ناو خەڵکدا دەماو دەم ئەکات و بۆ یەکتری ئەگێڕنەوە, بێئەوەی دڵنیابن و هەوڵ بدەن بۆ زانینی ڕاستی قسەکان _ یان ((بریتییە لە هەموو جۆرە قسەو باسێك کە لەوانەیە ڕاست بێت و زۆرجار هەڵەش بێت, سەرچاوەکەی نەزانراوە , بەکارامەیی وە ئەهۆنرێتەوە, هەرکەسە بۆ خۆی کەمێکی لێ ئەکاتەوەو ڕای خۆی بە شێوەی هەستی یا نەستی بۆ زیاد ئەکات, تا وای لێ دێت و گەورە ئەبێت و بە خێرایی بە ناو خەڵکدا بلاوئەبێتەوە ))"٩"

دیارە شەڕی دەروونی و فشاری ئابووری و جموجوڵی سیاسی, ئەچێتە خانەی ڕاگەیاندن یان ڕاگەیاندنی دژەوە... حکومی ڕاستەوخۆی ئینگلیز نەیتوانی ئامانجەکانی خۆی جێ بەجێ بکات و دەنگی ناڕەزایی زیاتر بەرزبووەوە ((ڕۆشنبیرانی سلێمانی لەو سەردەمەدا, پێیان وابوو زۆرینەی خەڵك دژی حکومڕانی ڕستەخۆی ئینگلیزن و ئەو حکومەی (سۆن) لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە بەڕێوە دەچێت ...))[١٠] ئاشکرایە دوورکەوتنەوە دەسەلات لە خەڵك و بوونی دەلاقەی بێ متمانەیەی دەرفەت زیاتر بۆ پروپاگەندە و واتە وات خۆش ئەکات و زەمینەی بلاوبوونەوەی زیاتر

لە بارە, بەتايبەت لە ناو خەڵكی نەخوێندەوار و خۆش باوەڕ و لە كۆمەڵێكدا كە كەوتبێتە ناو بازنەی ڕاگەياندنی سۆزدارو بۆ زانينی هەواڵ و شيكردنەوەی پشت بەبيستن بێت نەك خوێندنەوەو شيكردنەوە.

لەناو ئەو لێشاوی سۆزدارية بۆ تورك و عەشيرەت و خێڵ و كەس, چەند گروپ و دەستەيەك لە سلێمانيدا كەوتوونەتە بەرهەڵستی كردنی ئينگليزو خواستی گەڕانەوەی شێخ بۆ حكومدارييێتی سەرچاوە مێژووييەو ياداشتی كەسايەتيەكانی سەردەمی شێخ مەحمودی نەمر, ئامارژە بۆ بارودۆخی سلێمانی ئەو كاتە بەو شێوەيە ئەكەن كە دانيشتووانی بەسەر سێ تاقمدا دابەش بوون مووچە خۆرانی ڕۆژگاری دەسەڵاتی عوسمانی, خەڵكە ڕەشوكيەكە كە كاريگەری ئاينی يان بەسەرەوە بووە , دەستەی سێهەم كە نەبڕوايان بە تورك و ئينگليز نەبوو, هەروەها دەستەيەكی نوێ كەلەسايەی دەسەڵاتی ڕاستەخۆی ئينگليزدا كاری ميری يان ئەكردو سەر بە ئينگليز بوون, لەگەڵ كەمينەيەك لە لاوی ڕۆشنبيری و نيشتمان پەروەر كە لەلايەن زۆرينەوە بەبەربەكانی ئەكران و تۆمەتيان ئەدرايە پاڵ,"١١" هەريەك لەم دەستە و گروپانە بە قەوارەی خۆيان وخواست و مەرامەكانيان، پروپاگەندە يان بۆ نەيارەكانيان بڵاوكردۆتەوە, ديارەكەناڵێكی نووسراويان نەبووە بۆيە زياتر بە واتەوات و پروپاگەندەی سپی و ڕەش پشت ئەستور بوون.

دەرچوونی ڕۆژنامەكانی ((بانگی كوردستان)) ((ڕۆژی كوردستان)) ((بانگی حەق)) ((ئومێدی ئيستقلال)) وەك يەكەم هەوڵی ڕۆژنامەنووسيی ئازادلە سايەی دەسەڵاتی ڕاستەخۆی كورددا, ئەزموونێكی نوێيە لە ڕۆژمێری شۆڕش و ململانێی كورد و دەسەڵاتە داگيركەرەكانيدا.

ئەم ڕۆژنامانە گەرچی لە ڕووی تەمەن و ئەزموونەوە, لەسەرەتادا بوون، بەڵام نووسەرو بەڕێوەبەرانی شارەزايی شێوازەكانی ڕاگەياندن و ڕاگەياندنی دژبوون, ئەكرێ زۆر ڕووی ئەو ديمەنە كۆمەڵايەتی و سياسيانەی ئەو ڕۆژگارەی لێوە هەڵگۆزين, كە ئەم لايەنە تا ئێستا دەگمەن لە توێژينەوەيەكی تردا ئامارژەی پێ كرابێت.

پـێش هاتنـەوەی شـێخ مـەحمود بـۆ سلێمانی لـە ١٩٢٢/٩/٣٠ دا , پروپاگەنـدەی تورکـەکان زۆر بـەهێز بـوو, ئینگلیـز کـە ڕێگایان بـە (جەمعیـەی کوردسـتان) دا وەك کۆمـەڵێکی ئاشـکرا لـە کوردسـتانی باشـووردا دامـەزرێ , بۆئەوە بوو بەر لە پروپاگەندەی توورکخوازەکان بگرێت. "١٢"

ئەگەر سەرنج بدەینـە ڕۆژنامـەی ((بـانگی کوردسـتان)) بـۆ یەکـەمجار لـە کـەش و هـەوایـەکی ئازادا , ئـەم وشـانە : بـەکاردێن (شـایعە) (پروپاگـەنـدە) (مسموعات) (قصەی عەوام فریبانە)"١٣"

دەنـگ و باسـانە ئەیخاتـە ڕوو کـە لـە نـاو خەڵکدا بـاوە و پەیوەسـتن بـە بارودۆخەکەوە , وەك دەرئەکەوێ ئایندەی کورد بە دەنگی ناحەزان گەمارۆ دراوە و هـەر لایـەنێك بـۆ ئامـانجی خـۆی سـۆزی خـەڵك شـەقامی جوڵانـدوە , زۆربـەی جـار پروپاگەنـدە پـێش ڕووداو کـەوتووەو ئامـادەیی بـۆ دیاردەیـەك کـراوە کـە لەگـەڵ خواسـتی نەتـەوەیی و هـەوڵی سـەربەخۆیدا نـا جـۆر بـووە, هەرلەبـەر ئەوەیـە سەرنووسەری ڕۆژنامەکە ناچارە ڕێگا لـەو ڕاگەیانـدنی دژە بگرێـت و لـە ڕووبـەڕی بڵاوکراوەکەیـەوە نیـازی خراپـی ئاشـکرا بکـات, بـۆ نموونـە لـە بـانگی کوردسـتاندا هاتووە ((ئەڵێن هەیئەتی ناسیحە لە بەغداوە دێت)) ... لەم ڕۆژانەدا شایعەیەك هەیە ئەڵێن هەیئەتێکی ناسیحە لە بەغداوە دێت بۆ کوردستان .....

ئەگـەر مەقصـەدیان ئەمـەبێ نەصـیحەتمان بکـەن تـابیعی عێـراق بین وەختێ خۆی لام باش نیە بێژراوە, وەفیکری کوردایەتی هـەتا بێت دا دەکوتێ و ((بانگی کوردستان)) لەگەڵ مەعاریف بۆ تەرەقیو تەنویری کوردان سـەعیو دەکات ..... هتد ))"١٤".

ئـەم وتـارە وەڵامـی ڕاگەیانـدنی دژە کـە لـە شـێوازی پروپاگەنـدەی خۆڵەمێشیدا ئـەو قـاوەی ناوەتـەوە خواسـتی شـۆفێنزمی عـەرەب بـووە کـە کوردستانی باشـوور بخەنـەوە ژێـر دەسـەڵاتی عێراقی نوێو هـەلێك بـووە لـەو هەوڵانـەی بـۆ پەشـێوی بارودۆخەکە دراوەو هـەر ئـەو تەشـویشـەی ڕاگەیانـدنی دژەبـوو کـە کـاری کردۆتـە سـەر دیـد و بۆچـوونی پیـاو مـاقوڵانی شـار کـە گەورەترین دەستەی باڵا بوو بە ناوی (مەجلیسی میللی) دا نـەیانتوانیووە بە

ئاشکرا بیروڕای خۆیان سەبارەت بە ئایندەی کوردستانی باشوور دەربڕن و بە ڕوونی وەڵامی ئەو سێ پرسیارە بدەنەوە کە ئاراستەیان کراوە. "١٥" وەك لە ژمارەکانی (بانگی کوردستان)دا دەرئەکەوێ، پروپاگەندەچییەکان تەنیا بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناجۆر و دژە خواستی میللی و لایەنگری دوژمنانی کورد نەوەستاونەتەوە بەڵکو لەو ترسناکتر ئەو هێرش و تانە و تەشەرەیە کە بە ناڕەوا دوای خەڵکانی نیشتمان پەروەرو خوێندەوار و خاوەن قەڵەم فراوان یان خستووە . بە مەبەستی ناوزڕاندن و قێزەونکردنیان لە دیدی خەڵك و کۆمەڵەکەیاندا , ئەم جۆرە لە زانستی ڕاگەیاندندا بە کینە واتە وات ((اشاعة الکراهیة)) ناو ئەبرێت , زۆر مەترسی دارە بەتایبەت لە ناو کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو , کە ئاستی بیرکردنەوەیان سنووری ئاینی و لایەنگی خێڵ و ناوچویی نابەزێنێ و ئەوەندەی کەرەسە سادەکان ئەجوڵێن و سۆز ئەلاوێنێ دەئەوەندە لە هزر و بیرکردنەوە و بەراووردکردنی دوور ئەکەوێتەوە .

((سۆزو عاتیفە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ و بە دیمەن و هەواڵی دەگمەن و سەرنج ڕاکێشەکانی کاری تێئەکرێ و ئەوروژێنرێ هەر کاتێکیش عەقڵ و لۆژێك ئامادەنەبوون، ئەوا هەست و سۆزەکان ئامادەی هەژاندنن)) "١٦"

نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی وەك مستەفا پاشاکە وەك نوێنەری دەست بژێری ئەو قۆناغە مێژووییە ناوی لە ناواندایە , ئەو ئاکارە ناپەسەندو خوارانە تەواوکاری تێکردووە و دەنگ و قەڵەمی لێ هەڵبڕیوون ئەیەوێ دەست و مەرامیان بخاتە ڕوو، ئەڵێ :ئەوانەی کەلەوەختی خۆیانا لەگەڵ میللەت، لەگەڵ وەتەن غیرەز بەدخواهی و خیانەت هیچی تریان نەبووە , هەمووبوون بە ئەحرار، هەمووبوون بە وەطەن پەروەر , ماڵەو ماڵ دەکەن، یەن لە دیوانخانیاندا غەیبەت دەکەن لە نەظەر بەعضێ جوهەلادا بە قسەی عوام فریبانە، ئەربابی فەضل و عیرفان ذەم دەکەن نازانن کە ذەم مەزمووبان دەبێتە باعثی تەعالی و تەظاهور شەرەفی ئەهلی عیرفان، هەچەندە ئەهلی ئەم مەملەکەتە کە زۆریان چاك و خراپ فەرق دەکەن و تەرجوومەی ئەحواڵی ئەو

مفسیدانه، ئەو کاسە لێسانانە دەزانن فەقەط حەیف بۆ قەومەکە ، حەیف بۆ ولآتەکە ئەوانەی کە تەرەقی کوردستانیان ناویّ مەمنوونی دەبن ، ئەوانەی کە چاویان هەر لە خزمەتکاری یە نانیان لە ڕۆندا بیّ، بزانین تاکەی ئەم ناپیاوانە نانی ناپیاوەتی و دوو ڕووپیّ دەخۆن ......))"١٧"

لە دوای گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی و ناساندنی بە حضرەتی حوکمدار)"١٨" و پێکەوەنانی کابینەی حکومەتی کوردستان (دووەم) ، هێرشی ڕاگەیاندنی دژ کەوتە قۆناغێکی نوێوە ، لێرەوە بەدەر لە واتەوات و پروپاگەندەی ناوخۆ بە جۆریّ تەشەنەی کرد لایەنگرانی تورك هەوڵیان داوە دژ بە خواستی حوکمدار بجوڵێنەوە ئەوەتا بانگی کوردستان ئەنووسیّ ((ئەو ڕۆژە کە خەبری ئیستقلالی کوردستان گەیشتۆتە کویسنجق بەعضیّ لە ئاغایانی ئەویّ چوونە سەر تەلغراف وتوویانە ئێمە ، ئیستقلالی و سلێمانیمان ناویّ))"١٩"

لەگەڵ ئەو هەواڵەدا نووسەر دەستی خۆی بەرزئەکاتەوەو ئەڵیّ ((خودایە ئەوانەی لەباتی سەعی بۆ تەحکیمی حکومەتی میللی، بۆ زەوری ئیفتیشاش، بۆ تەشویقی فیرقە لەگەڵ، فیرقە بە شەفاهی، خەبەرو یا بەکاغەز نووسین تەشویقات دەکەن، وەك لە دونیادا تەریق بوونەوە، لە ئاخیرەتیشدا جەزایان بدەنیّ))"٢٠"

لێرەوە وردەکاری ئەو ڕاگەیاندنی دژە سەرهەڵئەدا کە چەند شێوازی نوێی وەرگرتووە، هەواڵ، کاغەز نووسین، زارەکی و تەنانەت تەلغراف، کەدیارە مەبەستی خاوەنەکانیان ئاگادارکردنەوەی ئینگلیز و بەغدا بووە ویڕایی شێواندنی ئارامی ناوخۆ. ئەم بەرنامەی ڕاگەیاندنی دژە بەشێك بووە لەو هەولآنەی ئینگلیزو حکومەتە داردەستەکەی لە بەغدا داویانە بۆ سنووردارکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلآتی حکومەتی کوردستان، وەك هەنگاوی یەکەم و دواتر لکاندنەوەی سلێمانیو دەوروبەری بەبەغداوە.

ئەرکی ڕۆژنامەی ((ڕۆژی کوردستان)) و ((بانگی کوردستان)) سەختو گرانتربوو، لەبەرئەوەی وەك زمانحاڵی حکومەت و دەوڵەتی

کوردستانی باشوور کەوتنەکارو هێڵە سیاسیەکانی بە چەند ئاراستەیەکدا دەرئەکەوتن: یەکەم وەك ئەرکی ڕاگەیاندن دەرخستن و ئاشکراکردنی پرۆتۆکۆلاتی حکومەت, ئاگاداریەکان ... بەمەش بووە ئەڵقەی پەیوەندی دەسەلاّت و خەڵك.

دووەم ئەبوایە لە پاڵ جاڕدانی ماف کورد ڕەوایەتی شەرعی لە دامەزراندنی حکومەتی نەتەوەیی خۆیدا لەسەر ئەرز و ئاو و نیشتمانی خۆی وەك ئەرکێکی ڕۆژنامە و سەردەمەکەی , ڕێگا لەو ڕاگەیاندنی دژە بگرێت یان وەلاّمی بداتەوە کەبە نووسین و شێوەی ئاشکرا دژ بە خواستەکانی کورد ئەوەستانەوەو گوێی ناحەزانیان لێ پڕ ئەکرد, "٢١" بۆ نموونە حیزبی حووری عێراقی کە داردەستی ئینگلیز بوو لە ڕۆژنامەیەکەوە (العراق), سلێمانی بە لیوایەکی عێراق لە قەڵەم ئەداو عارف سائب بوێرانە وەلاّمی ئەداتەوە و خوێنەر و ناوەندەکە لە مەترسی ئەو هێرشانە وریائەکاتەوە، پلەی هۆشیاری خۆی لە ئاست ڕووداوەکاندا ئەخاتە ڕوو. "٢٢" بەلاّم ڕاگەیاندنی دژ لە سەرجەم ڕۆژنامەو بلاّوکراوەکانی دەرو دراوسێدا گەمارۆی ڕاگەیاندنی نیشتمانی داوەو زۆر زەحمەت نوزەیەکی حەق بێژی بووبێت لە ناویاندا باسی لە ماف ڕەوای میللەتی کوردو حکومەتەکەی بکات, ئەم ڕاستیەش تەنیا دەستەبژێر درکیان پێ کردووە و پێ ئەچێ خەڵك و تەنانەت بەرنامە ڕێژیەك بۆ کەمکردنەوەی ئەو مەترسیە نەکراوە کەتا ئەمڕۆش دەنگدانەوە ئەو دژایەتیە لە میللەتانی دراوسێی کوردا ڕۆڵی خۆی ئەبینێت و ئەو دیواری ڕق و بێ دەنگیە سەبارەت بە هەموو نەهامەتیەی لە سەدەی بیستەمدا بەسەر کورد داهات, ڕای گشتی گەلانی نەجولاّند, ویژدانی نووسەر و بیرمەندانی نەهەژاند, ڕەنگە کەسایەتیەکی دەگمەنی وەك (عارف صائب) بە وردبینی و بەدواداچوونیو گەڕانی بەناو بلاّوکراوەکانی ئەو ڕۆژگارەدا, ئەو ڕاستیەی بۆ دەرکەوتبێت بۆیە ئاشکرا ئەڵێ:

((هەرچەند تێ ئەفکرم و ورد ئەبمەوە لە غەزەتەی دراوسێکانماندا، مەعەل تەئەسف تەصادف مەقالەی هیچ محررێکی حەق, حەقیقەت پەرستم

نەکرد کەبێ تەرەفاتە بنووسێ و حەقیقەت ئیهمال نەکات, بالعەکسی ئەوی کە حەق و حەقانیەت بیێ چاوی لێ ئەقوچێنین و هەرچی بادا بایاد ستوونی غەزەتە رەشی ئەکەنەوە صرف بۆ تەمەتوعی ذاتیە یا بۆ تەعقیب و ئامالێکی وا هی ئەیانەوێ موعیظ, میللەت عرق، لیسان و ئاستی موجودیەتی کوردستان بە خۆرایی ئیهمال و پامالْ بکەن و لەم عەسری بەخشایشی حقوقەدا ئەم میللەتە قەدیمە بە قسە بێ بەش و مەحرووم بکەن.... هتد"[٢٣]

دیارە سەرەتا بە قسەی واتەوات و دواتر بە هێرشی سەربازی‌و بۆمباران.

لە گەمەی شەڕ و پێکدادانەدا , شەڕی دەروونی بە هەموو جۆرەکانیەوە , هەوڵ و کۆششی ئامانجدەرانی گورج ئەبێتەوە , مەبەستیانە تۆوی ڕاڕای و نائومێدی لە ناو بەرەی بەرامبەردا بچێنن و توانای بەرگری کەم بکەنەوە, ئینگلیز وەك دەوڵەتێکی بە ئەزموون لە شەڕی تەقلیدی و دەروونیدا, بە هێرش بۆ سەر کوردستان و بۆمبارانی سلێمانی‌و دەوروبەریدا درێغی نەکرد تا ئەثەری دڵرەقی و ستەمی بەکارهێنا, (هاریس harris ) ی فڕۆکەوان کە بەشداری لە بۆمبارانی سلێمانی کردووە , بە شانازیەوە ئەنووسێ :

((ئێستا تێگەیشتن (مەبەستی شۆڕشی کوردەکانە) کە لە ماوەی ٤٥ دەقیقەدا , ئەتوانین گوند بە تەواوی لەسەر گۆی زەوی بسڕینەوە)) ئەم فڕۆکەوانە بەهۆی کارە دڕندانەکانیەوەو جێ بەجێ کردنی فەرمانی سەرکردەکانی زیاتر لەوەی فەرمانی پێ درابوو دواتر کرایە سەرکردەی ئاسمانی بەریتانیا دژی ئەڵمان,"[٢٤] ڕۆژنامەی (بانگی حەق) کە لە ٢٨ی مارتی ١٩٢٣دا لە ئەشکەوتی جاسەنە دا, تەنیا سێ ژمارەی لێ دەرچووە, وەك سەرچاوەیەکی گرنگ و شاهد حاڵی سەردەمەکە, باس لەو سەختی و دڕندەیی بۆمبارانە ئەکات , لە پاڵ ئەمەشدا کە هێرشی ڕاستەوخۆ ئەکاتەسەر ئینگلیز و ئەو سیاسەتەی لەگەڵ کوردی مەزلومدا پیادەی کردووە, هێما بۆ ڕۆڵی پروپاگەندە و واتەواتی ناوشار ئەکات کەلە هەوڵی ناو زڕاندنی شێخ و شۆڕشەکەیدان , لەم بارەیەوە لە ژمارەیەکدا ئەنووسێ :

((ئەهلی شاری سلێمانی و تەوابیعی و هەموو قەومی کورد ئەمین و موطمەئین بن کە ئێمە لەسەر سەعادەت و خێری ئەوانین , بە قسەی بەعضێ مونافقین و بەد خواهانی ئیسلام و کورد ئغفال نەبن .... ئەگەر بەعضێ بەد خواهان و خودپەسەندان بە زمانی ئێمە مەعلومات فرۆشی و قسەی پروپووچ یان کرد باوەڕیان پێ مەکەن.

ئەوعانە لە خۆتان دوور بخەنەوە ..... ئەمانە کە بەم تەحرەیە ئیفسادات تەعقیبی مەنفەعەتی شەخصی یەی خۆیان دەکەن , موستەوجیبی نەفرەت و جەزان , لە ئوردووی کوردستاندا جێی ئەم ئەوعانە نییە)) "٢٥"

ئەم چەند دێڕە درکاندنی ئەو قۆناغە ترسناکەیە کە پروپاگەندەی دژ گەیشتوویەتی, چۆن شێوازی سپی گۆڕیوە بۆ ڕەش و بە ناوی سەرکردایەتیو شۆڕشەوە کارئەکات و گومان بەدبینی ئەخاتە نێوان جەماوەرو شۆڕشەکەیەوە, دیارە کاریگەری خراپی هەبووەو بۆیە بە نەفرەت و جەزا ئەکەون و خەڵکیان لێ هۆشیار ئەکرێتەوە, ئەوەی پروپاگەندەی ڕەش لە جۆرەکانیتر جیائەکاتەوە ئەوەیە کە سەرچاوەکەی دیار نییە, کاری گێرە شێوێنی ئەنجام ئەدات و نائومێدی و بێ باوەڕی ئەخاتە ناو جەماودرەوە بە تایبەتی لە ناوەندێکی نەخوێنەوار و بێ ئاگا لە ڕەوشی سیاسی و وریایی پروپاگەندەی دژ بە تایبەت پروپاگەندەی ئینگلیزو تورك کە ئەزموون و مێژوییەکی پێشینەیان هەبووە لە جەنگی دەروونی و پروپاگەندە و واتەواتدا, جێی خۆیەتی لێرەدا بەراوردێکی خێرا لە نێوان هەوڵ و چالاکی ئەو سێ هێزە سیاسیەدا بکەین لە ڕووی بەکاربردنی پروپاگەندەدا (ئینگلیز و تورك و کورد) لە ڕۆژگاری شەڕی یەکەمی جیهانی و دواتردا, تا لەو ڕاستە بگەین کە ڕاگەیاندنی کورد بەو توانا کەمەوە بەرەنگاری چ هێزو پیلانێکی ئامادەکراو بۆتەوە.

ئینگلیزەکان لە ڕۆژی داگیرکردنی شاری بەصرەوە ساڵی ١٩١٤ تا گرتنی شاری موصل ساڵی ١٩١٨ , هەوڵیان دا هەموو ڕۆژنامەکانی عێراق بخاتە ژێر کۆنترۆڵی سیاسەتی خۆیەوە , بە مەبەستی کاریگەری لەسەر ڕای

گشتی "٢٦" , هەر بۆ ئەم مەبەستە پێویستی یان بە ڕووناکبیرو خەڵکانی خوێندەواری دژ بە تورك هەبوو تا هەلی نووسین و بلاْوکراوەیان بۆ بڕەخسێنیْ بە هۆیانەوە بۆ گفتەکانی متمانە پەیدا بکات .

هەنگاوەکانی پروپاگەندەی ئینگلیز بە پێی ڕۆژگار و سەردەم گۆڕاوە و سەرەتا لە ڕۆژنامەکانی (عەرەب, بەسرە تایمس, تێگەیشتی ڕاستی) گوتار و ئاراستەکانیان پەیمان, گفتی ڕزگارکردنی گەلانی ژێر دەسەلاْتی تورکە لە زوڵم و زۆر و بەختەوەری دوای ئەو جەنگەیە کە بەواتەی ئینگلیزەکان, تورك ئەڵمان هۆکاری هەڵگیرسانی بوون بەلاْم لە ڕۆژنامەکانی سالاْنی دواتردا وەك (العراق , الشرق, پێشکەوتن ) ئەمانە زیاتر بۆ بانگەشەی هەژموونی ئینگلیز و دەست بەسەراگرتنی عێراقە و مل کەچ بوونیەتی بۆ داگیرکەرێکی نویْ بەناوی (وصایە یا انتداب)ەوە , ئەوە ڕۆژنامەی (عێراق) بوو, کە تەواو ئاوێنەی سیاسەتی ئینگلیز بووە "٢٧" , هێرشی ئەکردە سەر دەسەلاْتی شێخ محموودو قەوارە ئازادەکەی و ڕای گشتی عەرەب ی هان ئەدا کە ناکریْ دەستبەرداری سلێمانی و دەوروبەری بن و ئەو بەشە دانەبڕاوە لە عێراق و ناکریْ سەربەخۆیانە هەڵس و کەوت بکەن.

ڕاگەیاندن و پروپاگەندەی تورك لە ئاست هەوڵەکانی ئینگلیزدا لاواز بوو, بەتایبەت لە ڕۆژانی شەڕدا ((١٩١٤-١٩١٨)) کە تەنیا ڕۆژنامەی ((زەورا)) کە دەنگی حکومەت بوو ئاگاداری و هەوالْ و ڕێنمایی بلاْوئەکردەوە و نەئەتوانرا ڕۆژانە دەربچیْ "٢٨" گرنگترین بڵندگۆی تورکە عوسمانیەکان لە عێراقدا ڕۆژنامەی (صدی الاسلام) بوو کە لە ١٠ی تەمموزی ١٩١٥ بە چوار لاپەڕەو بە دوو زمانی عەرەبی تورکی دەرئەچوو, ئەم ڕۆژنامەیە تا ٢٩ی تەمموزی ١٩١٦ بەردەوام بوو, شێوازێکی شەڕئامێزو جنێو فرۆشانەی هەبوو, ئامانجی ئەم ڕۆژنامەیە وەك لەسەر وتاری یەکەم ژمارەدا دەرئەکەویْ:

١. پتەوکردنی پەیوەندی نێوان موسوڵمان و خەلافەت.
٢. خستنەڕووی سیاسەتی داگیرکەران ی ئینگلیزەکان و هاوپەیمانەکانی.

٣. گواستنەوەی هەواڵی شەڕ بە تایبەتی ئەوانەی لە بەرژەوەندی تورك و ئەڵماندا بن.

٤. باسی لە پەیوەندی ئایینی میللەتانی ژێر دەسەڵاتی عەسمانی ئەكرد وەك (تورك و عەرەب و فارسی و هند و ئەفغان) "٢٩" دیارە لەو ڕۆژگارەشدا ناوی كورد وەك میللەتێ بەیاد نووسەرانی ڕۆژنامەكەدا نەهاتووە و لە ڕیزی میللەتە موسوڵمانەكاندا ئەژمارنەكراون.

(زیانەڕۆیی و هەڵخەڵەتاندن) دوو خەسڵەتی ئەم ڕۆژنامەیە یە , بەتایبەتی لە گواستنەوەی هەواڵ و بڵاوكردنەوەی فەرمانی دەسەڵاتدارانی توركدا، زیاتر شێوەی پروپاگەندەی ئایینی وەرگرتبوو نەك ڕاگەیاندنی پشت بەستوو بە ڕاستی ڕووداوی بەرەكانی شەڕ كە ڕۆژانە بەشكستی تورك ئەڵمان تەواو ئەبوو. "٣٠"

دوای ئەو كێشمە كێشمەیەی لە ڕاكێشانی ڕای گشتی دا لە نێوان ئیگلیزو توركدا ڕوویدا و تا ساڵانێكی زۆر بە شێوەی زارەكی بەردەوام بوو، دەنگدانەوەو ئەنجامی خراپی لەسەر بارودۆخی كوردستان هەبوو، هەردوو ئاراستەكە ئایینیو بەرژەوەندی داگیركەرانە لە پەراوێز خستنی سەربەخۆییو ئازادی باشووری كوردستاندا یەكیان ئەگرتەوە، هەرلەبەرئەوەش بوو دوای گەڕانەوەی شێخ محموود بۆ سلێمانی دامەزراندنی حوكمداریەتی سێیەم لە ڕۆژی ١٩٢٣/٦/٢٦ وە, لەگەڵ ئەوەی قەڵەمڕەوی حكومەتی كوردستان بەبەراورد لەگەڵ حوكمداری دووهەمدا , بەرتەسكتربوو بووە وە ((هنری دۆبس)) هەموو هەنگاوێكی نا بۆ دابڕینی (ڕانیە و قەڵادزێ و سەنگاو و چەمچەماڵ و هەڵەبجە و قەرەداغ و ماوەت ) لە سلێمانی "٣١" , شێخ بیری لە دەركردنی ڕۆژنامەیەك كردەوە تا ببێتە زمانحاڵی حكومەت و سیاسەتی ڕۆژانەی بخاتەڕوو، ئومێدی ئیستقلال لە ڕێگای ٢٥ ژمارەوە (١٩٢٣/٩/٢٠ تا ١٩٢٤/٥/١٥) شوێن و پێگەی گرنگی خۆی هەیە بۆ تۆماركردنی ڕاگەیاندنی كوردو ڕاگەیاندنی دژ.

واتەوات و پروپاگەندەی توركەكان لە لایەك و هێرشی ڕۆژنامەكانی سەربە ئینگلیز لە لایەكی ترەوە كاری لەسەر نووسەرانی (ئومێدی ئیستقلال و

بانگی حەق)، کە خەڵکیان پێ چەواشەکردبوو جارێکی تر نووسەری بە تواناو دیاری ڕۆژنامەکە (ڕەفیق حیلمی) دەبێتەسەر باسی ناو پروپاگەندەی دژو ناچارە بێتە دەنگ و بڵێ: ((کەس نەما بزانێ کە لێرەدا ئیختلاف ئەفکار چەندە فەلاکەتی بەسەر ئەم میللەتەدا هێناوە، لەبەر ئەمە مەسەلا مەوضوعەکەم لە ئیلاهیاتدا بێت تورکیزمەکان بە شیددەت دەس دەکەن بە پروپاگەندە و هەرچی خوا حەز نەکا پێم دەڵێن بە ئەنواعی عادیەتی‌و خیانەت ئیتهامم دەکەن میللەتیش فەقیرە زوو باوەڕ دەکا، قسەکانم حەق بێ و یا نا حەق بێ تەقدیر ناکرێ تەپڵی خیانەت بۆ من لێ ئەدرێ .... هتد)) "٢٢" ئەم سکاڵایەی نووسەر لەو حاڵەتەوە سەرچاوە ئەگرێ کە خەڵکی بە خوێندنەوەو بیرکردنەوە ئاشنا نین زیاتری کاریگەری واتەواتیان لەسەرەو تورك خواهان ناوەندێکی باشیان بۆ ئامادەیە تا دەنگی خۆیانی بۆ مەرامی خۆیان تێدا جاڕبدەن.

هەر لە هەڵدانەوەو خوێندنەوەی لاپەڕەکانی (ئومێدی ئیستقلال) دا، بەو ئەنجامە ئەگەین کە ڕۆژنامە دژە کوردەکان لە کاری دژایەتی نەوەستاون و ماشێنی پروپاگەندەیان لە کاردا بوو، بە تایبەت ڕۆژنامەی (العراق) کە خۆی و ئەو حیزبەی لە پشتی دەرچوونیەوەبووە، جێبەجێکەری سیاسەتی نوێی ئینگلیز بوون لە عێراقدا، هەر لەبەرئەوە وەك چۆن (عارف صائب، لە ڕۆژی کوردستان) دا بە وەڵامدانەوە بە خواست و مەرامی دوژمنانەیان ئاشنایی کردین، ((ئومێدی ئیستقلال)) ناچارە بەرامبەر بەو هێرشە بەردەوامەی ڕۆژنامەی (العراق) بێتە دەنگ ، پەیمان و بەڵێنەکانی ئینگلیز بخاتەڕوو کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لێی پاشگەز بوونەتەوە (عێراق) سلێمانی بە جوزئیی مەتەمیمەی عێراق نیشان داوە، موئەیدی ئەم ئیجتهادە ئێمە هیچمان بۆ نادۆزرێتەوە، زۆر ئارەزوو ئەکەین ئەلعراق مناسبەتی ئیرطباتی لە بەینی کوردو عەرەبدا چیە بۆمان ئیضاح بکا.....

حەتتا دوو سێ ساڵ لەمەو پێش حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا، ئەم جیهەتەی خستەبەر نەظەرەوە بۆ ئیرطبات و عەدەم ئیرتباتی ئیستمزاجی فیکری کردین کە ئیلحاقمان بکات بە عێراق بە کوللی جواب درا (لە لامان

باش نییە ، قبوولّ نەکرا، لەسەر ئەوە حاکمی سیاسی مێجەر گوڵد سمث مثقەفەو بە ئەمری جەنابی فەخامەتی مەندووبی ئەسامی بۆ موحافەظەی قەومیەتی خۆمان وەعدی داینیّ، نازانین ئەمڕۆ چ حاڵێکی ئیداریەو، ئەم حەقە حەیاتییەی ئێمەی ئیسقاط کردووە ... هتد) "٣٣" وەك لە چەند وتارێکی تریشدا دەرئەکەویّ، نووسەرە عەرەبەکان کە پێش ڕووخانی دەسەلآتی عوثمانی ، تاڕادەیەك هاوسۆزی نەتەوە ژێر دەستەکان بوون بەلآم لە دوای ئەوەی قەڵەمی ئەسارەتیان کرایەوەو هەلومەرجی دوای شەڕ،دەفەتێکی نوێی بۆ ڕەخساند کە بە زمانی خۆیان، خواستە نیشتمانیەکانیان دەربڕن و دەوڵەتی سەربەخۆ دروست بکەن ، کەوتنە دژایەتی کوردو ئەوەی بۆ خۆیان بە ڕەوایان ئەزانی بۆ خەڵك و میللەتانی تر بە تاوان و کفرو هەڵگەڕانەوە، بە داخەوە تا ئەمڕۆش ئەو دەنگ و قەڵەمانە کەم نین کە وەك ڕۆژنامەکانی سالآنی بیستی سەدەی پێشوو بیرئەکەنەوە و ئەنووسن ئەم هەموو کارەسات و ڕووداوە تۆقێنەرانە نەبۆتە پەندو هۆکاریّ بۆ خۆداچوونەوە، ڕەفیق حیلمی لە وتاری (موشابەهەت) دا ئەو ڕابووردووە بە بیر نووسەرانی عەرەب ئەهێنێتەوە کە لە یەك سەنگەرەوە بۆ یەك دواڕۆژ لەگەڵ کورددا ئەیانڕوانیەو کەچی ئێستا خۆیان بیرچوّتەوەو ڕۆڵی داگیرکەرو دەسەلآتی نویّ ئەبینین، بە وردی نموونەی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئیستقلال) "٣٤" ئەهێنێتەوە کە پێشتر هاوڕێی بووە لەلایەك مەکتەبی عەسکەری تورك دەرچوون، ئەو سەرنووسەری (ئیستقلال) ە کەلە بەغدا دەرئەچیّو ئەم سەرنووسەری (ئومێدی ئیستقلال) ە لە سلێمانی، لە کۆتایی وتارەکەدا ئەپرسیّ ((ئەو ذاتە وەکوو من و منەوەرانی عەرەبیش وەکوو مونەوەرانی کورد، دەرحەق بە میللەتی ئێمە صاحێبی حسیاتێکی صەمیمین یان نەو ؟ یەعنی صادقن بە پرەنسیبی میللەت و موجادەلاتی ئێمەیان تەقدیرو تەصویب کردووە ، یاخود بە ثانقەی مەنا فیعی خۆیانەوە، دەیانەویّ ئەو پرەنسیبەی کە خۆیانی نەجات داوە لە ئەسارەت سوئی ئیستعمال بکەن...)) "٣٥"

هەر ئەو بۆچوونەی رەفیق حیلمی دروست دەرچووەو تا ئەمڕۆ بەشێکی زۆر لە نووسەرو شاعیرانی عەرەب، لە ڕاگەیاندنەکانی خۆیانەوە، بەرپەرچی خواستەکانی کورد ئەدەنەوە بە دەگمەن لەو بازنەی خۆ بەزل زانین و میللەتانیتر بە کەم زانین دەربازبوون و تەنانەت مەرگەسات و ڕەشەکوژی و کوژ و کیمیاباران – ئەو قورسایەی لە کەناڵە عەرەبییەکاندا نەبووەو بە ویژدانی نووسەرو بیرمەندەکانیاندا ڕۆنەچووەو ئەمەش کاریگەری ئەو ڕاگەیاندنی دژەیە کە لە پاڵ هێرشی سەربازی و سوتماکی کوردستاندا بێ وچان لە کاردا بووەو ئەگەرچی ئاوازەکەی گۆڕا بێت بەڵام مەبەست و ناوەڕۆکەکەی هەریەك بووە.

بە کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی شێخ ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال)یش ئاوابوو، ئەو دەنگەش کە تەنیا وەڵامی ڕاگەیاندنی دژ بوو تاساو بە دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) لە ١٩٢٤/٨/١٨ ئینگلیزەکان ڕاستەوخۆ کەوتنە پیادەکردنی سیاسەتی عێراقچێتیو ئەم ڕۆژنامەیە تەواو پێچەوانەی ڕۆژنامەکانی سەردەمی حکومداری یەکەم وتارو شیعرو پروپاگەندەی بڵاوئەکردەوە، کە باس و شیکردنەوەی ناوەڕۆکی (ژیانەوە) خۆی لە خۆیدا پێویستی بە توێژینەوەیەکی سەربەخۆیە.

# ئه نجام

به گەڕانەوە بۆ ڕۆژنامەکانی یەکەمین دەسەڵاتی سیاسی کورد لە سەدەی بیستەمدا، بە ڕابەری شێخ محموودی حەفید, وەك سەرچاوەیەکی ڕەسەن, زۆر لایەنی شاراوەو یان باس نەکراو بەدی ئەکەین کە پێویستی بە لێدوان و نووسینە, بە تایبەت لە بواری ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی دژدا، وەك ئاماژەمان پێدا، ململانێی سیاسی ئەو ڕۆژگارە جگە لە شەڕو پێکدادانی چەکداری کە هەڵچوون و داچووندا بووە، هەندێ جار پەنا بۆ ڕۆژنامە براوەو زۆر جاریش بۆ شێوازی زارەکیو واتەوات و توانج و قسەی ناو خەڵکی، ڕۆژنامەکانی ئەو قۆناغە (بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، بانگی حەق، ئومێدی ئیستقلال) وەك ئەزموونێکی نوێی ڕاگەیاندنی نووسراو، هەوڵیان داوە بەپەرچی ئەو ڕاگەیاندنی دژە بدەنەوە کە بە شێوازی جۆراو جۆر لەلایەن ئینگلیزو تورکەوە ئاراستەی دەسەڵاتی کورد لە باشووری کوردستان کراوە, بە مەبەستی قێزەونکردنی لە دیدی خەڵکداو لاوازکردنیو دواتر لکاندنەوەی بە عێراقی دروستکراوی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کە ئەنجام ئەم هەوڵەی ئینگلیز بە چەك و بۆمباران و پروپاگەندە سەری گرت و ئەو ئاواتەی کورد نەهاتە دی ، جێی ئاماژەیە ڕۆژنامەنووسانی کورد لەو ڕۆژگارە سەخت و پڕ پیلانی سیاسیو سەربازیدا، زۆربەئارامیو سەنگینانە نووسیویانەو بێ ئەوەی سوێندی ڕۆژنامەنووسیی یان خواردبێ یان یاساو ئیتیکی ڕۆژنامەنووسی بزانن, بەویژدانەوە پەیوەست بوون بە هەموو ئاکارێکی ڕۆژنامەنووسیی ڕاستگۆو بەرپرس وخاوەن کێشەیەکی سیاسی چارەنووس سازەوە, هەوڵیان داوە بە بەڵگەو گفتی مێژوویی ڕاستیەکان بسەلمێنن و خۆیان نەخزاندۆتە ئاستی زیادەڕۆییو هەڵخڵەتاندن و چەواشەکاری, نووسینەکان دوورن لە

سـۆزگەرایی‌و ڕەخنـەی ڕۆژنامەیـەکان هاوسـەنگی خۆیـان پاراسـتووە, کـە ئەمەش شانازیەکی زیاترە بۆ ڕۆژنامەیەك کە بە ڕاستی حەق بێژی نەتەوەیەك بێـت کـە لەگـەڵ هـەموو گۆڕانکاریـەکی سیاسـی‌دا هـەوڵی سـەربەخۆیی‌داوە, دستەبژێر لەو قۆناغەدا کەمینـە بوون، نـویٚ بوون لـە بواری ڕۆژنامەنووسـی‌و بەرپەرچـدانەوەی ڕاگەیانـدنی دژدا، وتـارو بۆچـوونەکانیان نابەرامبـەر بـووە، بەرامبەر ئەو هێرشە بەبەرنامەیەی کە ئینگلیزو تورك ئامادەیان ئەکردو هێـزی سەربازی‌و دارایی لە پشتەوە بووە.

ئەزموونی ئەو کێبڕکیٚ یە لە نێوان خواستی سەربەخۆیی‌و مەرامی داگیرکەرانـدا, تـا ئـەمڕۆ بەردەوامـە، جارێکی‌تر کۆمـەڵی کـوردەواری پێویـستە بەبیرو هەسـتی نەتـەوەیی تـەیار بکرێـت و لـە ڕێگـای زمـانی میللـەتانی تـرەوە خواسـتەکانی بڵاوبکاتـەوە تـا ئـەو گەمارۆیـە بـشکێنیٚ, پێویـستە وەك مێـژوو خـەباتی ڕۆژنامەنووسی‌و سیاسـی ڕۆژنامەنووسـانی وەك (عـارف صـائب) و (ڕەفیق حیلمی) بەرز بنەرخێنین و یادیان بە زیندووی بهێڵینەوە.

## پەراوێزو سەرچاوەکان:


١. د. عبداللطيف حمزة, الاعلام تاريخه و مذاهبه، ١٩٦٩، ص ٢٣.

٢. بڕوانە د.كمال مظهر احمد،كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى, بغداد ١٩٨٤، ص ١٨٥-١٨٧.

٣. ئاكۆ عبدالكريم شوانى، سلێمانى ١٩١٨-١٩٣٢، سلێمانى، ٢٠٠٢، ل ١٢١.

٤. فاروق على عمر, ڕۆژنامەگەری کوردی لە عێراقدا, بەرابییەکان ١٩١٤،١٩٣٩، ل ٨٤.

٥. ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)، ژ ١٢، س[١] ،١٩٢٠.

٦. بڕوانە: پێشکەوتن ژمارەکانی ١, ٣ , ٢١ .

٧. بڕوانە: پێشکەوتن ژمارە ١١، سەروتار.

٨. کەریم شەریف قەرەچەتانی، گۆڤاری ڕێبازی نوێ، ژ ١٠، س ١٩٩٦, ل ٩٩.

٩. هەر ئەو سەرچاوەیە ل ١٠٠.

١٠. ئاکۆ عبدالكريم, سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٤.

١١. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١.

١٢. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥١.

١٣. بڕوانە: ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ژمارەی ٢,٤,٥ ساڵی ١٩٢٢

١٤. بڕوانە: (بانگی کوردستان) ژ ٢، ڕۆژی ١٩٢٢/٨/١٤

١٥. بڕوانە: (بانگی کوردستان) ژ ٦ ، ١٨/ایلول/١٩٢٢ . وتاری بدایەتی انقلاب بۆ انتباه کوردان .

١٦. بڕوانە: نوزاد علی خدر، کاریگەری ڕاگەیاندن لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری خوێندکارانی زانکۆ، باسی دەرچوون، بەشی کۆمەڵناسی قۆناغی چوارەم چاپ نەکراوە، ساڵی ٢٠٠٢ ل ٢٢

١٧. بانگی کوردستان، ژ ٥، ١٩٢٢/٩/٤

١٨. بانگی کوردستان، ژ ١٠، ١٥ ت ،١٩٢٢

١٩. بانگی کوردستان، ژ ١١، ٢٠ ت / ١٩٢٢

٢٠. هەر ئەو سەرچاوەیە.

٢١. بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: د.محمد دلێر امین میسری، ڕۆژنامەنووسی کوردیو بزووتنەوەی ئەدەبی لە سایەی یەکەمین دەسەڵاتی سیاسی کوردا ١٩٢٢-١٩٢٤، لە چاپکراوەکانی شارەوانی سلێمانی، ژ ٣٨، ساڵی ٢٠٠٤

٢٢. بڕوانە: ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان، ژ١، ١٥ت /١٩٢٢.

٢٣. ڕۆژی کوردستان، ژ ١٠، ك ١٩٢٣.

٢٤. ئەم زانیاریە لە وەرگێرانی وتارێکی (باترك کۆکبیرت) وەرگیراوە کە لە ڕۆژنامەی ئەندیپێندت بلاوکراوەتەوە، د.طاهر احمد عارف لە کۆلێجی زانست – زانکۆی سلێمانی کردوویەتی بە عەرەبیو بە سوپاسەوە وێنەیەکی دامێ .

٢٥. ڕەفیق صالح، سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر، ١٩٢٣-١٩٢٤، وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی ٢٠٠١، ڕۆژنامەی بانگی حەق، ژ ١، ل١٢ (دەستکاری ڕێنووس کراوە م.د)

٢٦. بڕوانە: هادي طعمة، (الاحتلال البريطاني و الصحافة العراقية، دراسة في الحملة الدعائية البريطانية في ١٩١٤-١٩١٨) بغداد ١٩٨٤ , ص ١٠٥

٢٧. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ١١٨

٢٨. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ١٣١

٢٩. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ١٣٦

٣٠. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص ١٤١

٣١. ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٣

٣٢. ئومێدی ئیستقلال، ژ ٦، ٢٥، تشرینی یەکەم ١٩٢٣

٣٣. ئومێدی ئیستقلال، ژ ١١، ٢٩، تشرینی دووەم ١٩٢٣

٣٤. ڕۆژنامەی (ئیستقلال)، خاوەنەکەی (عبدالغفور البدری ) بووە ژمارەیەکی لە بەغدا ڕۆژی ١٩٢٠/٩/٢٨ دەرچووە. زۆر بایەخی بەخواستی نەتەوەیی عەرەب داوە، لە ئاست داواکانی کوردا نەك بێ هەڵوێست بووە، لە هەندێ ژمارەدا هێرشی کردۆتە سەر کورد ، تەنیا لە ڕۆژانی کێشەی ویلایەتی موسڵدا هانی کوردی داوە هەوڵی لکاندنەوەی موسڵ بدەن بە عێراقەوە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: صالح محمد حاتم، صحيفه الاستقلال ١٩٢٠-١٩٣٢، رسالة ماجستير بغداد ١٩٨٥.

٣٥.ئومێدی ئیستقلال، ژ ١١، ٢٩ / تشرینی دووەم١٩٢٣

# آراء موضوعية عن شيخ محمود الحفيد (البرزنجي) ومطالبه القومية

❖ أ . د . عبدالفتاح علي البوتاني(*)

---

(*) جامعة دهوك، مركز الدراسات الكُردية.

ولد الشيخ محمود بن الشيخ سعيد البرزنجي سنة ١٨٨٤ في اسرة عرفت بتوجهها الديني والتصوفي، ظهرت بعد انهيار امارة بابان الكوردية سنة ١٨٥٠، وبرزت كاسرة متنفذة بعد تولي السلطان عبدالحميد الثاني الذي حكم الدولة العثمانية خلال المدة (١٨٧٦- ١٩٠٩)، فقد حظيت برعايته، وساهمت الاسرة بناء" على دعوته في الحرب الروسية-العثمانية سنة (١٨٧٧- ١٨٧٨)، عندما قاد الشيخ سعيد مريديه في القتال، وكانت تلك المشاركة اول مشاركة للاسرة في الحياة السياسية المستندة الى السمعة الدينية.

كان الشيخ سعيد مقرباً من السلطان عبدالحميد، وقد حصل بواسطته على مساحات شاسعة من الاراضي الزراعية، وعلى عدد من القُرى، وتوطدت علاقته حتى انه زار استنبول سنة ١٩٠٤، مصطحباً معه نجله الشيخ محمود، والاهم من هذا، ان السلطان عبدالحميد منحه الرموز الجفرية (الشيفرة) للاتصال برقياً في حالة حدوث طارىء في السليمانية، ويفسر هذا ان كبار موظفي الدولة اخذوا يتوددون اليه ويسعون لكسب رضاه. وقد عزز هذا مكانته الاجتماعية والاقتصادية والسياسية في المنطقة.

ان العلاقات الوطيدة بين اسرة شيوخ البرزنجة والسلطان العثماني عبدالحميد كانت محط سخط ومعارضة الكثير من اهالي السليمانية، ولاسيما التجار والمثقفين منهم ، لأن عهد هذا السلطان تميز بالاستبداد والتخلف وبملاحقة المعارضة، ومنها الكوردية، وقمعها بلا هواده، هذه العلاقات غدت مشكلة للشيخ سعيد واسرته بعد الانقلاب (الثورة) الدستوري في ٢٣ تموز ١٩٠٨، الذي اجبر عبدالحميد بالحكم وفق دستور، بعد (٣٠) سنة من الحكم الفردي الاستبدادي.

اخذ اهالي السليمانية، لاسيما اعضاء فرع جمعية الاتحاد والترقي (التركية)، واعضاء "كورد تعاون وترقي جمعيتي" ينظرون الى الشيخ سعيد

باعتباره أحد رموز عهد الاستبداد والتخلف الحميدي (١٨٧٧-١٩٠٨)، ورأوا فيه خطراً يهدد مصالحهم فلابد من تصفيته، وقد نجحوا فعلاً بتأليب السلطات عليه فقامت بابعاده من السليمانية الى مدينة الموصل حيث قتل هناك هو ونجله الشيخ احمد بطريقة مأساوية ومهينة في ٤ كانون الثاني ١٩٠٩، ونجا الشيخ محمود باعجوبة من القتل، واعادته السلطات العثمانية (الاتحادية) في مدينة الموصل الى السليمانية في نهاية كانون الثاني ١٩٠٩، لتعيد الى المنطقة الهدوء بعد الاضطرابات التي شهدتها اثر مقتل الشيخ سعيد.[١]

لم يكن للشيخ محمود الى يوم مقتل والده وشقيقه، دور يستحق الذكر في الحياة السياسية والاجتماعية، الا ان ذلك الحدث وتداعياته دفعت به الى واجهة الاحداث السياسية فيما بعد، ووضعته-بعد ان حل محل والده-أمام مسوولية جديدة لم يسبق له عهد بها.

وكانت اول مشكلة واجهها مع السلطات العثمانية، حادثة مقتل عبدالله افندي الحاج ابراهيم من اهالي كفري وفي ظروف غامضة، وكان القتيل هو والد بهاء افندي الذي كان السبب في حادثة مقتل الشيخ سعيد في الموصل[٢]، فاتهم الشيخ محمود بتدبير قتله، واصدرت السلطات حكماً غيابياً بالسجن ثلاث سنوات بحقه، الا ان تعقبه كان شكلياً.

ويصف رفيق حلمي حياة الشيخ خلال المدة قبل الحرب العالمية الاولى في ٢ آب ١٩١٤، قائلاً: ان اليأس والاحباط دب في نفسه، فكان يقضي اغلب ايامه متجولاً في قراه ومزارعه في ضواحي السليمانية، وكانت تلك الاحداث

---

[١] للتفاصيل ينظر: عبدالرحمن ادريس صالح البياتي،الشيخ محمود الحفيد(البرزنجي)، والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥،(لندن،٢٠٠٥)ص٣٣-٦٠.

[٢] بهاء افندي من اهالي كفري(الصلاحية) وكان حينذاك رئيس دائرة انحصار التبغ في الموصل، وخلال تجوال نجلي الشيخ سعيد معه في اليوم الثاني من عيد الاضحى سنة ١٩٠٩ تعرض، وكان ثملا"، لأحدى النساء في ساحة باب الطوب بالموصل، وادت تداعيات تلك الحادثة الى مقتل الشيخ سعيد ونجله احمد. للتفاصيل ينظر:عبدالمنعم الغلامي،الضحايا الثلاث (الموصل،١٩٥٥)ص٥-١٨،البياتي،المصدرالسابق،ص٥١-٥٤.

والتطورات عاملاً مباشراً في اظهاره بمظهر من اصيب بالضيم، بفعل الاعتداء عليه من اطراف عدة، فكان لذلك اثره في تألق نجمه، والتفاف الناس حوله.[3]

المهم في الامر، ان الشيخ خلال المدة المذكورة التي دب فيها اليأس والاحباط في نفسه، بدأ وعيه يتفتح على الافكار القومية الكوردية المعادية لتوجهات الحزب الحاكم جمعية الاتحاد والترقي التركية (الطورانية)، هذا فضلاً عن انها كانت وراء تدبير مقتل والده وشقيقه. وهذا يفسر اتصاله في سنة ١٩١٣ باولاد بدرخان باشا البوتاني المعروفين بتوجهاتهم القومية الواضحة، كما اخذ يتصل في السنة نفسها بالقنصل البريطاني في الموصل وبالقنصل الروسي في بغداد، وابدى لهما استعداده للانتفاضة ضد الدولة العثمانية اذا قدموا المساعدة للكورد.[4]

ومن المدهش والمثير للتأمل، انه مع الحقد الذي كان يكنه الشيخ للاتحاديين، الا انه ما ان اندلعت الحرب العالمية الاولى، حتى كان في مقدمة المتنفذين والوجهاء الكورد الذين استجابوا لنداء الجهاد (العثماني) ضد البريطانيين، ناسياً السياسة المهينة للدولة العثمانية ضد الحركة الوطنية الكوردية في مرحله ماقبل الحرب. وقتلها لوالده وشقيقه ايضاً.

لقد قاد الشيخ محمود المئات من المقاتلين الكورد في مطلع سنة ١٩١٥ تلبيه لنداء الجهاد، الى منطقة الشعيبة في اقصى جنوب العراق لمقاتلة القوات البريطانية، وفضلاً عن الدافع الديني، فقد كان هناك عاملان آخران لاقدامه على ذلك التحرك، اولهما ان الدولة العثمانية رفعت عنه تهمة قتل والد بهاء افندي، وثانيهما انه كان يأمل إعادة مكانة اسرته وامتيازاتها في حالة انتصار العثمانيين. ولكن ما ان بدأت تلوح في الافق ملامح انهيار الدولة العثمانية، حتى اتصل بالقوات البريطانية عندما وصلت الى منطقة كركوك في ٧ آيار ١٩١٨، فقد اخذ يراسلها طالباً الاتفاق معها من اجل الاعتراف بحقوق الكورد القومية، فبادرت الى تعيينه حاكماً على السليمانية على ان يحكم باسمها.

---

[3] نقلا" عن البياتي، المصدر السابق ، ص٥٨ .

[4] المصدر نفسه، ص٧٧-٧٨.

هكذا يبدو ان الدور الرئيسي للشيخ محمود في الحركة القومية التحريرية الكوردية، قد ظهر بعد الحرب العالمية الاولى، وبالتحديد عندما انسحبت الدولة العثمانية من السليمانية واضطرارها الى تعيينه حاكماً (عثمانيا) على المنطقة، وعندما وصل الميجر نوئيل السليمانية في تشرين الثاني ١٩١٨ واعترافه بالشيخ حاكماً من قبل بريطانيا، الا ان تلك السياسة لم تدم طويلاً بتعيين الميجر سون بدلاً من نوئيل، فقد أخذ سون يحرض العشائر ضده ويحاول تحديد سلطته، فكانت النتيجة ان اعلن الشيخ نفسه حاكماً على كوردستان واقدامه على انزال العلم البريطاني من على مبنى ادارة الاحتلال وتمزيقه، ورفع بدلاً عنه علماً" آخر"، ولكن سلطات الاحتلال البريطاني تمكنت اخيراً من دحره واسره بعد جرحه، واحتلال السليمانية في ١٨ حزيران ١٩١٩، واصدرت الحكم باعدامه الا انه استبدل بنفيه الى الهند سنة ١٩٢١.

وهناك حقائق تسترعي الانتباه كشفت عنها الوثائق المضبوطة في السليمانية بعد احتلالها في حزيران ١٩١٩،واهمها غياب الحديث عن القومية والاستقلال والوطنية الكوردية ، ويقول درايفر (ضابط في الحملة البريطانية على كُردستان) بهذا الصدد: (لم يكن هناك أي ذكر لدوافع وطنية كوردية في الرسائل والوثائق المكتشفة، كان أتباع الشيخ يستنهضون الهمم وينتخون لنداءات الدفاع عن الاسلام))[٥].

ان الخلفية التأريخية السياسية لاسرة الشيخ محمود تظهر بشكل جلي، بأنه اول من اهتم بالشوون السياسية الكوردية في اسرته، وان هناك جملة اسباب دفعته الى هذا المجال، وان هذا يفيدنا في ان نقيم مطالب الشيخ القومية تقييماً موضوعياً، وان دراسة موضوعية للشيخ ومطالبه القومية، لابد ان تدرس من خلال الاطار التاريخي الذي وجدت فيه، وفي تقييمنا لتطور تلك المطالب، لانشكك ابداً في اخلاص الشيخ الثائر وفي حكمه الوطني القصير، فالشيخ، كما قال عنه مؤرخ العراق الملكي (١٩٢١-١٩٥٨) عبدالرزاق الحسني: انه تاريخ القضية الكوردية، "وان القضية الكوردية هي الشيخ محمود نفسه".

---

[٥] جرجيس فتح الله، يقظة الكرد ،تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥ ومما يتناول النزاع على جنوب كردستان امام عصبة الامم مع الوثائق والمذكرات المتعلقة به (اربيل ،٢٠٠٢) ص٢٢٧.

## تطور مطالب الشيخ محمود القومية :

لقد مرت مطالب الشيخ القومية بعدة مراحل وحسب تطور الاحداث وتغير شكل الحكومات العراقية، وبالامكان حصرها في ثلاث مراحل هي: (١٩٢٢-١٩٢٧) و(١٩٢٧- ١٩٣١) و(١٩٣١- ١٩٤١) ولم يتمكن الشيخ خلال هذه المراحل من ان يمد نفوذه العسكري او الادبي والمعنوي وبشكل مؤثر الى مناطق بعيدة عن السليمانية، اي انه بقى زعيماً محلياً لم يحظ بتاييد غالبية الكورد حتى في منطقته.

كما لايمكن ان نتصور ان الشيخ كان ذو افكار قومية متقدمة، لأن نشأته كانت اساسها الالتزام بالتعاليم الاسلامية والتقاليد الاجتماعية الكوردية السائدة حينذاك، وقد اثر هذا بشكل فعّال في ادراكه للامور وتحليله للمواقف السياسية، وربما يفسر لنا هذا ان مطالبه تراوحت بين مطلب (الحكم الذاتي) ثم تأسيس مملكة كوردية مستقلة في جنوب كوردستان وأعلان نفسه ملكاً" عليها، والمطالبة بتأسيس دولة كوردية تمتد من زاخو الى مابعد خانقين تحت الانتداب البريطاني، واخيراً تراجعه مضطراً الى القبول بالعيش في قريته والسماح له باداء صلاة يوم الجمعة في السليمانية.

(١) المرحلة الاولى ١٩٢٢- ١٩٢٧:

بعد الانتصارات التي حققها الكماليون (نسبة الى كمال اتا تورك)، وصلت رواندوز في آيار ١٩٢١ مفرزة تركية وبدات بالتعاون مع العشائر الكوردية باعمال عسكرية ضد النفوذ البريطاني، وفي ١٧ آذار ١٩٢٢، عينت الحكومة التركية رمزي بك قائمقاماً على رواندوز، ووصلها في نهاية آيار، ثم جاء بعده العقيد علي شفيق المصري الملقب بأوزدمير(منكب الحديد) ، ولأن الاتراك كانوا حذرين جداً من احياء فكرة استقلال كوردستان ، وخائفين من ان يقدم الانكليز على خطوة من هذا القبيل، اخذوا يثيرون المشاعر الدينية لدى الكورد، اضعف النقاط في الدرع الكوردي على حد قول جرجيس فتح الله[٦]، ووقفت معظم عشائر المنطقة معهم.

---

[٦] المصدر نفسه ،ص١٨١.

اخذت سلطات الاحتلال البريطاني، مقابل النشاط التركي وللقضاء عليه، تشجع على اثارة الشعور والفكرة القومية لدى الكورد، وتروج لعودة الشيخ محمود الى السليمانية، فوصلها فعلاً في ٣٠ ايلول ١٩٢٢ ولاقت عودته معارضة شديدة من الملك فيصل وعبدالمحسن السعدون، وبعد وصوله اصدر مرسوماً حكومياً أعلن فيه– وبدافع قومي طبعاً– تشكيل حكومة كوردستان في تشرين الاول ١٩٢٢، وفي ١٨ تشرين الثاني اتخذ لنفسه لقب ملك كوردستان، واعلن عن قيام مملكة كوردستان في السليمانية. كل هذا خلافاً للشروط التي كان قد اتفق عليها مع بريطانيا لقاء عودته ، ومنها: تعهده بالدفاع عن السليمانية والحيلولة دون وقوعها بيد الترك، وتعهده بطردهم من الاجزاء الاخرى، وعدم التدخل في شؤن كركوك واربيل.[٧]

وكشفت الأحداث اللاحقة انه استعجل كثيرا" في تصرفاته، ولم يظهر حصافة او يفكر بالنتيجة المحتومة في مواجهة لاتكافؤ فيها.

اما العلم الذي رفعه الشيخ فقد كان اكثر اثارة ، لانه تميز بطابع ديني اسلامي وشبيه بالعلم العثماني، ارضية خضراء داخلها هلال احمر يحضن قمراً (ابيضا") كل ذلك تقربا" الى تركيا التي التزمت الصمت ازاء ما اقدم عليه، لانها كانت قد احاطته بمجموعة تنتمي الى التيار الكمالي، وكان معظمهم من الموظفين، السابقين في الجهاز الاداري العثماني، اوضباطاً سابقين في الجيش العثماني المنحل، وشغل عدد منهم مناصب معتمدة في حكومته، وكان لهم دور في ابعاده عن البريطانيين (الكفار) وتقريبه من الاتراك (المسلمين)[٨]

اما لماذا اعادته بريطانيا الى السليمانية، مع انها كانت تقول عنه بانه: قليل المعرفة ومعلوماته لاتتعدى معلومات طفل، وانه ماكر وحيال يحيط به أناس متملقين، وتكونت لديه قناعات غريبة عجيبة الى حد انه كان يتصور انه ملك كوردستان ؟!!، فيعود الى انه بدون مساعدته ودعمه لم تكن تستطيع

---

[٧] للتفاصيل ينظر: البياتي، المصدر السابق، ص٢٢٦–٢٢٨ " فتح الله، المصدر السابق، ص٢٥٥.

[٨] البياتي، المصدر السابق ، ص٢٨٠.

الحفاظ على مكتسباتها في المنطقة، ولم يكن ممكناً من الناحية الاقتصادية ارسال جيش للاستقرار بشكل دائم في السليمانية.

ان ماسبق وللتقليل من تأثير ما اقدم عليه الشيخ وتاكيدا" للدور الذي سيؤديه امام خطر النفوذ الكمالي، صدر بيان مشترك من قبل المندوب السامي البريطاني والحكومة العراقية في ٢٨ تشرين الثاني ١٩٢٢ تم بموجبه الاعتراف بقيام حكومة كوردية في جنوب كوردستان[٩]، وشكر الشيخ بريطانيا لاعترافها باستقلال كوردستان (الجنوبية)، ولكن بريطانيا لم تخف خشيتها من التأثير الذي سيتركه اعلان الشيخ نفسه ملكاً وتشكيل دولته الكوردية.

وفي الوقت الذي كان يأمل البريطانيون فيه من الشيخ محمود ان يقضي على النفوذ التركي في المنطقة، وربما لهذا غضوا النظر – ولو الى حين– عن اعلان نفسه ملكاً على كوردستان، اخذ الشيخ وبعد شهر من عودته الى السليمانية يراسل ويتصل بالسوفييت والاتراك، فقد كتب لاوزدمير يقول: "انا مستعد لاضحي بنفسي للجيش التركي، وانا مستعد للقبول بالحكم الذاتي في ظل العلم التركي. وفي تشرين الاول ١٩٢٢ كتب للقائد التركي فوزي بگ – وكان يعمل مع اوزدمير– يقول: اذا كان معك قوات كافية لاحتلال كركوك حتى جبل حمرين ، فتقدم على الفور، فسوف اكون جندياً مخلصاً للخلافة وسأسلم السليمانية لك". ولم يكلف الاثنان نفسيهما بالرد عليه ، كما لم يفصح الاتراك عن اعطاء اية حقوق قومية للكورد لان الحركة الكمالية لم تعترف بشرعية معاهدة سيفر اصلا"، ولأنها بنت دعايتها عند الكورد على الاساس الديني[١٠]، وعلق اوزدمير– الذي كان قد زار السليمانية مع عدد من الضباط الاتراك–على مواقف الشيخ قائلاً: الشيخ اداة بيد البريطانيين، ثم هو متطوع للموت من اجل تركيا، نحن لانريد هذا الشيخ فهو رجل محتال.

---

[٩] ينظر نص البيان في: د.حسين بديوي، خطوة الى البيت الكوردي الكبير، دراسة في الوثائق البريطانية ، (اربيل ،٢٠٠٦) ص٧٩.

[١٠] فتح الله، المصدر السابق ، ص٢٢٧ " سروه اسعد صابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤–١٩٢٦ (اربيل، ٢٠٠١) ص٢٤٢–٢٤٥.

اما السوفييت الذين لم يردوا على رسائله ايضاً، فقد كتب لهم الشيخ يهاجم السياسة البريطانية وقمعها للكورد، طالباً منهم مساعدته بالسلاح لتحقيق الاعتراف الرسمي بحقوق الكورد القومية.

ان اتصالات الشيخ محمود بالاتراك وبالسوفييت، والتي كان يعتقد انها تخدم القضية الكوردية، قد اثارت قلق سلطات الاحتلال البريطاني، واعتبرتها لعبة خطيرة، وفي حالة نجاحها ستفقد زمام الامور في كوردستان، لذا استدعته فوراً الى بغداد في شباط ١٩٢٣ للتباحث، الا ان الشيخ رفض الحضور ويرى جرجيس فتح الله: ان سبب اتصالاته بالاتراك كان اعتقادا" منه بأن الادارة البريطانية لم تعد قوية الى الحد الذي يمكنها املاء رغباتها عليه، او لأن الادارة البريطانية لاتنوي الوفاء بوعدها في انشاء كيان كوردي مستقل يقوم هو على رأسه، ويعلق فتح الله على تصرف الشيخ هذا قائلا": ها هنا خطأ كبير في الحساب يقع فيه الشيخ ، فلم يعد يستطيع تدبر العواقب التي تنجم عن مواجهة دولة عظمى[١١].

المهم في الامر، ان العلاقة بين الشيخ والكماليين كانت احد ابرز الدوافع البريطانية لانهاء دوره السياسي في المنطقة، وعلى هذا الاساس استدعته في شباط ١٩٢٣ للحضور الى بغداد للتباحث حول مضمون بيان الحكومتين العراقية والبريطانية في حق الكورد بتشكيل حكومة كوردية ضمن حدود العراق، وعندما رفض الشيخ الحضور، توجه البريطانيون نحو طه الشمزيني الذي ابدى رغبته بالتصدي للكماليين، ونشروا في ٢٤ شباط ١٩٢٣ بلاغاً اعلنوا فيه ان الشيخ لم ينفذ الشروط التي عاد بموجبها الى المنطقة، وشهدت السليمانية قصفاً جوياً مركزاً في ٣٠ اذار ١٩٢٣، ثم دخلت القوات البريطانية المدينة في اواخر تموز ١٩٢٤ بعد ان غادرها الشيخ محمود ليواصل القتال على شكل (حرب العصابات).

ومن المثير للتأمل ان الشيخ التزم الصمت والسكينة اثناء وجود اللجنة التحقيقية الخاصة بمشكلة ولاية الموصل في مدينة السليمانية، فقد بدأت تلك اللجنة اعمالها في السليمانية في اجواء هادئة للغاية، بينما كانت السلطات

---

[١١] فتح الله، المصدر السابق، ص٢٢٣.

البريطانية خائفة جداً من ان يظهر الشيخ فجأة ويفشل اعمال اللجنة، او ان تطلب اللجنة شهادته امامها بعد استقدامه تحت حمايتها، ولكن ما ان غادرت اللجنة المنطقة حتى عاد الشيخ الى "تكتيكه الحربي" على حد القول ادموندز[١٢] والتي امتدت الى مابعد حسم مشكلة الموصل في ايلول ١٩٢٥ لصالح العراق.

ظلت علاقات الشيخ خلال المدة (١٩٢٦- ١٩٢٧) متوتره مع سلطات الاحتلال البريطاني وصنيعتها الجكومة العراقية، فقد ظل يطالب باستقلال الكورد، وتأسيس دولة كوردية، وفي اللحظات التي كان يفقد فيها الامل، كان يحزن لما آل اليه مصير الكورد، فقد كتب في ٩ تشرين الاول ١٩٢٦ الى كورنواليس يقول: ان تقرير مصيري ليس مهماً، ولكن لا استطيع ان أرى ان يتبدد آمال الكورد التي كرست حياتي من اجلها.

وعندما فقد الشيخ الامل وسيطر عليه اليأس، طلب في تشرين الثاني ١٩٢٦ باعادة املاكه المصادره فقط ووافق على الشروط التي املتها عليه السلطات في ١٩ كانون الثاني ١٩٢٧، وهي:

(١) ان يعيش مع اسرته في قرية بيران في كوردستان ايران.

(٢) ان يمتنع عن التدخل في الشؤون السياسية

(٣) ان يرسل احد اولاده للدراسة في بغداد. وبالمقابل تعهدت الحكومة العراقية باعادة جميع املاكه وسمحت له بتعيين وكيل يديرها. وزار الشيخ بغداد في تموز ١٩٢٧، وسلم ابنه هناك.[١٣]

وقبل نهاية الحديث عن هذه المرحلة من الحياة الشيخ محمود السياسية ومطالبه القومية ، لابد من الاشارة الى سلوكه السياسي الذي تميز بعدم الاستقرار، وحال دون تبلور رأى عام كوردي عنه، وعن عدم استقراره السياسي وسط تلك الاجواء المتوترة.

---

[١٢] للتفاصيل ينظر: البياتي، المصدر السابق، ص٣٧٤ " فتح الله، المصدر السابق ،ص ٣٥٧.

[١٣] للتفاصيل ينظر: نوشيروان مصطفى امين، كردستان العراق،عصر القلم والمراجعات ١٩٢٨-١٩٣١ ، (السليمانية ، ٢٠٠٠) ص١٦٠-١٦٧.

مێژوونووسـانی کـورد و خوێنـەرانی کـورد وەهـا هـاتووە کـە(نۆئیـل)جیـا لـە کاربەدەسـتە بەریتانیـەکانی تـر ، نـەرم و نیـان بـووە لەگـەڵ شـێخداو هـەتا دڵسۆزی نەتـەوەی کـوردیش بـووە ، بـەڵام لەراسـتیدا ئـەو بۆچـوونانە دوورن لەراسـتیەوە ، (گرترودبیـل)ی کەسـایەتی ناسـراوی بـاڵا دەسـتی نێـردراوی حکومـەتی شاهانەی بـەریتانیا لـەناو حکومـەتی پاشـایەتی مەلیك فەیسـەڵی یەکەمــدا ، لەلاپــەڕە(٤٤٥)ی کتێبەکەیــدا (العــراق في رســائل المــس بيــل)دا نووسـیویێتی"لەهەفتـەی یەکـەمی مـانگی ئـەیلولی ١٩٢٢دا ، شـێخ مەحمود گەیشتە بەغدا ، بەم هاتنە مێجەرنۆئیل زۆر پەشۆکاو ڕازی نەبوو پێی وابوو کە شێخ کاروباری سلێمانی نەگرێتە دەست و هێمنی ناوچەکە بەو شێوەیەی جاران بێت"[٤] . مەبەستی ناوبراو لەدێڕی کۆتـایی ( ناوچەکە بەو شێوەیەی جاران بێت)ئەوەیە وەك ئەو کاتە بێت ، شێخی لێ نەبووە کە دوور خرابووەوە بـۆ هیندسـتان ، هـەروەها لەهــەمان کتــێبی گیرتروبیــل لەلاپــەڕە (٤٥٠)دا هاتووە"لەڕۆژی ٧ی تشرینی یەکەم لەبەغدا نانی نیوەڕۆم لەگەڵ مێجەر نۆئیل دا خوارد ، دوای نـان خواردنمـان ئـەو لـە ژوورەکەمـدا هـەنگاوی درێـژی دەناو بـەخێرایی دەهــات و دەچـوو ، لەبـەر خۆیــەوە چـەند ووشــەیەکی دووبـارە دەکردەوە(خەڵکی سلێمانی بە حەماسەت و گیانی نیشتمانیەوە پێشوازیان لـە شێخ مەحمود کرد))ئەم وتانـەی (بیل) شایەتحاڵی ئـەوەن کـە(نۆئیل)یـش وەك هەنـدێك لـە کاربەدەسـتانی تـری بـەریتانیا دۆسـتی کـورد و شـێخ مـەحمود نەبووە.

کاربەدەستانی باڵا دەستی بەریتانیا بەردەوام جۆرە کەسانێکی پلە باڵای خۆیان ڕەوانەی ناوچە کوردنشینەکان دەکرد بە مەبەستی زیاتر تێگەیشتن لـە بـارودۆخی ناوچـەکەو چارەسـەرکردنی ئـەو کێشانەی دەهاتنـە ئـاراوە بـەپێی بۆچوونی خۆیـان ، لـەو کەسـانەی کە ناردیـان (ولسن)ە کـە سیاسـەتمەدارێکی ناسراوی ئینگلیز بوو ، ناوبراو لە لاپەڕە(١٨٧)ی کتێبەکەی (الثورة العراقية)دا نووسـیوێتی "لـەو کاتانـەدا نەمانـدەتوانی هەنـدێك مـەرامی شـێخ جـێ بـەجێ

بکەین وەك ئەوەی کە دەیویست دەسەڵاتی خۆی پەرە پیٚ بدات ، لەبەر ئەم هۆیە سیاسەتمان دەربارەی کوردستانی خواروو گۆڕی بەوەی کە بتوانین هەر وەك شوێنەکانی دیکەی عێراقی لیٚ بێت . پاشان من و نۆئیل و لیچمەن و مێجەرسۆن و گۆردن و چەند کەسانێکی تر کە زانیاری راستەوخۆیان لەو بوارەدا هەبوو کۆبووینەوەو لەسەر ئەوە ڕازی بووین و بەڕەزامەندی نواندنی نۆئیل ، (مێجەرسۆن)مان کرد بەفەرمانڕەوایی شاری سلێمانی و ئەم هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ شێخدا نەبوو"[٦] . ناوبراو(ولسن)لەشوێنێکی تری هەمان کتێبیدا لەو بارەیەوە دەڵێت"پاش ئەوەی شێخ ڕەوانەی بەغدا کراو پاش ماوەیەکی کەم برینەکەی چاك بووەوە و ئەنجا رەوانەی ئەنجومەنی دادوەری سەربازی کراو بەتاوانی بەرپاکردنی شۆڕش لە دژی حکومەت فەرمانی لەسێدارەدرانی بەسەردا درا ، بەڵام لەدواییدا لەلایەن سەرۆکی گشتییەوە حوکمەکەی بۆ زیندانی هەتا هەتایی گۆڕدرا . ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە کاتی خۆی زیندانیەکانی ئێمەی ئازار نەدابوو ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی دیکەوە لەو کاتانەدا بارودۆخی ئێمە لە کوردستاندا ناسك بوو ، من(ولسن)بەشێوەیەکی رەسمی لەدژی ئەو حوکمە وەستام ، چونکە هەتا شێخ لەژیاندا بمێنێت ، ئەوا لایەنگرانیشی لە کوردستانی باشوردا بەهیوای ئەوەن کەشێخ بگەڕێتەوەو حوکم بگرێتەوە دەست"[٧] .دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بەو کارانەشەو نەدەوەستان ، بەڵکو پەنایان بۆ لای سەرکردە کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باکور دەبرد بەمەبەستی سنور دانان و ڕێگرتن لەهەر یارمەتیەك بە جوڵانەوەکەی شێخ مەحمود ، لەپێناوی ئەو مەبەستەدا هەوڵی نزیك بوونەوەی چەند کەسایەتیەکیاندا، لەوانە(سەید تەهای شەمدینی) ، لەم بارەیەوە (بیلٚ)لە کتێبەکەیدا (العراق في رسائل المس بل)و لە لاپەڕە(٤١٧)دا ، ئاماژە بەوە دەکات"پاش چەند ڕۆژێك –مێجەر بۆردیون – مان نارد بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی لەگەڵ کارگێڕی سیاسی(مێجەر گۆڵد سمیس)دا کۆببێتەوە دەربارەی کوشتنی دوو ئەفسەرەکە (ماکانت ، بۆند)و بارودۆخی ناوچەکەش ، کارگێڕی ناوبراو ڕای وابوو کە کارێك دەربارەی سلێمانی ئەنجام

بدرێت ، بۆ ئەم مەبەستە بەپەلەپەیوەندیمان بەسەرکەشی بەتوانا – سەید تەها – ەوە کرد بۆ ئەوەی بیکەین بەحاکمی سیاسی سلێمانی و رەواندوز و لەژێر سەرپەرشتی خۆشماندا کارەکان ئەنجام بدات ، من ئەو کارەم ناونا بە(بازێکی ترسناك لەتاریکیدا) ، دوای ماوەیەك وەڵامەمان لەناوبراوەوە بۆ هاتەوە کەبەو پێشنیازەی ئێمە ڕازی نەبوو، ئەگەر چی من وای بۆ نەدەچووم"[8] .

پاش گەڕانەوەی شێخ لە هیندستان ، ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری بەماوەیەك و بەتایبەتی لەساڵی ١٩٢٢دا ئاڵۆزی بەخۆیەوە بینی ، ئەویش لەو کاتەی هێزی پشدەر و رانیە لەژێر سەرکردایەتی عەباس ئاغای مەحمود ئاغای پشدەر و غەفورخانی ناودەشت و کەریم هەمەوەندی ، هێزی بەریتانیایان لەو ناوچانەدا تێك شکاندو دوای کشانەوەشی بۆ کۆیە لەوێش دەریان پەڕاندو پاشان بەرەو سلێمانی پاشەکشەی کردو دواتر لەو شارەش هەڵکەنرا ، لەو دەمانەدا (مەحمودخانی دزڵی)پشتگیری حکومەتێکی کوردی بەڕابەری شێخ مەحمود کردو لەو لاشەوە(کەریم بەگی فەتاح بەگ)هەستا بە کوشتنی کاپتن(بۆند)لەچەمچەماڵ ، ئەو کاپتنەی کە شێخی بەدیلی لە دەربەندی بازیانەوە برد بۆ بەغدا ، ئەو کارانە وایان لەدوو حکومەتی شاهانەی بەریتانیا و پاشایەتی عێراق کرد کە بەیانێکی فەرمی –رەسمی– دەرکراو لە ٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢دا واژۆ بکەن ، لەو بەیانەدا هاتبوو"حکومەتی شاهانەی بەریتانیا و هەروەها حکومەتی عێراق دان بە ماف ئەو کوردانەی کە لە سنوری عێراقدا نیشتەجێن دەنێت بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەناو ئەو سنورەدا ، هیوایان وایە رابەرە کوردە هەمە جۆرەکان – لایەنەکان – لەگەڵیاندا بەشێوەیەکی گونجاو بگەنە ڕێکەوتنێك بۆ حکومەت و سنورەکەشی ، کوردەکانیش نوێنەری خۆیان بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر پەیوەندی ئابووریان لەگەڵ حکومەتی شاهانەو حکومەتی عێراقدا بنێرن"[9] .

پاش ئەوەی ئەو حکومەتە کوردیە دامەزرا ، شێخ وەك باوەڕی پێشتری نەمتمانەی بەبەریتانیا هەبوو نەبە حکومەتی شافەیسەڵی یەکەمیش ، ناچار ما نامەیەك لە ٢٠ی کانونی دووەمی ١٩٢٣دا ڕەوانەی لێپرسراوی کۆنسوڵیەتی روسیا لە ئازربیجان بکات و لە نامەکەدا هاتووە کە شێخ داوای

پشتگیری له روسیا دەکات . ئەم هەڵوێستانەی شێخ بەریتانیای خستە دۆخێکی مەترسیدارەوەو پاش باشتربوونی بارودۆخی بەریتانیا لەساڵی ١٩٢٣دا وەك هەر دوژمنێکی باوەکوشتەی کورد ، لەهەلێك دەگەڕا بۆ لێدانی حکومەتەکەی شێخ و ئەو کارەشی سەرەتا بە بۆمبارانی فڕۆکە دەست پێکرد .

شایانی باسە بەریتانیەکان هەر کە پێیان نایە کوردستانی باشوورەوە ، سیاسەتێکی دووفاقیان گرتەبەر ، لەلایەك بەهۆی نێردراوەکانیان وەك پێشتر ئاماژەم پێیاندا پڕ و پاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە کوردستانی باشور ماف خۆیەتی ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەڕابەری شێخ ، لەلایەکی دیکەشەوە کاربەدەستانی پلە باڵای بەریتانیا پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاو دەکردەوە کەئەوان و بە وتەی هەندێك سەرەك هۆزی کورد حکومەتێکی کوردی بەبێ ڕابەری شێخ پێك دەهێنن ، لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئەگەر ڕەزامەندی لەسەردرا ئەوا لەژێر ڕکێفی بەریتانیادا ئەنجام دەدرێت ، بەم جۆرە پڕوپاگەندەکانیان – کەبەپشت گیری حکومەتی شاهانەی بەریتانیا هەڵدەسوڕا – کۆمەڵێ خەڵکیان لەئەفسەرە پێشینەکانی لەشکری عوسمانی و روناکبیران بۆ لای خۆیان ڕاکێشا ، دیارە هەموو ئەو کارانە کەوتبونە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندە ڕازاوەکانی سیاسەتمەدارانی بەریتانیا ، ئەگەر وەها نەبێ ، بۆچی لەدوای دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی شێخ و پاشان دامەزراندنی حوکمڕانیەکەی و پاشی ئەوەش دوای بۆمبا بارانەکەی ساڵی ١٩٢٣ی سلێمانی و کۆتایی هێنان بەدەسەلآتی شێخ ، یەك لەو سەرەك هۆزانە یاخود کەسێکی روناکبیرو گونجاو و لایەنگری خۆیان نەکردە سەرۆکی ئەو حکومەتە کوردیەی کە دەیانویست بۆ کوردی بکەن ، گومانی تێدا نیە ئەو کارانەی کەدەیانکرد بۆ جێکردنەوەو خۆ قایم کردنیان بوو لەناو جەماوەری کوردا ، حەقیقەتی ئەمە لەو ڕاپۆرتەی تایبەت بە پێکهێنانی حکومەتێکی کاتیی عێراقی لەتشرینی دووەمی ١٩٢٠دا کەلەلایەن (ا . ھ)ی بەرەچەڵەك ئینگلیز کە کاربەدەستێکی پلە باڵا بووە نووسراوە ، لەوێدا بەچەند دێڕێك باس لە کورد دەکات و دەڵێت"ناوچە کوردیەکانی عێراق بەتەواوی لەناوچە کوردیەکانی تورکیا لەڕووی جوگرافی و

ئابوری و سیاسی یەوە جیاوازە ، ئەو هۆکارانەی پاڵیان نا بە لیژنەی سنوری گەلانەوە لەدواییدا ئەوەیان دەربڕی کە ئەم ناوچانە لەناو سنوری عێراقدا بمێننەوە و دەریش کەوت کە ناگونجێ ئەوە بلکێنرێ بە پرۆژەی دروست بوونی دەوڵەتی کوردی مەبەست لێکراو"[10] . هەروەها لەکۆتایی هەمان راپۆرتدا هاتووە"جیاکردنەوەی ئەم ناوچانە لەعێراق واتای جیاکردنەوەی بەروبوومی کوردستانە لەبازاڕە سروشتیەکانیی ، ئەو کارەش بۆ خودی کوردەکان بەرهەمێکی ئابوری خراپ و مەترسیداری دەبێت"[11] . لەو راپۆرتەدا مەرامی بەریتانیا بەرانبەر کورد بەتەواوی خراونەتە ڕوو ، بەدوای ئەو راپۆرتەدا ، چەندین راپۆرت و بەیاننامەی تریان دەرکردووە ، لەهەندێکیاندا تەنها باس لەچەند مافێکی ساکاری کورد کراوە وەك ، بەزمانی کوردی خوێندن و نووسین ، دامەزراندنی فەرمانبەرانی کورد لەناوچەکانی خۆیان ...هتد . کاربەدەستانی بەریتانیا بەو راپۆرت و پەیماننامانەیان ، نەیان توانی بەشی زۆری جەماوەری کورد قایل بکەن ، چونکە ئەگەر شتێکی چارەنووس سازی بۆ کورد تیادا بوایە ، ئەوا نە راپەڕینی رۆژی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠ روویدەداو نە شۆڕشی ئاوباریکی سالانی ١٩٣١ی شێخ مەحمود بەرپادەبوو . یەکەمیان بە توندی سەرکوتکراو دووەمیشیان دووچاری رووبەڕوو بونەوەیەکی سەربازی و سیاسیانەی گەورە بووەوە ، چ لەلایەن خودی بەریتانیاوە چ لەلایەن حکومەتی ئەو دەمەی عێراقەوە ، پاش ئەوەی هێزەکەی شێخ لەناوچەی (دون)ڕووبەڕووی سوپایەکی زۆریی حکومەت بووەوە ، ناچار پاشەکشەی کرد ، دوای ئەوە بەچەند رۆژێکی کەم و لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٣١دا ، شافەیسەڵی یەکەم سەردانی شاری کەرکوکی کرد بۆ خەڵات کردنی ئەوانەی بەشداری ئەو هەڵمەتە سەربازیەیان لەدژی شێخ کرد بوو"[12] .

دان نانی بەریتانیا بەشێوەیەکی کاتیی بە حوکمڕانی شێخدا ، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەوان دەیان ویست کەڵك لەشێخ وەرگرن لەدژی تورکەکان ، ئەم حاڵەتە هەتا دروست بوونی دەوڵەتی تورکیای نوێ لەلایەن

کەمال ئەتا تورکەوە بەردەوام بوو ، دوای ئەوەی ئەم دەوڵەتە نوێیە بوو بە دۆستی بەریتانیا ، ئەو دان نانە کاتیەش دیزە بەدەر خۆنەکرا ، (لۆردکرزن) لە کانونی یەکەمی ۱۹۲۲دا لەم بارەیەوە رای خۆیی بەم جۆرە دەربڕیوە ،(( ئەو حکومەتە کوردیەی کەلە پەیمانی سیڤەری ساڵی ۱۹۲۰دا نەخشەی بۆ کراوە ، تەنها خەو بووەو کارێکی ناپەسەندیش بووە"[۱۳] . لەپایزی ۱۹۲۲ دا، تورکیا بایەخ پێدانی خۆی بەلکاندنی موصل بە وڵاتەکەیەوە زیاتر کرد ، لەو سەرو بەندانەدا شێخ مەحمود کە بۆ هیندستان نەفی کرابوو حکومەتی بەریتانیا ئەوی هێنایەوەو کردی بە حاکمی سلێمانی ، ئینجا لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا ، بەیانێکی هاوبەشیان دەرکرد بۆ تەشویش خستنە سەر تورکیا لەڕێی کوردەکانەوە ، هەردوولایان (بەریتانیا و عێراق) دانیان نا بە ماف کوردەکان ئەوانەی لەناو سنوری عێراقدا نیشتەجێن بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەو سنورەدا [۱٤] .

(بێڵ) لەبارەی مەرامی بەریتانیا بەرانبەر بە کورد هەتا دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیای دوای عوسمانی لە کتێبەکەیدا(العراق فی رسائل المس بل)دا ئاماژەی بەوە بەم جۆرە داوە "دوای چەند ڕۆژێك(ئەدمۆندن)م لەبەغدا بینی ،ناوبراو پێش ماوەیەك لەمەوبەر فەرمانڕەوایی شارۆچکەی رانیە بوو ، بەدوو قۆڵی نانی نیوەڕۆمان خواردو بەدەم قسەکردنەوە ئەو وای پێشنیار کرد کە شێخ مەحمود بگەڕێنینەوە شوێنەکەی خۆی ، بەڵام لەژێر سەرپەرشتی خۆماندا بێت و ڕێگاشی پێ بدەین کە ئەو فەرمانڕەوای تەنها ناوچەیەکی وەك سلێمانی بێت و وەکو ئەفسەرێکیش پەیوەندیمان پێوە بکات و خۆی لەکاروباری تر هەڵنەقورتێنێت ، ئێمە لەو بڕوایەدا بووین کە ئەگەر کارێکی وەها ئەنجام بدەین و بەپێی تواناش یارمەتی و هاوکاری ئەو بکەین کە ناوچەی سلێمانی لەژێر دەسەڵاتیدا بێت ئەوا ئەو کاتە ئەو دەبێتە دیوارێك لەنێوان عێراق و تورکیادا "[۱٥] .

لە بروسکەیەکی وەزیری دەوڵەتی بەریتانیا بۆ کاروباری داگیرگەکان(المستعمرات) — ونستن چەرچڵ ، مەبەستی بەریتانیا دەردەکەوێ

کەتا چەند ویستویانە بەدەم داواکانی گەلی کوردەوە بێن ، دەقی بروسکەکە بەم جۆرەیە:

١٩٢١/٥٥٨٢٤

چارەسەر

بروسکە

لەوەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری داگیرگەکان بۆ باوەڕ پێکراوی سامی لە عێراق (لەکاتژمێر ٧,٢٠ی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٢١ نێردراوە) ژمارە ٥١٩ لە ١١ی تشرینی یەکەم . ( لەدەقە عەرەبییەکەدا وا هاتووە کەڕەنگە هەڵەی چاپ بێت و ڕاستەیەکەی تشرینی دووەمە ) .

بە ئاماژە پێدانی نامەی نهێنی ژمارە ١٦ لە ٢٨ی تشرینی یەکەم .

لەکاتی ئێستادا ناکرێ فەیسەڵ سەرپشك بکرێ بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ کەمال، لەبەر ئەوەی دانوستانە گەورەکانی تر لەئێستادا بۆ مەبەستی گەیشتنە بەئاشتی گشتی لەگەڵ تورکیا .

لەسەر ئێوە پێویستە لەکاتی ئێستادا هەموو هەوڵتان بخەنە کار بۆ پارێزگاری کردنی و ئارامی و جێگیرکردنی بونتان لەسەر سنور . هەوڵی تورکیا ڕاستەوخۆ بەرەو ڕۆژئاوا لەدژی یۆنانیەکان دەردەکەوێ زیاد لەوەی دژ بە ئێمە بێت ، من لەکاتی ئێستادا ئامۆژگاریت ناکەم بەهەر هەوڵدانێك بۆ هاندانی کوردەکان . لەمشت و مڕێکی توندداین لەگەڵ فەرەنسا ، لەهەفتەی داهاتوودا دانیشتنی تری ئەنجومەنی وەزیران لەبارەی بابەتەکەوە دەبەسترێت ، من سۆزم بۆ ئەو بارودۆخە دژوارانە هەیە ، من ئەوانە بە هاوەڵەکانم ڕاناگەیەنم ، بروسکەیەکی ترت بۆ دەنێرم [١٦] .

چەرچڵ

لەم بروسکەیەدا مەرامی حکومەتی بەریتانیا بەئاراستەی کورد ڕوونە ، کە چۆن ئەوان لەدووی بەرژەوەندی دەگەڕێن ، نەك ڕزگار کردنی گەلان ، وەك

لەسەرەتای هاتنە ناوەوەیان لە عێراقدا و لە سەرو بەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا خۆیان بە ڕزگار کەری گەلان ناوزەند دەکرد .

زۆری ئەو گرفتانە لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو ، کەبۆچوونی فەرمانبەرە بەریتانیەکان دەربارەی شێخ تەواو نەبوو ، ئەمە لەلایەك وەلەلایەکی دیکەشەوە راوێژکارانی شێخ زۆر شارەزا نەبوون لە کارەکانیاندا هەتا بتوانن بەتەواوی کێشەکان و کارە ئیداریەکانیان بەرن بەڕێوە کەئەوەش ببووە هۆی مەترسیەك لەسەر چارەنووسی ئەو کاتەی کوردستان ، وێڕای ئەوانەش ، هەبوونی چەندین کەسانی دووڕوو ،هەلپەرست و هەبوونی هەندێك سەرەك هۆزیش کە نیازیان بەرانبەر شێخ باش نەبوو .

لەدوای شەڕی ئاوباریکەوە ، بەریتانیا و حکومەتی پاشایەتی بەهەردوولایان فشاریان خستە سەر شێخ و دواتریش سانسۆر و دەست بەسەر کردنی لێکەوتەوە هەتا کۆدەتاکەی مایسی ١٩٤١ی رەشید عالی گەیلانی کەلەو کاتەدا شێخ بەنهێنی خۆی دەرباز کرد و گەڕایەوە ناوچەی سلێمانی ، هەروەها پاش گێڕانەوەی دەسەلأت بۆ حوکمی پاشایەتی لەلایەن بەریتانیاوە دوای ئەوەی شکستیان بە جوڵانەوەکەی رەشید عالی گەیلانی هێنا، شێخ مەحمودیان ناچار کرد کەلە گوندی داری کەلی دابنیشێت ، ئەوە خۆی لەخۆیدا دەست بەسەریکردنی بوو ، فشار بەو جۆرە درێژەی کێشا هەتا کۆچی دوایی کردنی لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦. شێخ لەدوای شەڕی ئاوباریك ، وێڕای ئەو هەموو رکا بەری کردن و چاودێری کردنەی بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدا بوو کە بەهەر ڕێگەیەك بێت مافە ڕەواکانی گەلەکەی دەستەبەر بکات . دەتوانرێت ئەوە بگوترێ ، لەدوای دابەش کردنی کوردستانی گەورە لە پەیماننامەی سایکس – پیکۆدا ، تاکە سەرکردەیەك لە جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە کوردستانی باشوردا کە داوای سەربەخۆیی کوردی لەدەوڵەتێکدا کردبێت ، شێخ مەحمودە ، چونکە تا ئەم دەمەش باسی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی نەکراوەو شتی لەو جۆرەش نەهاتۆتە ئاراوە .

# پەراوێز و سەرچاوەکان


١. لمحات من تأريخ الانتفاضات و الثورات الكردية . اعداد( أبو شوقي) ١٩٧٨ بيروت .

٢. فصول من تأريخ العراق القريب ١٩١٤ — ١٩١٨ . جرترود بل . ترجمة (جعفر الخياط) . ط٢، ١٩٧٨ بيروت .

٣. القضية الكردية في العشرينات . د.عزيز الحاج ، ط٢ ، ١٩٨٥ بغداد.

٤. العراق في رسائل المس بل . ترجمة (جعفر الخياط) ط١ ، ١٩٧٧ بغداد .

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل٤٥ .

٦. الثورة العراقية . ولسن . ترجمة(جعفر الخياط) . ط١ ١٩٧١ بيروت .

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل١٩٥ .

٨. العراق في رسائل المس بل . ترجمة(جعفر الخياط) . ط١ — ١٩٧٧ بغداد .

٩. بڕوانە العراق في دوري الاحتلال و الانتداب . عبدالرزاق الحسني ، الجزء الاول . ١٩٣٥ ، سورية . ص٣٠٣ .

١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل٢٩٨.

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل٢٩٨ .

١٢. القضية الكردية . د.عزيز الحاج . ط٢ — ١٩٨٥ — بغداد ، ص١١٢ .

١٣. دراسات في الحركة الكردية المعاصرة . د.عثمان علي ، ط١ ، ٢٠٠٢ . أربيل ، ص٤٢٨ .

١٤. الحياة السياسية و الحزبية في كوردستان . منذر الموصلي . ط١ ، ١٩٩١ — لندن . ص١٧٧-١٧٨ .

١٥. العراق في رسائل المس بل ، ترجمة .جعفر الخياط . ط١ ، ١٩٧٧ بغداد ص٤٤٣-٤٤٤.

القضية الكردية في العشرينات . د. عزيز الحاج . ط٢ — ١٩٨٥ ، بغداد ص١٩٩ .

## سەرەتا

دەربڕین و بیستنی گۆرانی، هەستێکی سایکۆلۆژییە و زۆر لەمێژە تێکەڵی ژیانی مرۆڤایەتی بووە، تەنانەت هەندێك پێیان وایە یەکەم داهێنانی مرۆڤ لە بواری هونەردا، گۆرانی بووە.

لەنێو گەلانی جیهان بەگشتی و لەناو کورددا بەتایبەتی، هەمیشە گۆرانی بۆ زۆربەی بۆنەکان بەکارهاتووە. لەسەرەتادا، بەشێکی زۆری ئەو داهێنانە بووە بە فۆلکلۆر، چونکە خاوەنەکانیان نادیارە.

ئەگەر لە فۆلکلۆری کوردیش ورد ببینەوە، دەبینین دەیان جۆر گۆرانیمان هەیە، لە مەقام، بەستە، حەیران، لاوك، بەیت، ئازیزە، پاییزە، هۆرە، سیاچەمانە، چەمەری، لایلایە ... تاد. جگە لەوە لە داب و نەریتی کورددا، بۆ زۆربەی بۆنەکان گۆرانی تایبەتی هەیە، کە لە دیوەخان و کاتی کارکردن و بۆنە ئاینییەکان و ...تاد، دا گوتراوە، کەواتە هەر لە کۆنەوە کورد بایەخی تایبەتی داوە بەم چەمکە و لە چوارچێوەی ئەم هونەرەدا شاکار و بەرهەمی شایستەی تۆمار کردووە. کە بەپێی ئامارەی نووسەران و توێژەرانی کورد و بیانی و تەنانەت ڕۆژهەڵاتناسەکانیش، گەلی کورد لەم بوارەدا بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین گەلانی جیهان ئەژمار دەکرێت.[1] بەدەر لە ئاواز و میلۆدی ئەم گۆرانییانە، ناوەڕۆك و تێکستەکانیان گوزارشت لە خۆشەویستی دەکەن بەرامبەر بە نیشتمان، نێر و مێ بۆ یەکتری، ئایین، هەروەها سروشت و ژیان.

بەشێك لە لاوك و بەیتەکان، تەنانەت لە هەندێك هۆنراوەی بەستەکاندا، هەست و سۆزی نیشتمانیی تێدا دەربڕاوە و دەیان ڕووداو و کارەسات و

---

١- د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم، زانکۆی سلێمانی، چ (زانکۆی سلێمانی)، ١٩٧٩، ل: ١٠- ١٢.

داستان لە مێژووی کورددا، بەشێوەی گێڕانەوە و پێداهەڵدان، زیندوو هێڵراونەتەوە، تەنانەت لە هەندێك داستاندا شین و ڕۆڕۆش بەدی دەکرێت. هەروەها لە هەندێکی دیکەیاندا، زۆرێك لە بەسەرهاتەکان زۆر بە وردی باس کراوە، هەروەك: قەڵای دمدم، سمایل ئاغای شکاك، هەمزاغای مەنگوڕ، ئەوڕەحمان پاشای بابان، دەیانی تر.

ئەو باس و بەسەرهات و ڕووداوانەی لە فۆلکلۆردا تۆمار بوون، هەندێکیان هی کاتێکن کە نووسین یان تۆمارکردنی بەسەرهاتی قۆناغە مێژووییەکان لەئارادا نەبوە" بەڵام داوی پەیدابوونی نووسینیش، لەبەرئەوەی ڕێژەی نەخوێندەواری لە پێکهاتەی کۆمەڵدا هەر هەبوە، ئەو بەشەی فەرهەنگی گەلانی جیهان بە گشتی و ڕۆژهەڵات بەتایبەتی هەر بەردەوام بووە، بەتایبەتتر گەلێکی وەك (کورد) بەهۆی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە بە درێژایی مێژوو بەسەریدا سەپاوە، کەمتر ڕەوشی خوێندن و نووسین لە کۆمەڵگاکەیدا بەرەو پێش چووە، لەبەرامبەردا ئەو هەست و سۆزە پێویستەی (گەل) ڕژاوەتە نێو فۆلکلۆرەوە.

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە، دۆزینەوەی گوزارشتە لە قۆناغ و حکوومەت و کەسایەتی شێخی نەمر لەناو فۆلکلۆردا، لەکاتێکدا ئەم قۆناغ و دەورانە لە مێژووی کورددا هێندە دوور نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا پێگەیەکی پڕ سەروەری و هەستیار بووە، لەبەر ئەوە چەند کاریگەری هەبوە بەسەر نووسەران و مێژوونووسانەوە، پێبەپێ بەسەر خەڵکی نەخوێندەواریشەوە هەیبووە.

لەبەرئەوە نەهاتووم خەرمانی زانیاری لەسەر شێخ و حکوومەتەکەی فرەتر بکەم، یان لێکۆڵینەوە لەسەر شێواز و سەرهەڵدان و بارودۆخ و هەموو ئەو بوارانەی کە پەیوەستن بەو حکوومەتە هەڵبژێرم و لێی بکۆڵمەوە، چونکە کار و بەرهەمی لەوجۆرە تا ڕادەیەك کراوە و کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بووە. لەلایەکی دیکەوە نە کاری منە و نە بەندەش لەو بوارەدا ئەو شارەزاییەی هەیە کارێك بکات بگاتە ئاستی ئەو بابەتە، بەڵام لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵم داوە تیشك بخەمە سەر بابەتێکی فەرامۆشکراو و پێویست، هیوادارم (وەك لوێچی سەرخەمان) شوێنی خۆی بگرێت.

## • ئامانجی لێکۆڵینەوەکە

دەتوانین بەم سێ خاڵەی خوارەوە ئامانجی لێکۆڵینەوەکەمان دیاری بکەین:

١- دۆزینەوەی کاریگەری شێخی نەمر و حکوومەتەکەی، لە ناو چین و توێژی ڕەشەخەڵکی سادە و ساکاری کوردستاندا، چونکە فۆلکلۆر زادەی بیر و بەرهەمی ئەوانە[٢].

٢- ئاشناکردن و وەبیرهێنانەوەی نووسەران و لێکۆڵەران، بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن زیاتر کەڵك لە فۆلکلۆری کوردی وەربگرن بۆ لێکۆڵینەوەکانیان، یان فەرامۆشی نەکەن.

٣- بەشداریکردن لە بۆنەیەکی ئاوادا، بە مەبەستی خزمەتێکی بچووك بە مێژووی یەکەمین دەوڵەت و مەلیکی کوردستان.

## • ڕێگرییەکانی بەردەم لێکۆڵینەوەکە

١- بەرتەسکی بواری لێکۆڵینەوە لە کوردستاندا، چونکە هەر لە سەرەتای نووسینی کوردییەوە تووشی کۆمەڵێك شێوە نووسین و لاسایکردنەوە بووین، لەسەر بنەمایەکی تەسك نەك فراوان، مەبەستم لەوەیە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی فراوان و چڕوپڕ لەچاو کتێب زۆریی لە کوردستاندا کەمە و فرە نەکراوە بە نەریتێکی تایبەت بەم کارە ئەدەبییە، چونکە هێشتا کۆمەڵێك لەو پڕۆژانە ناچنە چوارچێوەی زانستییەوە.

٢- کەمتر فێربووین بایەخ بە بواری مەیدانی بدەین. واتە بۆ کارێکی لەمجۆرە: گەڕان و دۆزینەوەی تێکستی فۆلکلۆری تۆمارنەکراوی پێویستە، چونکە ڕەنگە تانێستاش کەسانێك لە ژیاندا مابن دەقی بڵاونەکراوە لە سینەیاندا پارێزراو بێت، کە بێگومان بۆ ئەم کارە و دەیان کاری دیکە بایەخیان دەبێت.

٣- کەمی سەرچاوە و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی جۆراوجۆر، کە نموونەی پێشتر بخەنە بەردەست لێکۆڵەران، بۆ ئەوەی ئێمەش بتوانین

---

٢- بڕوانە: عەمەرێ جەلالی، داستان، جاسمێ جەلیل، و: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بەغدا، ١٩٨٢، چ (الأدیب)، ل: ٧.

بەشوێن هەنگاوەکانی ئەواندا، هەمان کار ئەنجام بدەین لەگەڵ چەند هەنگاوێکی نوێتر.

٤- تائێستاش شێوازی ڕێکخستن و ئامادەکردنی کتێب لە کوردستاندا، لەلای زۆرێك لە نووسەران و تەنانەت هەندێك لە بڵاوکراوەی دەزگاکانیش، بەشێوەیەکی زانستی و بابەتی تەواو ڕێك ناخرێت، کە بە شوێن بابەتێکدا بگەڕێیت، بە ئاسانی بکەوێتە بەردەستت، هەروەها شێوازی ڕێکخستنی کتێبخانە گشتییەکانیش بەو شێوەیە نییە کە بۆ لێکۆڵەران و توێژەران، کارئاسانییان کردبێت و خۆیان ئەو کێشەی کتێبی کوردییان لە کتێبخانەکەیاندا چارەسەر کردبێت[٣].

٥- فۆلکلۆریستەکان، یان ئەو کەسانەی فۆلکلۆریان کۆکردۆتەوە، هەوڵیان داوە فرەتر کاری کۆکردنەوە ئەنجام بدەن، نەك دۆزینەوە و لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانەی ڕژاونەتە فۆلکلۆری کوردییەوە. کەواتە دەکرێ بە سەرچاوە فۆلکلۆرییەکاندا بگەڕێین و گەلێك بابەتی پێویست و فەرامۆشکراو بدۆزینەوە کە بەبێ مەبەستی دیاریکراو، کۆکراونەتەوە.

- **بایەخی لێکۆڵینەوەکە**

بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەدەبی و مێژوویی و تەنانەت بۆ هەموو بوارەکان، پێویستە سەر بە ئەرشیڤی هەموو زانستەکاندا بکەین، لە پێناو دۆزینەوەی گشت ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بەو بوارەی وا پێویستە کاری لەسەر بکرێت. لەبەر ئەوەی فۆلکلۆری کوردیش سەرمایە و گەنجینەیەکی کەم هاوتایە، بە پێویستم زانی بۆ کەسایەتی و حکوومەتی شێخی نەمر، ئاوڕێك لە فۆلکلۆر بدەینەوە و لەو مێژووە کەموکورتەدا، (کە لەوکاتەوە کەمتر فۆلکلۆر

---

٣- لە بەرواری (٢٦/٤/٢٠٠٦) لە هۆڵی کتێبخانەی مۆزەخانەی سلێمانی، بەبۆنەی ڕۆژی جیهانی کتێب، لێکۆڵینەوەیەکم بەناوی (کێشەکانی کتێب لە کوردستاندا) پێشکەش کرد، کە لەوێدا زۆرێك لەو کێشانەم بە وردی باس کرد و تاڕادەیەك پاساوی شیاو و گونجاوم بۆ هێنایەوە، کە دەکرێ ئەمڕۆ لە باشووری کوردستاندا بۆ کەمکردنەوەی ئەو گرفتانە، کاریان بۆ بکرێت.

کەڵەکە بووە)، چەند نهێنی و بابەت و زانیاری، یان کەرەسەی پێویست بۆ توێژینەوەکانی داهاتوو، کۆبکەینەوە.

دەتوانین بە سێ خاڵ، بایەخی ئەم بابەتە بخەینەڕوو:

١. فۆلکلۆر، سەرچاوەیەکی بێگەرد و باوەڕپێکراوە بۆ دەرخستنی ڕووی ڕاستی بەشێکی دیاری مەسەلەکانی کۆمەڵ، لەبەرئەوە پێویستە بۆ زۆربەی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە کەلەپوور و فەرهەنگی ونبووی گەلەکەمانەوە هەیە پشتی پێ ببەستین، هەروەك زۆرێك لە نووسەران و توێژەران ئاماژەیان پێ کردووە.[٤] هەر لەبەرئەوەیە کۆمەڵێك نووسەر و توێژەر بۆ لێکۆڵینەوەکانیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە.

٢. فۆلکلۆر، لە ئەنجامی هەست و نەستی خەڵکانی بێدەسەڵاتی قەڵەمەوە پەیدا دەبێت، لە هەمان کاتدا دوورە لە هەڵبەستن و مەبەستی دیکەی بەدواوە نییە، چونکە کەسی گۆیندەی فۆلکلۆری، لە ئەنجامی هیچ جۆرە پەستان و کاریگەرییەکی لاوەکیدا (تێکست) هەڵنابەستێت، بەڵکو بەرهەمەکە لە ئەنجامی کاردانەوەی ئەو باسە بەسەر هەست و سۆزی دەروونی ئەو کەسەدا، پەیدا دەبێت.

٣. بەهۆی بارودۆخی نالەباری کوردستانەوە، تائێستاش ئەرشیف و کتێبخانەی کەلەپووری و نیشتمانیمان نییە، کە بووبێتە کانگای زانیاری و بەڵگەنامە و بۆ کاری لێکۆڵینەوە پشتی پێببەستین، کە لەبەرامبەردا و هەر بە هۆکارەکانی ئەو بارودۆخە، تاڕادەیەك فۆلکلۆری کوردی دەوڵەمەند بووە، کە دەکرێ بڵێین زانیاری لەسەر زۆرێك لە چەمکە ونبووەکان لە فۆلکلۆردا تۆماربوون.

---

٤- بوار نورەدین، دەنگی مێینە لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردیدا، سلێمانی، چ (شڤان)، ٢٠٠٤، ل: ٢٢-٢٣. لەوێدا ناوی کۆمەڵێك سەرچاوە هاتووە کە ئاماژەیان بەم بابەتە کردووە.

- **دەستەبەرکردنی زانیاری و سەرچاوە**

**دوای گەڕان و تاوتوێکردنی سەرچاوە فۆلکلۆرییەکان[5]، توانیمان لە چەند کتێبێکدا هەندێك هۆنراوەی فۆلکلۆری و یەك بەیت و لاوك، لەسەر کەسایەتی و شەڕ و مێژووی شێخ و حکومەتەکەی، بدۆزینەوە، کە دەکرێ بەپێی مێژووی بڵاوبوونەوەیان، بیبلیۆگرافیایەکیان بۆ ڕێك بخەین و تێکستەکانیان وەرگرین و تاڕادەیەك هەندێ زانیاریان لێ بچنین:**

---

٥- هەروەك پێشتر ئاماژەم کرد بە گرفتەکانی بەردەم لێکۆڵینەوە لە کوردستاندا، بەلام بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەپێی ئەوەی چەند ساڵێکە کارمەندی کتێبخانەی ئینستیتیوتی کەلەپووری کوردم، هەروەها بیبلیۆگرافیایەکەم بۆ مێژووی (١٣٤) ساڵەی کتێبی فۆلکلۆری کوردی ئامادەکردووە، تاڕادەیەك شارەزاییم لەو بوارەدا پەیداکردووە و هەر لە ئەنجامی کارکردن لەو بوارەدا بیرۆکەی ئەم باس و لێکۆڵینەوەیە پەیدابوو. بۆ جێبەجێکردنی ئەم پڕۆژەیە، کەڵکم لە کتێبخانەی ناوبراو وەرگرت. بۆ ئەوە بڕوانە: بیبلیۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆری کوردی، ١٨٦٠- ٢٠٠٤، ئامادەکردنی: بوار نوردەین، پێشەکی و پێداچوونەوەی پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، پڕۆژەی کتێبخانەی ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، سلێمانی، ٢٠٠٤، چ (شڤان). چونکە کتێبەکە لە (٢٠٠٤)دا ئامادەکراوە و تاکو ئەو مێژووە ئەژماری بۆ کراوە، لەبەرئەوە (١٣٤) ساڵ نووسراوە.

# ناسنامەی کتێبەکان

## ١- سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقیێ

**کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: ئۆردیخانی جەلیل**

**هێنانەسەر رێنووسی کوردیی ئەمڕۆ: شوکور موستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد**

**لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد**

**لە چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد) لە (بەغدا) چاپکراوە**

**ژمارەی سپاردن (١٣٩٩) سالێ (١٩٧٨) دراوەتێ**

**ژمارەی لاپەرە (٥١٧) قەوارە (١٧ بە٢٤) سم**

**ناوی تێکستەکە:**

شەڕێ ئازادارییێ و ئیێ نەبن دەستییێ/ شێخ مەحموود، لاپەڕە (٥٩)، کە بەم شێوەیە[٦]:

### شێخ مەحموود

دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی.

برانۆ، بەهارە، ل سەرێ سلێمانی ناسر حەفاد و خۆش مێرێ گران دهاتی مەحەلێ قالان و شەڕان و وێران،

---

٦- ئەم کتێبەی ئەم لاوکەی لێ وەرگیراوە، لە ئێریڤان کۆکراوەتەوە، لە پاشکۆدا لیستی ناوی ئەو کەسانەی نووسیوە کە گۆرانییەکانی لێ وەرگرتوون، بەلام گۆرانییەکان و کەسەکانی هەمبەر نەکردووە. لەبەرئەوە نازانرێ کێ ئەم لاوکەی چڕیوە! لە کاتێکدا (گەرەپەتێ خەچۆ) ئەو لاوکەی لە ڕادیۆی ئێریڤان تۆمار کردووە، کە ئەویش کەسێکی (ئەرمەنی) و خەڵکی شارۆچکەی (بشێری) بووە، کە سەر بە شاری (سێرت)ە و دەکەوێتە ناوچەی غەرزان. بەلام ئێمە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە بە لاوکێکی گشتی خەڵکی ئێریڤان کە (ئێزدی)ن ئەژمارمان بۆ کردووە.

ل ئەزمانا خۆش تێ گرینێ تەیارا، ل عەردێ خۆش تێ گرێنییا میترالیۆزا، ئاڤتۆماتیکا، شەقینێ ئۆتوزدارا، دەنگێ تۆپان و تەکلکان، ناوەللە چارپایێ قژەقژێ نۆبەداران،

ئەرێ شەعدە شودی شێخ مەحموود، کەکێ شێخ قادر باڤێ لەتیف، گەلەك هەنە.

ب سێ دەنگا گازی دکر: (کەریمێ فەتاح بەگ ئێل و عەشیرەتێ کوردان، باڤ و برا. ئیرۆ هونێ مێر بن مێرێ چێ بن،

ئەزێ بەرێ ڤی عەسکەرێ زۆری، زەعف گران بقولێم ئالیێ وانێ).

دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی شێخێ زراڤ.

دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی،

برانۆ شەڕەکی چێ دبو ل چیایێ سورداشێ ل بەرێ مالێ، وەللە، جانیکا شێخ مەحموود، کەکێ شێخ قادر، باڤێ لەتیف و عەڕنییە، ژ ئێڤارا خودێڤا دپانگێدا دخوازە پێکولێ و سمتراشێ.

ئەرێ شەعدە شودێ شێخ مەحموود، کەکێ شێخ قادر باڤێ لەتیف، گەلەك هەنە،

ب سێ دەنگا گازی دکر: (کەریمێ فەتاح بەگ ئێل و عەشیرەتێ کوردان، باڤ و برا. ئیرۆ هونێ مێر بن مێرێ چێ بن،

ئەزێ ئیرۆ دەستێ خوە باڤێژمە دارێ جانبێزارێ،

ئەزێ بەرێ ڤی عەسکەرێ زۆری، زەعفی، گران بدمە سەر بەرازێ ئێندادێ وانێ).

دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی شێخێ زراڤ.

دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی.

برانۆ شەڕەکی چێ دبوو ل چیایێ کورداشێ[7] وێ ب بێیە، گرانە ئەسکەرێ کەلە ڕەشکا، ژ ئێڤارا خودێڤا حەیایی بانگا سەرێ سڤی ئەسکەرێ کەلەڕەشکییان و بەلەکییا هات و کشیا بو سەرە،

---

٧- کورداش: هەروەك (شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد) ئاماژەیان پێکردووە، دیارە هەر (سورداشە) بەڵام بێگومان ئەوان لە نێریڤان شارەزای ناوچەکانی سلێمانی نین، یان ئامادەکار بە هەڵە وەریگرتووە.

وەللە شەعدە شودێ، شێخ مەحموود، کەکێ شێخ قادر، باڤێ لەتیف گەلەك هەنە،

ب سێ دەنگا گازی دکر: (کەریمێ فەتاح بەگ ئێل و عەشیرەتێ کوردان،

باڤ و برا. ئیرۆ هونێ مێر بن مێرێ چێ بن،

ئەزێ ئیرۆ دەستێ خوە باڤێژمێ دارێ جانبێزارێ،

ئەزی بشکێنم شارێ کەرکووکێ، شارێ سلێمانییێ، وەزێ بڕەڤینم خەملا ڤان نەیارا).

دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی، دە لۆی لۆی شێخێ زراڤ.

## شیکردنەوەی تێکستەکە:

دەتوانین ئەم سەرنجانە لەسەر بابەخی ئەم تێکستە تۆمار بکەین:

١. ڕەنگدانەوەی ئەم ڕووداوە مێژووییە، کاریگەریی تەواوی هەبوە بەسەر تەواوی دانیشتوانی کوردستاندا، تەنانەت کوردەکانی ئێریڤانیشی گرتۆتەوە، چونکە ئەگەر لە ناوچەکانی دیکەشەوە وەریان گرتبێت، نەبینین هەست و سۆز، هەروەها هەندێك بیروباوەڕی خۆیانیان بەبەردا بڕیوە. لەکاتێکدا نەگونجێ لە کاریگەریی دەنگی بیستراوی کاوێس ئاغاوە بە هۆی ڕادیۆی (بەغدا)، ئەم لاوکە گەیشتبێتە ئێریڤان. لەبەرئەوەی بارودۆخی ئەو کاتەی ئێریڤان لەبارتربووە بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی تێکستی فۆلکلۆری[8]، مێژووی بلاوبوونەوەی پێش کتێبی (کاوێس ئاغا) کەوتووە.

٢. بەشێکی بەرچاوی کوردەکانی ئێریڤان پێڕەوی ئاینی (ئێزدی) دەکەن، لەبەرامبەردا شێخی نەمر کەسایەتییەکی ناوداری ئیسلامی و لە بنەماڵەیەکی تەواو ئاینی بووە، بەلام لەم لاوکەدا دەردەکەوێت کە کوردە ئێزدییەکان هەستە نەتەوایەتییەکەیان زاڵبووە بەسەر هەستە ئاینییەکەیاندا، سەرەڕای ئەوەی بە

---

٨– بەپێی ئەو کارانەی لە (ئێریڤان) لەلایەن کۆمەڵێك پسپۆڕ و خەمخۆری فۆلکلۆری کوردیی کراوە، وەك: ئۆردیخان و جەلیل و جەمیلەی جەلیل و کۆمەڵێك فۆلکلۆرناسی دیکە، لە کۆکردنەوە و توێژینەوەی زانستی لەسەر فۆلکلۆری کوردی، دەکرێ بە سەرەتای ئەم قۆناغەی دابنێین لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا.

درێژایی مێژوو بە دەست دەسەڵاتە ئیسلامییە کورد و غەیرە کوردەکانەوە تووشی ئەنفال، کوشتن، تاڵان و ڕاگواستن بوون.

٣. لێکچوونی تەواو هەیە لەنێوان ئەم تێکستە و تێکستەکەی هونەرمەند (کاوێس ئاغا)دا، چونکە هەردوکیان باس لەم ڕووداوە دەکەن و هەوڵ دەدەن لە چوارچێوەی ئەم لاوکەدا دیمەنێکی تراژیدیایی بۆ بگێڕنەوە. بەڵام لە هەندێك شوێندا جیاوازییان هەیە، چونکە لە لاوکەکەی کاوێس ئاغادا، چەند جارێك هاواری یارمەتی بۆ تورکەکان دەبرێت، کە گوایا ئەوانیش موسڵمانن و ئینگلیزەکان کافرن، جگەلەوەی کە شێخ لەپێناوی پەیوەندی لەگەڵ تورکاندا، تووشی گرفتی فرەتر بووە لەگەڵ ئینگلیزەکان. بەڵام لەم تێکستەدا، هاوار بۆ تورکان نابرێت، کە ڕەنگە ئەوەیش بگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەم کوردانە لەژێر دەسەڵاتی تورکاندا ئاوارە بوون بۆ ئێریڤان. هەروەها نزیکتر بوون لە تورك و باشتر لە نیاز و مرازیان گەیشتوون و شارەزابوون کە هەرگیز دۆستی کوردان نەبوون.

٤. لەم تێکستەدا باس لە چەکی (ئۆتۆماتیك) کراوە، کە دیارە چەکێکی نوێ بووە و لەو شەڕانەدا بەکارهاتووە.

٥. لە دوو شوێندا دەڵێ: (ئەزێ بەرێ ڤی عەسکەرێ زۆری، زەعف گران بقولێم ئالیێ وانێ)، هەروەها (ئەزێ بەرێ ڤی عەسکەرێ زۆری، زەعفی، گران بدمە سەر بەرلازێ ئینادێ وانێ)، لەوە دەچێت باس لە کۆمەکی هێزی ئەو ئاشوورییانە بکات کە بوون بە هاوکاری ئینگلیز و لە باکووری کوردستانەوە هاتوون و بوون بە بەشێك لە هێزی (لیڤی) و لە شەڕەکانی دژ بە شێخی نەمردا، بەشدارییان کردووە کە بە (تیار)یش ناسراون.

٦. لەم تێکستەدا دەستەواژەی (کورد خائینۆ) نەگوتراوە، بەپێچەوانەوە لە لاوکەکەی کاوێس ئاغادا (کە دواتر باسی دەکەین)، ئەم دەستەواژەیە (٤) جار هاتووە.

بەدەر لەم خاڵانە، دواتر شیکردنەوە بۆ لاوکەکەی کاوێس ئاغا دەکەین.

### ٢- داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا

نووسەر: عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی

به یارمەتی ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان چاپکراوە
چاپی یەکەم لە چاپخانەی (سەلاحەدین) لە هەولێر چاپکراوە
ژمارەی سپاردن (٧٧٠) ساڵی (١٩٧٨) دراوەتێ
ژمارەی لاپەڕە (١٢٠) قەوارە (١٦ بە ٢١) سم

**ناوی تێکستەکە:**

شێخ مەحموودی نەبەز، لاپەڕە (٧٨-٨٠). کە بەم شێوەیە:

والییە برێ والییە، شێخ مەحموودم والییە
دەڕێن غەزا غەزایە، لە بنەی سولەیمانییە
ئەو بن چیایەی سووورداشێ، خێوەت بزری کردییە
سبیانەکێ گەلەك زوو، فەزلیدا بەیانییە
تەیارە لە عاسمانێ، تڕومبێل لە عەردییە
گرمە گرمی تۆپان دێ، دێ دەنگی تەختەلییە
* * * * * *
بابی بابم شێخ مەحموود، لەگەڕ دەزگای داتنایە
هەیبەت سولتان برندە، تۆپخانەی لێدانایە
کەریمی فەتاح بەگی، عەسکەری تەعلیم دایە
عەسکەری شێخ مەحموودی، سنجیتاق ڕاوەستایە
* * * * * *
بابی بابم شێخ مەحموود، لەگەڕ دەزگا و دوکانی
تۆپەکی دادەمەزراند، بە ڕبەی دەخوا دەرمانی
گوللەی قەندی شەکری، ئەو باشە لۆ نیشانی
ناردی لۆ ئینگلیزی، دینی مار و خێزانی
* * * * * *
گێتان لە من بێ، لێمبگرن قەرار
سەرکردەی شێختان، لۆ دەکەم ئیزهار

سەفەر بەلك بوو، جوملەی هەشنۆ سار
گریانەك داهات، لە هەموو معار
ئینگلیز هەرستا، گرتی هەموو شار
تۆفیقی نەدەی، خودایە هاوار
* * * * * *
شێخ مەحموود شێخە، شێخی بە کەمال
لەگەڵ مەندەوی، قسەی کرد ئیزهار
هەروەك خەنجەری، پڕ لە جەوهەردار
لە ناو کالانی، ناگرێت قەرار
دەچووە مەیدانی، زیرەی دێ وەك مار
حاکمی سەربڕی، شێخی جەوهەردار
پەردان پەردانن، نماز گوزار
* * * * * *
شەڕەك داکەتییە، لەو بەرانبەرە
دەنگی تۆپان دێ، لەو سەرانسەرە
حەیفە شێخ بچی، بە تۆپی کەللە
* * * * * *
هەیداد و بێداد، لۆ هەمەوەندی
چەکی لە خۆدا، لەگەر کەمەندی
شەڕی شێخ مەحموودییە، بگرن سەرهەندی
* * * * * *
هەیدا و بێداد، مشیری حەمەی
مشیری حەمەی، گەر سرێمانی
ئەو بە نەعلەت بێ، لەگەر شەیتانی
بە پێش کافران کەت، لۆ سلێمانی

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

دەتوانین چەند سەرنجێکی گشتی لەسەر هۆنراوەکە وەربگرین:

• هەرچەند دەسەڵاتەکەی شێخ کەمتر ناوچەکانی هەولێری گرتۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شێخیان بە (والی) کوردستان لە قەڵەم داوە، کە ئەمەش بۆخۆی خۆشحاڵی و هیوای فراوان بوونی ئەو حکوومەتەی کوردستان بووە، لەلایەن خەڵکی ئەو دەڤەرە.

• ئەم شەڕە لەلایەن خەڵکی ناوچەی هەولێر و زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، بە غەزای نێوان کافر و موسڵمان چوێنراوە و پیرۆزی دراوەتێ.

هەروەها دەتوانین ئەم زانیارییانە لەسەر ئەم تێکستە تۆمار بکەین:

١- لە کاتی شەڕەکەدا، لە ناوچەی سووورداش، خێوەتێکی زۆر هەڵدراوە. ئەمە ئاماژەیە بۆ کاتێك کە شێخ لە مارتی (١٩٢٣)دا، دوای تێکچوونی پەیوەندیی لەگەڵ ئینگلیزدا، ناچاری چۆڵکردنی سلێمانی بوو، بە خۆیو هێزەکەیەوە رووی کردە ناوچەی سووورداشو تا مایسی ئەو ساڵەی تێدا مایەوە.

٢- تۆپەکانی شێخ لەسەر چیای هەیبەت سوڵتان بووە. دەسەڵاتی شێخ بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان تا ئەوبەری ناوچەی دووکان بڕی کردووە.

٣- کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند، خەڵکی فێری هونەری سەربازی کردووە، کە دیارە لەو بوارەدا شارەزایی هەبوە. کەریم بەگ یەکێکە لە دیارترین فەرماندە عەسکەرییەکانی هێزی شێخ، کە تا شەهیدکردنی لە (١٩٢٦)دا هەر بە دڵسۆز و وەفاداری شێخ و جووڵانەوەکەی مایەوە.

٤- سوپاکەی شێخ تۆپی گەورەی هەبوە، کە پێناچێ وابێ.

٥- لە بەشی کۆتایی هۆنراوەکەدا، بەشێوەیەکی ئەدەبی جوان و بەرێزەوە، باس لە شکستی کوردان دەکات، لەبەرامبەریدا درێژە بە پیرۆزی و پلەوپایەی کەسایەتی شێخی نەمر دەدات.

٦- باسی سەربڕینی (حاکم)ێك دەکات، کە گوایە دەسەڵاتەکەی شێخ ئەنجامی داوە، دیارە مەبەست لە کوشتنی (کاپتن بۆند و ماکانت)ی حاکمی

سیاسی ئینگلیز و یاریدەدەرکەی بووە لە چەمچەماڵ. ئەوکاتە (ساڵی ١٩٢٢) شێخ لە هیندستان بووە کە کەریم بەگ بۆ ناڕەزایی دەربڕین و بەرەنگاری بەم کارە هەستاوە.[٩]

٧- لە تێکستەکەدا دەڵێ: (مشیری حەمەی، گەر سرێمانی)، کە وەك کەسێکی ناپاك ئاماژەی پێکردووە، کە لە ڕاستیدا هەر بە ناوی (موشیری حەمەی سلێمان) بەناوبانگە.[١٠] خوالێخۆشبوان ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجە لە بیرەوەریەکانیاندا بە هەمان بۆچوونەوە لێی دوواون.

### ٣- چەند مەلۆیەك لە شارای فۆلکلۆری کوردی

نووسەر: جەعفەر شێخ حسێن بەرزنجی

لە چاپکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

چاپی یەکەم لە چاپخانەی (الزمان) لە بەغداد چاپکراوە

ژمارەی سپاردن (٣٣٦) ساڵی (١٩٨٦) دراوەتێ

---

٩-حکوومەتی کوردستان لە سلێمانی- پێشینە و مێژوو، ساخکردنەوەی: سدیق ساڵح، لە بلاوکراوەکانی سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانی، سلێمانی، چ (؟)، ٢٠٠٣، ل: ٥١.

١٠- مەسەلەی موشیری حەمەی سلێمان بۆچوونی جیاوازی لەسەرە، چونکە هەندێك لەوانەی کە بە ناپاك لەقەڵەمیان داوە، ئێستا پەشیمانن و زانیاری پێچەوانەیان بلاوکردۆتەوە، بڕوانە کتێبی (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، نووسینی: د. کەمال مەزهەر، ئامادەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، چ (وەزارەتی پەروەردە)، ٢٠٠١. دەتوانی کەڵك لەم بابەتانە وەربگریت:

- ویژدان و مێژوو، یا دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان، نووسینی: د. کەمال مەزهەر، ل٢٠١- ٢٠٦.
- دیسانەوە دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان، نووسینی: لیوا روکن (محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی)، ل٢٢١- ٢٢٨.
- هێزی پەلاماردەری ژەنڕاڵ فریزەر سادە نەبوو، تاکو پەنا بەرێتە بەر هاوولاتییەکی ناوچەکە، جوگرافیای سەربازی و موشیری حەمەی سلێمان، نووسینی: د. فوئاد حەمە خورشید، ل: ٢٢٩- ٢٣٣.
- بۆ جاری سێیەم موشیری حەمەی سلێمان!!!، بابزانین موشیر خۆی چۆن باسی شەڕی (بەردە قارەمان) دەکات، نووسینی: ئازاد هەمەوەندی، ل: ٢٣٥- ٢٤٢.

هەروەها چەند بابەتێکی تر.

ژمارەی لاپەڕە (٤٤٤) قەوارە (١٧ بە ٢٤) سم

**ناوی تێکستەکە:**

چەند هۆنراوەیەك بۆ شێخ مەحموودی نەمر، لاپەڕە (٢٤٨).

ئەم پێنج دوو نیوە بەیتەیە:

سەماوەری زەرد، دەسکەکەی زیوە      ڕەحمەت لەو دایکە، شێخ مەحمووی دیوە

* * * * *

یا شێخ مەترسە، بۆمبا هیچ نییە      حاجی کاك ئەحمەد، لێت غافڵ نییە

* * * * *

ئەوا مانگ هەڵهاو، دای لە ترشەکان      مەلیك نان ئەخوا، لەگەڵ ئایشەخان

* * * * *

ئەوا مانگ هەڵهات، دای لەسەر سینی      مەلیك نان ئەخوا، لەگەڵ ئەفەنی

* * * * *

تەیارە هاتووە، حاجی لەقلەقە      بەری ئاوێنە، پشتی مەفرەقە

**شیکردنەوەی ئەم دوو بەیتییانە:**

ئەم کۆپلە هۆنراوانە، تەنیا هەستێکی کەمی سۆز و خۆشەویستی بە شێوەیەکی گەلێك سادە و ساکار، تێدا دەدۆزرێتەوە، کە ڕەنگە هەر لەلایەن ئەو جۆرە خەڵکەوە گوترابێت، چونکە ناوچەی سلێمانی فرەتر خوێندەوار و ڕۆشنبیری لێ بووە، کە لە چەندین وتار لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا، هەروەها لە کتێب و هۆنراوەی شاعیرانی ئەم ناوچەیە و لەو سەردەمەدا، ڕەنگی داوەتەوە.

**٤- سترانێت کاوێس ئاغای**

خرڤەکرن و بەرهەڤکرنا: شەعبان مزیری

چاپی یەکەم لە چاپخانەی (ئەسعەد) لە بەغدا چاپکراوە

ژمارەی سپاردن (١٣٧٩) ساڵی (١٩٨٨) دراوەتێ

ژمارەی لاپەڕە (٤٠) قەوارە (١٧ بە ٢٣,٥) سم

**ناوی تێکستەکە:**

**لاوکی شێخ مەحموود، لاپەڕە (١٢– ١٤):**

### شێخ مەحموود

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

شێخێ من دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

بهارا من ب سەرێ سلێمانییێ دا تێتن دحالێ شەرادا

ل عاسمانا خوشی تێ گرێنا تەیاران و گرگرا مەتەریۆسا

* * * * *

بەلێ شاهدێ شهودێ شێخ مەحمود نەڤییێ شێخ قادر بابێ لەتیف

ب سێ دەنگا گازی دکەت کەریمێ فەتاح وە گەلی عەگیدان مێرانییەکێ بکەن.

هەچی گاڤا دەستێ خوە بدەمە دارێ جامبێزارێ.

* * * * *

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، شێخێ منوو!

ئەزێ هندی هەوار دکەم هەوارا تورکا گەلەك دوورە، برانۆ کورد خائینو،

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

دەلۆیلۆ، شەرەکا قەومی ل چیایێ سورداشێ ل بیرڤانێ،

هەسپێ شێخ مەحمود، گەنجێ شێخ قادر، بابێ لەتیف لاوێ کوردا دەنگداڤ

شێخ مەحمود، ب سێ دەنگا گازی دکەت، کەریمێ فەتاح وە بمشیرا رابن،

گەلی عەگیدا، ئەڤرۆ دەست هەلاتەکێ ب من رابگەهینن،

بەلێ شەرێ مە دچەپەرا دا نامینیت، ئەشهەد و بیلا،

گەلی برا شەرێ مە دێ خار کەڤیت و بەلاڤە بیت و کەڤتە چیا و چولێ،

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

شێخێ منۆ، بەلێ باش هەوار دکەم:

هەوارا تورکا دووره، بەلێ برا برانۆ، کورد خائینۆ،

*　*　*　*　*

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ شێخێ برا

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

شەرەکا قەومی ل چیایێ سورداشێ،

وا ب بەرا بەلێ سۆیا، ڤێ سوبێ

عەسکەرێ ڤی نەیاری، قەلەرەشکا وا ب بەرا ڤێرێنە هات سەرا،

بەلێ شاد و شودێ شێخ مەحمود، گەنجێ شێخ قادر، بابێ لەتیف

ب سێ دەنگا گازی دکەت:

کەریمێ فەتاح، تۆ ب گەلی عەگیدا ئەڤرۆکە تەکیرانەکێ بکە، بەلێ ب چ گاڤا

دەستێ خوه بدەمە دارێ جەمبێزارێ، بگرم شارێ کەرکوکێ،

شارێ بەغدایێ، بارەکێ تێدا خەملا دلا،

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

*　*　*　*　*

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، شێخی منۆ

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

ئەزێ ئەڤرۆ هەواربکەم، هەوارە تورکا، برانۆ کورد خائینۆ

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ

دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، شێخ مەحمودێ من،

زەری ل چیایێ سورداشێ، کانی وەردە خەلکانێ،

بەژنا شێخ مەحمود، کەکێ شێخ قادر، بابێ لەتیف، نەباتا تاکێ روحانێ.

شێخ مەحمود، ب سێ دەنگا گازی دکەت:

کەریمێ فەتاح و ب گەلی عەگیدا، بۆ من دەست هەلاتەکێ بکە،

ئەڤە سێ رۆژە، دەمێ ئاسێ بین، ل چیایێ سورداشێ
جیهادا ل مە ڕابی دەراڤێ وێ دادێ وانێ
دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ، دەلۆیلۆ
شێخێ منۆ، بەلێ فایدەنینە، هەوار بکەم،
هەوارا تورکا دوورە، گەلی برانۆ، کورد خائینو.

## شیکردنەوەی تێکستەکە:

دەتوانین چەند سەرنجێکی گشتی دیاری بکەین:

• تێکستی ئەم لاوکە لەگەڵ لاوکی ئێریڤاندا جیاوازییان هەیە، هەر لەبەرئەوە هەردوو لاوکەکەمان خستەڕوو، بەڵام لەگەڵ لاوکی کتێبی ژمارە (١٠)دا چوونیەکن بەبێ جیاوازی.

• دەکرێ بڵێین ئەم لاوکەی هونەرمەند کاوێس ئاغا، بەرهەم و شاکاری خۆی بێت، چونکە لەوەناچێت پێشتر کەسێکی دیکە گوتبێتی و کاوێساغا لێی فێر بووبێت[11]، هەروەها زۆر عەبداڵ و هۆگری حکوومەت و کەسایەتی شێخ بووە و زۆرجار سەردانی شێخی کردووە، تەنانەت لاوکی بۆ چڕیوە. لەبەرامبەریشدا شێخی گەورە ڕێزی لێگرتووە و زۆری خۆشویستووە و (ئەسپێکی کەحێل، تفەنگێکی جامێزار، دوو ڕەختە فیشەك و چل لیرەی داوەتێ)[12].

• جگەلەم لاوکە، بۆ زۆرێك لە ڕووداوەکانی دیکەی وەك: سمایلاغای شکاك، شۆڕشی بارزانی دووەم و لاوکی پیر پەنجۆ، لاوکی چڕیوە و وەك داستانی قارەمانی بە خەڵکی ناساندوون.

• لاوکە بەسۆزەکەی کاوێساغا، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوە بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم داستانە قارەمانییە لە تەواوی کوردستان و لەناو زۆربەی

---

١١- لە کتێبی ژمارە (٨)، لاپەڕە، ١٥- ١٦- ٢١، ئاماژە بە چەند بۆچوونێکی لەمجۆرە دراوە.

١٢- سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە: ٢١.

چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا، ڕەنگە هەر ئەوەش بووبێت بەهۆی سەرهەڵدانی تێکستی دیکە لەناو فۆلکلۆری کوردیدا. چونکە لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە ڕادیۆی بەغدا دەست بەکاربووە و یەکێك لەو هونەرمەندانەی هەر زوو بەرهەمەکانی تێدا بڵاودەکرایەوە، کاوێس ئاغا بووە، جگەلەوەی لە ساڵی (١٩٣٠)یەوە لە کۆمپانیاکانی (بێزافۆن، نەعیم، نایف، ئەسکەندەرسان)[١٣] گۆرانییەکانی تۆمارکردووە و ئەوانەی قەوانیان هەبوە پێشتر گوێبیستنی گۆرانییەکانی بوون.

هەروەها دەتوانین چەند زانیارییەك لە لاوکەکە وەربگرین:

١- ناوهێنانی (سورداش) لە زۆربەی دەقەکاندا، هی ئەوەیە کە شێخ و هێزەکەی لە بەهاری (١٩٢٣)دا، لە سلێمانی ڕوو بەرەو سورداش چۆڵیان کرد و ماوەیەك لەو ناوچەیە مانەوە[١٤].

٢- سۆز و ئەوین و هەستێکی زۆر بە تین و گوڕ لەم لاوکەدا خۆی دەنوێنێ و کاریگەری تەواو دەخاتەسەر بیسەر.

٣- دیاریکردنی وەرزی ڕووداوی شەڕەکە، بەهار بووە.

٤- دیارە شێخی نەمر هاواری قوربانی، ئازایەتی، پیاوەتی و غیرەتی فرەتری لە هەندێك لە بەشداربووەکان کردووە.

٥- بەپیرەوەنەهاتنی سوپا و یارمەتی تورکەکان، ئەگەرچی شێخ پشتی پێ بەستوون. ڕاستییە مێژووییەکانیش هەمان شت دەسەلمێنن.

٦- شوێنی شەڕەکە، کە ناوچەی سوورداش بووە.

٧- ئامارژە بە پاشگەزبوونەوەی سوێندخۆرەکان دەکات، کە بە دەستەواژەی (کورد خائینۆ) ناوزەندیان دەکات.

٨- باسکردنی هەندێك لە وردەکارییەکانی شەڕەکە، وەك: شەڕ دەبێ لە دەشتەوە بگوازرێتەوە بۆ چیا، هەروەها چوون لە سورداشەوە بۆ (خەلکان) کە هەر دەبێ (خەلەکان) بێت.

---

١٣- کتێبی ژمارە (٨)، لاپەڕە: ٢٠.

١٤-حکوومەتی کوردستان لە سلێمانی- پێشینە و مێژوو، ساخکردنەوەی: سدیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانی، سلێمانی، چ (؟)، ٢٠٠٣، لا: ٧٧.

٩- ئاماژەکردن بۆ گرتنی شاری کەرکووك و بەغدا، چونکە ئەو کاتەی شێخ لە (سووورداش) بوو، نیازی بوو پەلاماری شاری کەرکووك بدات[١٥].

١٠- عاسیبوون و گیرخواردنی سوپاکەی شێخ بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ لە چیای سورداش.

٥- سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی / بەرگی یەکەم

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: سەعدوڵڵا شێخانی

پێداچوونەوەی: فازیل شەورۆ

لە سەر ئەرکی نووسەر چاپکراوە

چاپی یەکەم لە چاپخانەی (ئەلحەوادس) لە (بەغدا) چاپکراوە

ژمارەی سپاردن (٣٥) سالی (١٩٩٠) دراوەتێ

ژمارەی لاپەرە (٢٠٠) قەوارە (١٦ بە ٢٣) سم

**تێکستی یەکەم:**

بابێ بابم شێخ مەحموود، لاپەڕە (٤٠- ٤١)، بەمشێوەیە:

بابێ بابم شێخ مەحموود، لەگەر دەزگای داینایە

بە خۆی لە داریکەلێ، خێوەتی لێ هەردایە

کەریمی فەتاح بەگی، عەسکەری تەعلیم دایە

حەمەی سەید سەلیمی لە دەورەی دا سوڕایە

* * * * *

بابێ بابم شێخ مەحموود، بە خۆی دێ لە ئاکرێیە

لۆی دێ نۆ تابوور عەسکەر، تۆپ و تەیارەی پێیە

شێخ مەحمود دەبتە مەلیك لە ئینگلیزی عاسێ یە

---

١٥- حکوومەتی کوردستان لە سلێمانی- پێشینە و مێژوو، سەرچاوەی پێشوو، لا: ٧٧، ٧٩.

بابێ بابم شێخ مەحمود، تۆ سەرکردەی کوردانی

لۆی دێ نۆ تابوور عەسکەر لە شاری سولێمانی

شێخ مەحمود دەبتە مەلیك خودا بەخۆی دەزانی.

**شیکردنەوەی تێکستی یەکەم:**

ئەم هۆنراوەیەش، ئاماژە بە هەندێك لە ڕووداوەکان دەکات:

١- سوپای شێخ، دەزگای شەڕیان ئامادەکردووە.

٢- شێخ لە (داریکەلی) سەرپەرشتی شەڕەکەی کردووە، هەروەها ملکی خۆی بووە.

٣- دیسان ئاماژە دەکرێتەوە بەوەی کە (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند) وەك سەرکردەیەکی سەربازی، خەڵکی ئامادەکردووە و فێری هونەری شەڕی کردوون. کەسێکیش بەناوی (حەمەی سەید سەلیم) هاوکاری کردووە.

٤- گەڕانەوەی شێخ لە شاری ئاکرێ، هەرچەند نەبیستراوە کە شێخ چووبێتە ئاکرێ، ڕەنگە مەبەست کاریگەری مەعنەوی جووڵانەوەکەی بێ لەو ناوچەیە.

٥- هاتنی نۆ تابوور عەسکەر بە تۆپ و تەیارەوە، کە زیاتر مەبەست لە هاتنی هێزی تورکە بۆ ناوچەی ڕەواندز لە ساڵی (١٩٢١) کە دواتر جووڵانەوەیەکی لێ پەیدا بوو بە هاوکاری نەیارانی ئینگلیز.

**تێکستی دووەم:**

شێخ مەحموود، لاپەڕە (١٢٧):

ڕۆژێ لە ڕۆژان سەر لە بەیانی

جوابەك هاتیە و کەس نەیەزانی

هاتیە لەشکری جەعفەر سوڵتانی

سەدرەك بگێڕێ لۆ بسورمانی

شێخمان، شێخ مەحموود، شای سلێمانی

لە سولەیمانی شێخ مەحموود هەیە

تەیارەك هەستا لە لۆندەرەیە

بیست هەزار عەسکەر سیکە و گورگەیە

پێنجسەت مەترەلۆس، سی تەیارەیە

ئەو پیادەیە، هات بە گەمەیە

ئەو سوارەیە هات، بە بەرپەیە

دەرێن شێخ مەحموود، لە هەنجیرەیە

**شیکردنەوەی تێکستی دووەم:**

١- هاتنی هێزی جەعفەر سوڵتان لە هەورامانەوە، کە ناودارێکی ئەو ڕۆژگارە بووە.

٢- هاتنی تەیارە لە (لۆندەرە)وە، واتە (لەندەن).

٣- باس لە سوپای دوژمن دەکات کە لە بیست هەزار سەرباز، پێنجسەد مەتەرلۆس و سی تەیارە پێکهاتووە.

٤- لەبەرامبەریشدا شێخ و سوپاکەی پیادە بوون و گەمەیان بە شەڕەکە هاتووە.

٥- بوونی شێخ لە (هەنجیرە)، کە لەوانەیە هەر گوندی (قەرە هەنجیر) یان هەنجیرەی ناوچەی تەیناڵ، بێت.

٦- داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا

نووسەر: عومەر شێخەڵلا دەشتەکی

لە چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان

چاپی یەکەم لە چاپخانەی (وەزارەتی ڕۆشنبیری) لە هەولێر چاپکراوە

ژمارەی سپاردن (٢١٠) ساڵی (١٩٩٨) دراوەتێ

ژمارەی لاپەڕە (٢٤٨) قەوارە (١٦ بە ٢٣) سم

**ناوی تێکستەکە:**

شێخ مەحموودی نەبەز، لاپەڕە (٨٢- ٨٤).

ئەم کتێبە چاپی دووەم و فراوانکراوی کتێبی ژمارە (٢)، لەبەرئەوە هەمان تێکستی پێشووە دووبارە بۆتەوە.

## ٧- چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لە مێژووی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند

نووسینی: سەروەر ئەحمەد کەریم

لە سەر ئەرکی هەڤاڵ مام جەلال چاپکراوە

چاپی یەکەم لە چاپخانە و ئۆفسێتی (تیشک) لە سلێمانی چاپکراوە

ژمارەی سپاردنی (٥٢) ساڵی (١٩٩٨) دراوەتێ

ژمارە لاپەڕە (٥٦)ی قەبارە (١٥ بە ٢٢) سم

ناوەڕۆکی ئەم کتێبە چەند کورتە بابەتێکی لەخۆگرتووە، کە زۆربەیان پەیوەستن بە شێخی نەمرەوە، بەڵام تەنیا دوو بابەت نزیکن لە لێکۆڵینەوەکەمان:

- **کەریم بەگ و لاوکە بە سۆزەکەی کاوێس ئاغا**

لە لاپەڕە (٣٩- ٤٠)دا، بەشێك لە لاوکەکەی هونەرمەند کاوێس ئاغای خستۆتەڕوو کە زیاتر تایبەتە بە کەسایەتی کەریم بەگ و[16] هیچ زانیارییەك ناخاتەسەر لێکۆڵینەوەکەمان.

- **کەریم بەگ لە فۆلکلۆر و بەیتی کوردیدا**

لە لاپەڕە (٤١- ٤٢)دا، کورتە سەرەتایەکی بۆ نووسیوە و دواتر ئەم هۆنراوەیەی بڵاوکردۆتەوە:

بابی بابم شێخ مەحموود، لەگەڵ دەزگای داینایە

خۆی لە چیای سورداش و ئۆردووگای لە سەحرایە

چەند قارەمانی جەوهەردار و قوماندااری لەگەڵدایە

کەریمی فەتاح بەگی، عەسکەری تەدریب دایە

لە عەسکەری دەخوڕی، ئیستاعید ڕاوەستایە

---

١٦- هەمان تێکستی لاوکەکەی کاوێس ئاغایە کە لە هەردوو کتێبی ژمارە (٤ و١٠)دا هاتوون، بەڵام پەراوێزی ژمارە (٢٠)ی بۆ کۆتایی لاوکەکە داناوە و لە پاشکۆی کتێبەکە و لیستی پەراوێزەکاندا نووسیویەتی: (گۆڤار ڕەنگاڵە، هاوینی ١٩٩٠، سەقز، جەوهەر کرمانج). بەداخەوە ئەم سەرچاوەیەم گیرنەکەوت، تاکو بزانین لە کێ و لە کوێ وەریگرتووە.

سەلام خزیان لۆ دەکرد، حەربەی لە تفەنگێ دایە
هەموو ڕەختیان لە خۆ دا، ڕۆیین بە شەوی شاری
سەعات لە دوانزەی شەوێ، گەیینە چەمچەماری
حەربی ئیسلام خۆش بوو، لەگەڵ فەلە و کوففاری
قاقەزێکیان دەنووسی، ئەو ئینگلیز و قوتیانی
شێخ مەحموودێك پەیدابوو، هاتیە لە سلێمانی
چەند بەرتیلیان دەدایێ، هیچ بەرتیلی نەزانی

ئەم هۆنراوەیە لە ڕووی ئاوازی شیعرییەوە کەمێك لاوازە، هەروەها هەندێك زانیاری دووبارەی هۆنراوەکانی دیکەی تێدایە، بەڵام دەتوانین ئەم سەرنجانەی لەسەر بنووسین:

١- سەلام خزیان، مەبەست لە (سلام خذ)ی عەرەبییە، کە بۆ سەردارانی سوپا بەکاردێت، دیارە لەو کاتە و لە سوپای شێخدا ئەو جۆرە سیستمە سەربازییە هەبوە.

٢- باس لە شەڕێك دەکات کە لە نیوەشەودا لە ناوچەی چەمچەماڵ، ڕووی داوە.

٣- ئینگلیزەکان ویستوویانە بە موڵك و پارە (شێخ) لە خشتەبەرن.

**٨- کاوێس ئاغا، ١٨٨٩ – ١٩٣٦**

کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی: جەلال مەلا حەسەن خۆشناو
پێداچوونەوە و پێشەکی: غەفوور مەخمووری
لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی میدیا
زنجیرەی کەلەپووری نەتەوەیی (لاوك)
چاپی یەکەم لە چاپخانەی (ماردین) لە هەولێر لە ساڵی (٢٠٠٠) چاپکراوە
ژمارەی لاپەڕە (٩٠) قەوارە (١٥ بە ٢٠) سم

**ناوی تێکستەکە:**

لاوکی شێخ مەحموودی نەمر، لاپەڕە (٣٠- ٣٣).

تێکستی ئەم لاوکە هەندێك جیاوازی هەیە لەگەڵ تێکستی هەردوو کتێبی ژمارە (٤ و ١٠)دا، کە ڕەنگە ئامادەکار باشتر و وردتر لە ئامادەکاری سەرچاوەی ژمارە (٤) گوێی لە لاوکەکە گرتبێت بۆ نووسینەوەی. دەکرێ هەندێ لە جیاوازییەکان بەم شێوەیە ڕیزبکەین:

١- لە پەرەگرافی یەکەمی لاوکەکەدا، لە دوای (تێ گرێنا تەیاران و گرگرا مەتەریۆسا) لەمەیاندا نووسراوە، ( شرقینێ مەتەرلۆزان، ڕنگینێ بۆمبا، و ڕشێنێ ترومبێلا، برا گازە گازێ نۆیەت دلرا).

٢- لە پەرەگرافی دووەمدا، لە لاوکی یەکەم تاکو (هەچی گاڤا دەستێ خوە بدەمە دارێ جامبێزارێ)ی تێدایە، بەڵام لەمەیاندا (بکوژم کافران، خەلاس بکەم تۆڤێ (کەبتان بێلا)، هاتووە. لە ڕاستیدا (کابتن بێلّ)ە کە یاریدەدەری حاکمی سیاسی بووە لە سلێمانی، دواتر گوێزراوەتەوە بۆ ڕەواندز.

٣- لە تێکستی پێشتردا ناوی (لۆندەرێ) نەهاتووە، بەڵام لەمیاندا ئامارەی پێدەکات.

٤- لە پەرەگرافی کۆتاییدا، باس لە بێ ئیمدادی کراوە، بەڵام لە دەقەکەی پێشتردا باس نەکراوە.

### ٩- رویدانێن سالا (١٩١٩) ل دەڤەرا بادینان د سترانا دیروکی یا کوردی دا لێکۆڵینەوە

نووسەر: د. سەلاح محەمەد هروری

چاپی یەکەم لە چاپخانەی (زانکۆی دهۆك) لە دهۆك چاپکراوە

ژمارەی سپاردن (٤٠٢) ساڵی (٢٠٠٤) دراوەتێ

ژمارەی لاپەڕە (٦٦) قەوارە (١٥ بە ٢٠) سم

ناوەڕۆك:

ئەم کتێبە جیاوازترە لەوانەی پێشتر، چونکە تاڕادەیەك لێکۆڵینەوەی لەسەر کاریگەری ڕووداوی (١٩١٩) کردووە لە هەندێك ناوچەکانی بادینانـدا، هەروەها لە ناوچەی سلێمانیش، چونکە لە لاپەڕە (١١)دا باس لە گەڕانەوەی عوسمانییەکان و

سپاردنی ناوچەی سلێمانی بە شێخی نەمر، دەکات. بەڵام نە کتێبەکەیی و نە بابەتێکی بەناوی شێخەوە ناونەناوە.

**١٠- چەند بابەتێن دیروکی د سترانا دیروکی یا کوردی دا**

پێداچوون و ئامادەکردن: د. سەڵاح هروری

لە بڵاوکراوەکانی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد

چاپی یەکەم لە چاپخانەی (شڤان) لە سلێمانی لە ساڵی (٢٠٠٤) چاپکراوە

ژمارەی لاپەڕە (١٩٦) قەوارە (١٧ بە ٢٣) سم

ئەم کتێبەش تاڕادەیەك هاوشێوەی کتێبەکەی پێشووتریەتی، بەڵام فراوانترە و بەتایبەتی باس لە هەمان ڕووداوی کتێبەکەی تری دەکات، لەگەڵ جیاکردنەوەی بابەتێك لە ژێر ناونیشانی (بزاڤا شێخ مەحمودی یا سالا (١٩١٩) د سترانا دیروکی دا)، لەگەڵ لاوکەکەی کاوێس ئاغا.

بێگومان ئەم سەرچاوەیە، لە ڕووی زانستییەوە بە گرنگترین و نوێترین سەرچاوە دادەنرێت کە بۆ شیکردنەوە و یەکالاکردنەوەی بابەتێکی نزیك لە بابەتەکەی ئێمە، پشتی بە فۆلکلۆر بەستبێت. بەڵام لە لاپەڕەی پاشکۆی تێکستەکەدا ئامارەی بە سەرچاوەی وەرگیراوی لاوکەکە نەکردووە، هەروەها لە سەرچاوەکاندا ئامارەی بە کتێبی ژمارە (١)ی ئەم لێکۆڵینەوەیە کردووە، هەروەك پێشتر باسمان کرد، تێکستی ئەو کتێبە جیاوازە لەم تێکستەی د. سەڵاح هروری بڵاویکردۆتەوە، بەڵکوو دەقاودەق تێکستی کتێبی ژمارە (٤)ی ئەم بیبلیۆگرافیایە. کە دەبوایە بە ڕوونی ئامارە بە سەرچاوەی تێکستەکە بکات، چونکە لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوهادا نەدەبوایە ئەو هەڵەیە بکات.

**دوای ئەم (١٠) کتێبە، توانیمان ئەم دوو بەرهەمە بڵاونەکراوەیەش بخەینەسەر لێکۆڵینەوەکە:**

تێکستی یەکەم:

هۆنراوەیەك بەناوی (شێخ مەحموود)[١٧]:

---

١٧- لە خاتوو شوکریە میران ڕەشید وەرگیراوە کە دایکی مامۆستا (تاڵب شێخ عەبدولسەمەد سەرانی)یە، کە بەپێی گوتەی خۆی زیاتر لە زاراوەی ناوچەی خۆشناوەتی و ڕەواندز دەچێت.

## شێخ مەحموود

بابێ بابم شێخ مەحموود، دەگەر دەزگای داتنایە
پایتەختی لە سولەیمانی، خێوەتی لێ هەردایە
کەریمی فەتاح بەگی، عەسکەری تەعلیم دایە
دووسەد فەلەی تەیاری[18] لە کەرکووك بەرێکرایە
حەبیبی شێخ سەمەدی لەوێ شەهید کرایە

* * * * * *

بابێ بابم شێخ مەحموود، بەخۆ و بە سێ ئامۆزا
لۆی هات دوو تابوور عەسکەر، بە تۆپ و مەترەلۆزە
شێخ مەحموود قومانداربی، دنیا نابی ئارۆزە

* * * * * *

بابێ بابم شێخ مەحموود، کە حوکمێ خۆی دەگێڕی
لۆی هات دوو تابوور عەسکەر، لەلای کاولە گوێری
شێخ مەحموود قومانداربە، خودا لێی وەرنەگێڕی

لەگەڵ ئەوەی زۆر لە پەرەگرافی دووەمی هۆنراوەی کتێبی ژمارە (٢) دەچێت، بەڵام دەتوانین لەم کورتە هۆنراوەیەش، ئەم سەرنجانە وەربگرین، کەلە تێکستەکانی دیکەدا نەهاتوون:

١- لە هیچ یەکێك لە دەقەکاندا، ئاماژە بە شاری سلێمانی نەکراوە، وەك پایتەخت.

٢- ئاماژەکردن بەناوی شەهیدێکی نەمر (حەبیبی شێخ سەمەدی).

٣- بەپێی ئەم هۆنراوەیە، شێخی نەمر سێ ئامۆزای خۆی لەگەڵدا بووە.

---

١٨- فەلەی تەیاری: مەبەست لە مەسیحی یان ئاشوورییەکانی باکووری کوردستانە، کە لە شەڕی جیهانی یەکەمدا لە ناوچەی هەکارییەوە چوونە ناوچەی ورمێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و دواتر لەلایەن کاربەدەستانی ئینگلیزەوە گوێزرانەوە بۆ عیراق و هێزی (لیڤی)یان لێ پێك هێنرا کە بەشێکی چالاکییەکانی لێدانی کورد بوو.

تێکستی دووەم:

هەروەها بە سوپاسەوە، فۆلکۆریستی ناوچەی گەرمیان (هەردەوێڵ کاکەیی)، ئەم سێ کۆپلە بەیتەی لەناو کەشکۆڵی بەرگی چوارەمی (هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان) بۆ ناردین:

هەی داد هەی بێداد، نەمەن هۆشم
شێخ مەحموود یەخسیر، بۆیە ڕەشپۆشم
* * * * * *
بابۆی شێخ لەتیف، زەعیمی کوردەن
وەرانوەر دوژمن، وە دەست و بوردەن
* * * * * *
ئاخم پەرێ[19] شێخ، بەند و یەخسیرەن
چە شارێ بەغدا، دەست وە زەنجیرەن

هەرچەند لە ڕووی زانیارییەوە، هیچمان لەم سێ کۆپلەیە وەگیر ناکەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سۆز و هەست و سەرنجی ئەو کۆمەڵە، یان پێکهاتەیەکی دیکەی کۆمەڵگای کوردیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە هەم لە ناوچەی گەرمیان، هەم لەسەر ئایینزای کاکەیین، کە بە تێڕوانینێکی کوردپەروەرانەوە ڕوانیویانەتە شێخ و حکومەتەکەی، ئەوانیش بە ئاواتی فراوان بوونی ئەو دەسەڵاتەوە بوون، چونکە زاراوەی هۆنراوەکان لە شێوەزاری کاکەییەکانی گەرمیان دەچێت، لەبەرئەوەی تێکەڵکێشی هەورامی و گەرمیانییە.

١٩- پەرێ: بۆ.

# ئه نجامگیری

جگەلەوەی توانیمان هەندێك تێكستی بڵاوكراوە و بڵاونەكراوەی فۆلكلۆری كوردی دەربارەی شێخی نەمر و حكوومەت و ڕووداوەكانی ئەو سەردەمە، لێرەدا كۆبكەینەوە، هەروەها چەند ئەنجامێكمان وەگیركەوت:

• هەرچەند سەرهەڵدان و كۆتایی هاتنی شێخ و مەملەكەتەكەی، مێژوویێكی ئەوەندە دووری نییە، واتە لەكاتێكدا بووە كە تاڕادەیەك مێژوونووسانی كورد و بیانی ڕووداوەكانیان بە نووسین تۆمار كردووە، بەڵام هێندە كاریگەر بووە، خەڵكانی نەخوێندەوار و سادە و ساكاریش هەست و سۆزی خۆیان بۆ چڕیوە و ئەوەندەی دیكە فۆلكلۆری كوردییان دەوڵەمەندتر كردووە.

• ئەوەندەی لە فۆلكلۆری ناوچەكانی دیكەی كوردستاندا دەنگی داوەتەوە، هێندە لە فۆلكلۆری ناوچەی سلێمانیدا بەرجەستە نەبوە. ئەو كارەسات و قارەمانی و سەروەرییە، لە تێكستی كۆكراوەی ناوچەكانی هەولێر و بادینان و گەرمیان، تەنانەت ئێریڤاندا، فرەتر دەنگی بۆ هەڵبڕاوە و شاكاری جوان و شایستەی بۆ گوتراوە. تەنانەت لە ڕووی ناوەڕۆكیشەوە جیاوازییان هەیە، چونكە ئەو پێنج دوو بەیتییەی لە كتێبی ژمارە (٣)دا هاتووە، جگە لە كەمی، لە ڕووی بابەتەوە لاوازن.

• لەگەڵ ئەوەی شێخی نەمر كەسایەتییەكی ئایینی ئیسلامی كوردی و لە یەكێك لە بنەماڵە هەرە ناودارە ئایینییەكان بووە، كەچی لە فۆلكلۆری ئێزدییەكان و كاكەییەكاندا، هەروەها لەسەر دەنگی كەسێكی وەك كاوێس ئاغا، كە لەسەر ئایینی مەسیحی بووە گۆرانی بۆ گوتراوە، كە دیارە هەستە نەتەوایەتییەكە لەناو هەموو پێكهاتەكانی كوردستاندا زاڵ بووە بەسەر ئایینییەكەدا و لە زۆربەی ناوچەكانی كوردستاندا چاویان تێبڕیوە و چاوەڕێی فراوانبوونی ئەو دەسەڵاتە بوون.

● له (٧) کتێبی تایبەت بە کۆکردنەوەی تێکستی فۆلکلۆری کوردی، هۆنراوە و گۆرانی لەسەر شێخی نەمر بەشێوەی ڕێکەوت و تێکەڵ بەبابەتی هەمەجۆر، کۆکراوەتەوە، بەڵام هیچ کەسێك بەتایبەتی بەشوێن تێکستی فۆلکلۆری کوردیدا نەگەڕاوە کە باس لە کارەسات و مێژووی ئەو کەسایەتییە بکات، بێگومان ئەگەر ئەو کارە بکرایە، بابەت و هۆنراوەی پترمان وەگیر دەکەوت. چونکە بەهۆی هەندێك گەڕان و پرسیار کردن، توانرا چەند کۆپلە هۆنراوەیەکی فۆلکلۆریی بڵاونەکراوەمان وەگیربکەوێت، کەواتە ئەگەر بەتایبەت بگەڕێین بە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا، بێگومانین لەوەی کە تێکست و بەرهەمی بڵاونەکراوەمان دەست دەکەوێت.

● له ئێریڤان کتێبێك و لە بادینان چوار کتێب و لە ناوچەی هەولێر سێ کتێب و لە ناوچەی سلێمانیش لە دوو کتێبدا، بابەت و هۆنراوە و لاوکی فۆلکلۆری لەسەر شێخی نەمر کۆکراوەتەوە، کە دەتوانین لاوکە بەسۆزەکەی کاوێساغا بە باشترینیان هەڵبژێرین، چونکە تێکستێکی دەنگ ئامێزی بە سۆز و ناودارە.

● لە ناوەڕۆکی دوو کتێبدا کەڵك لە فۆلکلۆر وەرگیراوە لەپێناوی ئەم بابەتەدا، کە یەکێکیان فراوانتر و باشتر شیکردنەوەی بۆ کردووە، بەڵام ئەویش بە شوێن تێکستی نوێدا نەگەڕاوە و کەمتر ناوی فۆلکلۆری هێناوە.

● لە زۆربەی تێکستەکاندا کۆمەڵێك مێژوو، زانیاری، کەسایەتی، شوێن، بەکارهێنانی تەیارە و تۆپ و چەکی قورس، باسکراوە و دووبارە بۆتەوە، کە دوای قارەمانی و بلیمەتی شێخی نەمر، دەتوانین کەسایەتی (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند) هەڵبژێرین، کە لە زۆربەی تێکستەکاندا بەرز و پیرۆز و بوێر، ناوەزەند کراوە.

● زۆربەی هۆنراوەکان بە دەستەواژەی (بابێ بابم شێخ مەحموود) دەست پێ دەکات.

# شێخ مەحموود: سەرهەڵدان و شکستی سەربەخۆیی باشووری کوردی لە کوردستانی عێراقدا، پاش جەنگی جیهانی یەکەم

نووسینی: ودیع جوەیدە
گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە
محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق

## پێشڕەوی کردنی بەریتانیا لە باشووری کوردستاندا:

لە مارتی ١٩١٧ دا بەریتانیا بەغدای داگیرکردو ئەم کارەش هێزەکانی بەریتانیای لە میزۆپۆتامیادا نزیکخستەوە لە خێڵەکانی باشووری کوردستان. لەو دەمەدا ئیعتیباراتی سیاسی وایکردبوو کە شەڕی سەربازی دژی فراوانبوونی کاریگەریی بەریتانیا لەم ناوچەیەدا بەرپا بێت [1]. بەم پێیە لە ماوەی داگیرکردنی ناوچەی خانەقین لە لایەن ڕووسیاوە، کە لە نیسان بۆ حوزێرانی ١٩١٧ی خایاند، بەریتانییەکان پەیوەندییەکی لاوازیان هەبوو تەنها لەگەڵ چەند کەسێکی خێڵەکیی کورددا و بە تایبەتی لەگەڵ مستەفا پاشای سەرۆک هۆزی باجەڵاندا [2]. پاش کشانەوەی ڕووس لە خانەقین جارێکی تر تورك داگیری کردەوەو تێیدا مایەوە تا کاتی داگیرکردنی لە لایەن بەریتانیەکانەوە لە دیسەمبەری ١٩١٧ داو [3] لەوەبەدواوە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ کوردەکاندا دروست کرد.

## پەیوەندیی بەریتانیا لەگەڵ خێڵە کوردەکاندا:

بەریتانیەکان کەوتنە کار بۆ چەسپاندنی جێ پێی خۆیان لە خانەقینداو پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ باجەڵاندا دامەزراندو وردە

---

[1] ئینگلیزەکان بە ئاشکرا حەزیان نەدەکرد بچنە ناوچەی خانەقین لەبەر دوو هۆ: یەکەم دەستە سەربازییەکانی بەریتانیا لە بەغدا نەیاندەویست هیچ جۆرە هەستیارییەك بورووژێنن لەگەڵ هاوپەیمانە ڕووسەکانیاندا کە پێدەچوو نەخوازن بەریتانییەکان بوون و نوێنەرایەتییان هەبێت لەو دەڤەرەی ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا. دووەم ترسی ئەوە هەبوو کەوا ئەگەر ڕووسەکان دواجار ناچارکران لە خانەقین بکشێنەوە، ئەوە بوونی نوێنەرایەتییەکی بەریتانی لەگەڵیان زیان بە شکۆی بەریتانیا بگەیەنێت (بیڵ: پێداچوونەوەی بەڕێوەبەرێتی مەدەنی ل، ٤٤– ٤٥).

[2] لە بارەی چالاکییەکانی مستەفا پاشای سەرۆك هۆزی باجەڵان بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل٤٢– ٤٥، ڕاپۆرتەکانی بەڕێوەبردن لە ساڵی ١٩١٨دا: ناوچەی خانەقین، ل٢٤، درایڤەر: "مەسەلەی کورد"، ل١٠٧.

[3] بیڵ: پێداچوونەوەی بەڕێوەبەرێتی مەدەنی، ل٤٦.

ورده چونه ناو هۆزو خێڵەکانی تری ئەو ناوەوەو لە کۆتایی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٧دا بەریتانیەکان پەیوەندییان لەگەڵ شێخ حەمیدی تاڵەبانیدا بەست و زانییان کەوا هۆزەکەی ئەم و هۆزەکانی تری ناوچەکە سەرکەوتووانە بەرەنگاری داواکارییەکانی تورك بوونەتەوە بۆ هاوکاریو یارمەتیدانیان. سەرۆك هۆزی تاڵەبانی، کە هێزەکانی خۆی لە ناوچەی (گل)دا کۆکردبۆوە لە ڕۆژهەلاتی تاووغەوە، هێزی سوارەی خێڵەکانی تریشی چووبووە پاڵ. شێخ حەمید تەنها پشتی بە هێزی خێڵەکەی خۆی نەبەستبوو بەڵکو هێزی خێڵی داودەی هاوپەیمانیشی لەگەڵ بوو[٤].

لە پێشدا ئینگلیز وا خۆیان دەرخست کە تەنها دەیانەوێت پەیوەندیی دۆستانەیان لەگەڵ ئەم هۆزانەدا بپارێزن و هانیان بدەن نەهێڵن دانەوێڵەو کەلوپەلی پێویستیان پێبگات. ئەمان لەم کارەیاندا سەرکەوتوو بوون بەلام خۆیان لەوە دەپاراست و دنەیان بدەن بۆ ئەوەی هەڵکوتنە سەر تورکەکان چونکە دەرفەتی ئەوەیان نەبوو هیچ یارمەتییەکیان بدەن.

لە بەهاری ساڵی ١٩١٨ دا هێزەکانی بەریتانیا بە توندی پێشڕەویان کردو لە ماوەیەکی کەمدا کفری و توزخورماتوو و کەرکووکیان گرت و ئەم چوونەپێشەوەیە زەمینەی بۆ بەریتانیەکان سازکرد پەیوەندیی نزیکتر لەگەڵ شێخ حەمیدی تاڵەبانیدا گرێ بدەن[٥]. ئێستا بۆ یەکەمجار هێزەکانی کورد دژ بە تورك بەکارهێنران هێزێکی کورد کە لە نزیکەی دووسەد پیاوی باجەلان و دەلۆو سورەمیری پێکهاتبوو، لە نیسانی ١٩١٨دا پەلاماری تورکیان دا لەسەر سیروان[٦].

---

[٤] هەمان سەرچاوە.

[٥] کفری لە ٢٨ی نیسان، توزخورماتوو لە ٢٩ی نیسان و کەرکووك لە ٧ی مایسی ١٩١٨دا داگیرکران، بڕوانە ئەی.تی ویلسن: دلسۆزان Loyalties، ل٨- ٩.

[٦] ئەم هێزە کە لەلایەن مێجەر سۆنەوە سەرکردایەتیی دەکراو لە لایەن کاپتن گیردەوە ڕێکخرابوو وەك بەشێك لەو ڕەتلە شەڕی دەکرد کەوا کۆلۆنێل ئەندەرهێل سەرکردایەتیی دەکرد. بە پێی ڕاپۆرتەکان لەم شەڕانەیان لەگەڵ تورکەکاندا ئەنجامی باشیان بەدەستهێناوە. بڕوانە فرێدریك جیمس مۆبەرلی: شەڕ لە میزۆپۆتامیادا، کە لە کتێبەکەی ئەی.تی. ویلسن Loyalties وەرگیراوە.

پاشان بەریتانیەکان چاویان ناوچەکانی ئەودیوی سنوور لە ڕۆژهەڵاتی خانەقیندا کە بۆ ماوەیەك لانکەی پیلانگێڕی بوو لە دژیان. ئێرە لە ڕووی ستراتیجەوە ناوچەیەکی بایەخدار بوو ڕێگەی گرنگی نێوان کرمانشا- بەغدای پێدا تێپەڕ دەبوو و کۆنترۆڵی هێڵەکانی پەیوەندیی نێوان میزۆپۆتامیا و ئێرانی دەکرد، کەوا گیرۆی خواردبوو بە دەست شەڕو شۆڕی بەردەوام و لە یاسا هەڵگەڕانەوەیەکی بەردەوامەوە. بەکرێگیراوانی ئەڵمان و تورك، دیموکراتەکانی ئێران و تیرەو هۆزی ناوچەکە لە جموجووڵی بەردەوامدا بوون لە دژی بەریتانیەکانی داگیرکەری ئەم ناوچانە. ئەمانە گەلێ کردەوەی وەڕسکەریان ئەنجام دەدا وەك تێکشکاندن و وێرانکردنی دام و دەزگای سەربازیی بەریتانیو پەلاماردانی شوێنە چەپەك و دوورە دەستەکان وبچڕاندنی هێڵەکانی پەیوەندیی، بەڵام بەریتانییەکان، بە هاوکاری تیرەو هۆزەکانی سەر بە خۆیان، فرە جار ئەم هەوڵانەیان پووچ دەکردەوە.

لەم سەروبەندەدا بوو کەوا تاقمە ناحەزەکانی باجەلان و گۆران کەرەستەو ئامێری کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ- ئێرانییان لە چیا سورخی نزیك خانەقین تێك و پێك دابوو، لە هەمان کاتیشدا تاقمێك لە هۆزی ناحەزی کەلهوڕ لە بۆسەیەکدا پەلاماری تیمێکی ڕووپێویی بەریتانییان دابوو. هەروەها سەرۆك هۆزی سنجابی عەلی ئەکبەر خان، کە سەرۆکی سەنجابیو گۆرانی هاوپەیمان بوو، چالاکانە ڕێی بە کاروانی کەلوپەل و پێداویستیی خانەقین دەگرت. لە نیسانی ساڵی ١٩١٨ دا هەردوو هۆزی قەڵخانی و کەلهوڕ، بە پاڵپشتی ڕەتلێکی هێزەکانی بەریتانیا توانییان هێزەکانی عەلی ئەکبەر خان ببەزێنن و پەرت و بڵاویان بکەنەوە، کە هەماهەنگی لەگەڵ سلێمان میرزای دیموکراتی ئێراندا کردبوو و لەگەڵ بەکرێ گیراوانی ئەڵمان و تورکیشدا پیلانگێڕیی دەکرد[٧]. لە پاش گرتنی سلێمان میرزا، عەلی ئەکبەر خان هەر بەردەوام بوو لەسەر پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ بەکرێگیراوە ئەڵمان و

---

[٧] عێراق "بەڕێوەبەرێتی بەریتانیا"، ڕاپۆرتلەسەر بەڕێوەبردن ساڵی ١٩١٨: ناوچەی خانەقین، ل٣٢- ٣٣، هەروەها ویلسن: دڵسۆزان، ل٨٤.

تورکەکاندا. دواجار وەك باس دەکرێت لەگەڵ ڤۆن درۆفل ی بریکاری ئەڵماندا ڕێککەوتووە کە سنجابی و خێڵە هاوپەیمانەکانی چەکدار بکرێن لە دژی بەریتانیا و پاشان بە بریندارى هەڵاتووە لە شەڕێکی دژ بە بەریتانیادا و کەنارگیر بووە[8].

## یەکەم پێشنیاری شێخ مەحموود بۆ بەریتانیەکان:

لە پاش کرداری سەرکەوتووی سەربازیی بەریتانیا، کەوا گرنتی سلێمان میرزای لێکەوتەوە، مێجەر گۆڵد سمیسی ئەفسەری سیاس بەرپرسی خانەقین کەوتە ئەنجامدانی گەشتێکی پشکنین لە دێهاتی دەوروبەریدا. لەم دەمەدا شێخ مەحموود، کە دواتر ڕۆڵێکی بایەخداری گێڕا لە مێژووی کوردستانی باشووردا، یەکەمجار بوو ناوی بکەوێتە ناو ناوانەوە. بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی ڕەسمی بەریتانی کەوا "لەم گەشتەدا بوو کە شێخ مەحموود لە سلێمانییەوە نوێنەری خۆی نارد بۆ چاوپێکەوتنی ئەفسەری سیاسی‌و داوای کرد وەك نوێنەری حکومەتی بەریتانیا لە سلێمانی دەستبەکار بێت، تا ئێمە دەگەین[9]".

سەرکەوتنەکانی بەریتانیا بە ئاشکرا کاریگەردبووە سەر کوردەکان و بڕیاریان دابوو بدەنە پاڵ لایەنی براوە. بەریتانیا نامەیان لە هەمەوەندەوە پێگەیشتبوو، کە هۆزێکی جەنگاوەری بەرچاو بوو لە کوردستانی باشووردا جاڕی ئامادەییان دابوو بۆ هەر هاوکارییەك لێیان بخوازرێت. لە کۆبوونەوەیەکی سەرۆك و پیاو ماقووڵانی کورددا کە لە سلێمانی بەسترا بڕیاریان دا حکومەتێکی کاتی دامەزرێنن بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود و هەڵوێستێکی دۆستانە بنوێنن لە ئاست بەریتانیادا[10]. بە پێی ڕاپۆرتێکی سێر ئەرنۆڵد و یڵسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنی:

---

[8] هەمان سەرچاوە، ل٣٢- ٣٣.

[9] هەمان سەرچاوە، ل٣٢- ٣٣.

[10] ویڵسن، ل٨٦، بێل ل٤٨؛ درایڤەر، "مەسەلەی کورد"، ل١٠٨- ١٠٩.

"شێخ مەحموود خۆی نووسیبووی (لە جیاتی هەموو گەلی کورد لە هەردوو بەری سنوور) ئامادەیی دەربڕیوە حکومەتمان تەسلیم بکات یان وەك نوێنەری ئێمە کاربکات لە ژێر سێبەری ئالآی شکۆداری بەریتانیادا. ئەو دەڵێ کەوا میللەتی کوردستان خۆشحاڵن بە سەرکەوتنمان و بەهۆی هێزە قارەمانەکانمانەوە لە دەسەڵاتی ملهوڕی تورکی ڕزگاریان بووە و چاوەڕوانین لە ژێر فەرمانڕەوایی ئێمەدا ببوژێنەوە. پاشان بەوە کۆتایی پێدێنێت کە داوای زەمانەتێك دەکات کەوا ئێمە لە هیچ حاڵەتێکدا ڕێگە بە گەڕانەوەی دەسەڵاتدارانی تورك نەدەین بۆ کوردستان"[١١].

## کشانەوەی بەریتانیا لە کەرکووك:

بە پێی ویڵسن، کاتێ بەریتانیا بڕیاری داوە لە مایسی ١٩١٨ دا کەرکووك چۆڵ بکات، ئەو ناچار بووە کوردەکان ئاگادار بکاتەوە کە بەریتانیا لەبەر کەشو هەوای گەرم شارەکە چۆڵ دەکات و بە نیازن زوو بگەڕێنەوە. هەروەها دەڵێ: "من پێشنیاری شێخ مەحموودم پێ پەسەند بوو کە نوێنەرمان بێت ئەگەر بتوانێ و بە فیعلی ڕاگەیاندنێکی گشتیشمان لەو بارەیەوە دەرکرد"[١٢].

بەڵام ئەم ڕاگەیاندنە هەرگیز دەرنەکراو هەر کە کەرکووك چۆڵ کرا لە لایەن بەریتانیەکانەوە لە ٢٤ ی مایسدا دەسبەجێ لە لایەن تورکەکانەوە

---

[١١] ویڵسن، ل٨٦؛ بێل، ل٤٨.

[١٢] ویڵسن Loyalties ل٨٦-٨٧. ڕاپۆرتێکی ڕەسمی بەریتانی کە باسی لە دامەزراندنی شێخ مەحموود دەکات و ئەو ئیجراناتانەی ئینگلیزەکان نیازیان بووە بیکەن بۆ پاڵپشتی کردنی. ڕاپۆرتەکە بەمجۆرە باسی دەکات: "لە سەرەتای حوزێراندا لە کۆمیسیۆنی مەدەنییەوە نامەیەك نێردرا بۆ شێخ مەحموود و ئەویان وەك نوێنەری بەریتانیا لە سلێمانی و دەوروبەری داناوە. لە هەمان کاتیشدا پلان داتراوە بۆ ناونووس کردنی لێڤیی کورد لە ناوچەی خانەقیندا تاوەکو ئەفسەرە بەریتانیەکان هێزێکی غەیرە نیزامی لەسەر سنووری باکووری ناوچەکە دامەزرێنن و دەست بکەن بە ناونووسینی لێڤی لە سنووری هەڵەبجەدا کە لێیانەوە نزیکە. ئامانج لەمەش چەسپاندنی پێگەی شێخ مەحموود بوو، کاتێ کەرکوکیش گیرا دەرکەوت کە ئەم پلانە سەرکەوتوو بوو". ڕاپۆرتی بەڕێوەبەرێتی ساڵی ١٩١٨: ناوچەی خانەقین، ل٣٢.

داگیرکرایەوە. لە هەمان کاتیشدا هێزێکی تورك چوو بۆ سلێمانی و جارێکیتر گرتیەوەو ئەحکامی عورفی تێدا جاڕ درا[١٣]. شێخ مەحموود گیراو ڕەوانەی کەرکووك کراو لەوێ خرایە بەندیخانەوە. ئەو پیاوماقوولانەش سەر بە شێخ بوون گیران یان غەرامەکران و بێحورمەتی و سووکایەتییەکی زۆر بەو کەسانە کرا کە سەر بە حکومەتەکە بوون[١٤].

بێگومان هەندێ کەس زەبرو سزای قورسی تورکیان پێگەیشت[١٥]، بەڵام بە گشتی پێدەچوو تورکەکان ڕادەیەکی نا سروشتی نەرمییان پیشان دابێت و ئاقڵانە خۆیان پاراست لە ئیجرائاتی توندو تیژ. ئەوان لەبەرئەوەی نەیاندەخواست خۆ بخەنە بەر مەترسی هەرا و هەڵچوونی خێڵەکان چونکە لە بارودۆخێکدا نەبوون چاریان بکەن لەو سۆنگەیەوە ئازاری شێخ مەحمودیان نەدا و پاش بەسەر بردنی ماوەیەك لە بەندینخانەی کەرکووکدا بەریانداو ڕێگەشیان دا بگەڕێتەوەبگەڕێتەوە ماڵی خۆی[١٦]. هەروەها هیچ تالان و بڕۆیەك نەکرا وەرهەق بە ماڵ و سامانی خەڵك و عەشایەر. سوپا هەر پێداویستییەکی هەبوایە بە کاش پارەکەی دەدا و هێزە خێڵەکیەکانی لێڤی لە کاتی خۆیدا مووچەی خۆیان وەردەگرت. ئەم هەڵوێستی ڕازیکردنە لە لایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە کاریگەریی باشی هەبوو بۆ ڕاکێشانی هۆزەکان بە لای خۆیاندا و بەو پێیە زۆرێك لە خەڵك بە شێوەیەکی خۆبەخشانە دایانە پاڵ تورك، هەرچەندە ئاگاداریی ئەوەیان پێداوین کە هەندێ کەس بە زۆر ناچار کراون بچنە خزمەتیانەوە[١٧].

وا پێدەچێت کشانەوەی بەریتانیا لە کەرکووك بە هۆی تێکچوونی باری سەربازییەوە بووبێت لە هەرێمی قەوقاز و گریمانەی ئەرك و

---

[١٣] ئەی.تی. ویلسن، Loyalties، ل٩.

[١٤] هەمان سەرچاوە، ل٤٨٧ بێڵ، ل٤٤٨ درایڤەر، ل١٠٨.

[١٥] بە پێی درایڤەر "تورك سزای هەموو ئەوانەیان دابوو کە پشتیوانییان لە هاوپەیمانان کردبوو، شێخی لێبەدەر"، درایڤەر، "مەسەلەی کورد"، ل١٠٨.

[١٦] ویلسن، بێڵ: هەمان سەرچاوە.

[١٧] درایڤەر، مەسەلەی کورد، ل١٠٨.

بەرپرسیارێتی قورسی بووبێت لە ئێراندا لە لایەن فەرماندەیی لەشکری بەریتانیا وە لە میزۆپۆتامیا. ئەم بارودۆخە بوو بە هۆی تێکچوونی شیرازەی هەموو هۆکارێکی گواستنەوەی ڕێگاکانی ئێران[18].

کشانەوە لە کەرکووك زللەیەکی توند بوو بۆ شکۆ و ناوبانگی بەریتانیا لە کوردستاندا و ڕاستێکەی لە سەرانسەری میزۆپۆتامیاشدا و بەریتانیا بەردەوام بە دەست کاریگەری ئەم مەسەلەیەوە دەینالاند بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە دوای بردنەوەی جەنگی جیهانی یەکەم. کوردەکان کە هەڵوێستی خۆیان لە مەڕ بەریتانیا ئاشکرا کردبوو وا ئێستا دوو دڵی و گومان تەنگی پێهەڵچنیون و باوەڕیان بە هێزو بەڵێنەکانی بەریتانیا بەخراپی لەق بووە. ویڵسن کاردانەوەی سەرکردە کوردەکان سەبارەت بە کشانەوەی بەریتانیا لە کەرکووك باس دەکات کە ئەفسەرە سیاسییەکان بە کوردیان دەدا لەمەڕ پشتگیری و هاوکارییان:

"ئەوان ئەوەیان بە تەواویی لا ئاشکرا بوو کەوا ئەو زەمانەتی پشتگیرییە لە خۆڕا لە لایەن ئەفسەرە سیاسییە نامەسئوولەکانەوە پێیان دراوە و بە زمنی لەو پێشنیارانەی لە کەرکووك لە لایەن بولارد و لە کفری لە لایەن لۆنگریگەوە باس دەکران جێی متمانە نەبوون و لای ئەوان وا کەوتووەتەوە کە ئێمە هەمان گەمەکەی ڕووسیا دەکەین لە بەکارهێنانی دزێوی هۆزەکاندا وەك چنگە پشیلە. سەرۆکەکانی ئەوان، کەهەندێکیان سەرۆکی دەم ڕاستی هەمەوەندن بەڕێوە بوون بۆ کەرکووك لە کاتی کشانەوەکەدا، بەلام بەو پەڕی ڕق و تووڕەییەوە گەڕانە ماڵی خۆیان. ئەوان وا هەست دەکەن کە ئێمە ناپاکیمان لەگەڵ کردوون، چونکە وا هەست دەکەن کە ئێمە هانمان داون خۆیان بۆ تورکی دوژمن دەربخەن و پاشان فریومان دان. سەرۆکەکانی هەمەوەند بە تایبەتی قەت لێمان خۆش نابن و بۆ چەندین ساڵی تر وەك ناحەز لە گەڵمان هەڵسوکەوت دەکەن"[19].

---

[18] بێل، ویلسن: هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

[19] ئەی. تی. ویلسن: دڵسۆزان، ل٨٨.

تورکەکان وەك چاوەڕوان دەکرا، کشانەوەی بەریتانیایان لە کەرکووك تا پەڕی ئەوپەڕ بەکارهێناو ئەمەیان گێڕایەوە بۆ باری ناسك و لەسەر پلی هاوپەیمانان لە بەرەی ڕۆژئاوادا و بەوەیان دانا ڕێخۆشکەرێك بێت بۆ کشانەوە لە میزۆپۆتامیا. بە پێی قسەی ویلسن پڕوپاگەندەی تورکی باس لە کاریگەریی مەسەلەی "ئینگلیزی فێڵباز" دەکرد، کاتێ کە میللەتانی تر بەکاردێنێت بۆ شەڕی خۆی. کتێبەکەی نامیلکەیەکی پڕوپاگەندەی تورکی گواستووەتەوە کە ژمارەیەك کارەساتی تێدایە بە هۆی ئەو کەسانەوە کە فریویان خواردووە و بوونەتە ئەڵقە لەگوێی بەریتانیەکان و هەڕەشەی ئەنجامی خراپی ئەوانە دەکات کە بەرەی تورکیان بەجێهێشتووە و لە هەمان کاتیشدا بەڵێنی خەڵات و بەراتی گەورە دەداتە ئەوانەی هەڵوێستیان نەگۆڕیوەو بە دڵسۆزی تورکیا ماونەتەوە[20].

ویلسن باس لەوە دەکات کەوا هیچ ئاگایەکی لە بڕیاری چۆڵکردنی کەرکووك نەبووەو بە جەختکردنەوە باسی ئەوە دەکات کە نە ئەو نە ئەفسەری سیاسی شوێنەکە، مێجەر ڕیدەر بۆلارد (دواتر بوو بە سێر ڕیدەر بۆلارد) هیچ زانیارییەکیان نەدراوەتێ کەوا داگیرکردنەکە جێگیر و بەردەوام نابێت. ڕاستێکەی ئەو بە چەند ڕۆژێکی کەم دوای گرتنی کەرکووك لە لایەن بەریتانیاوە بە فڕۆکە چوو بۆ کەرکووك بۆ گفتوگۆ کردن لە بارەی ژمارەیەك کێشەی بە پەلەوە و بۆ ناونووس کردنی پشتیوانیی هۆزەکان و ڕەچاوکردنی هێڵەکانی پەیوەندیی بەریتانیا و زەمانەت کردنی دابینکردنی زەخیرەو پێداویستی، بە تایبەتیش گۆشت بۆ هێزەکان[21]. کاریگەریی قووڵی ئەم نوشوستییەی بەریتانیا لەسەر کوردەکان هەر زوو دەرکەوت، چونکە بەریتانیەکان هەموو هەوڵێکیان خستە کار بۆ پێکهێنانی هێزێکی لێڤیی کورد لەو هاوینەدا بەڵام نوشوستی هێنا و بە پێچەوانەی تورکەکان توانییان هێزێکی سوارەی گەورە پێکبێنن و دژ بە مێملەکانیان لە ئێراندا[22].

---

[20] هەمان سەرچاوە، ل٨٧.

[21] هەمان سەرچاوە، ل٨٦.

[22] ئەو هێزە کوردەی لێڤی کە بەریتانیەکان هەوڵیاندەدا ناونووسی بکەن بە نیازی گرتنی هەڵەبجە و پاشان بێزارکردنی تورکەکان لە سلێمانیدا، E.J.R .

## سیستەمی خێڵەکی لە باشووری کوردستاندا :

لە پایزی ١٩١٨ دا موتەسەڕیفی عوسمانی و حامیەی سەربازیی لە سلێمانی خۆیان دا بە دەست شێخ مەحموودەوە و بە شێوەیەکی ڕەسمی بوو بە هۆی کۆتایی هاتنی ئیدارەی عوسمانی لە دەڤەرەکەدا. کشانەوەی هێزەکانی تورك و کاربەدەستان بوو بەهۆی ئەوەی کەوا شێخ مەحموودی سەرداری کورد بە تەنها کۆنترۆڵی سلێمانی و ناوچە دێهاتییەکانی دەوروبەری بکات. لێرە بە دواوە شێخ مەحموود نامەی بۆ دەسەڵاتدارانی بەریتانیا لە بەغدا ڕەوانە کرد و داوای دەکرد کوردستان لە لیستی گەلانی ڕزگارکراو دەرنەکرێت[٢٣].ڕاستیکەی شێخ مەحموود لە ڕووی سیاسییەوە گەورەترین کەسایەتی بوو لە ناوچەکەدا و ئەمەش هاوتا بوو لەگەڵ خواستیدا بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەری بەریتانیادا و پاڵی بە دەسەڵاتەوە دەنا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. ئەڵتەرناتیڤی ئەمەش ئەو لەشکر و سوپایە بوو کە شێخ لە سەربازگەی سلێمانی و ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەریدا کۆیکردبۆوە و بەریتانیەکان بێجگە لە قوبووڵ کردنی پێشنیاری شێخ بۆ یارمەتیدان و هاوکاری کردنی هیچ چارەسەرێکی تریان شك نەدەبرد.

مێجەر ئی. دەبلیو. سی نۆئێل، کە ئەفسەرێك بوو ئەزموونێکی باشی پەیدا کردبوو لەگەڵ هۆزی بەختیاری و تیرە و هۆزەکانی تری ئێراندا، ئەرکی گەلاڵە کردن و دامەزراندنی ئیدارەی پێسپێردرا بوو لە کوردستانی باشووردا[٢٤]. ئەو ڕاسپاردانەیی درابوو بە نۆئێل لە پێش سەفەرکردنیدا بۆ سلێمانی هەندێك بەڵگە و دەلالەتی نیاز و مەبەستی بەریتانیای تێدایە :

"تۆ بە ئەفسەری سیاسی دامەزراوی لە کەرتی کەرکووکدا و لە یەکی نۆڤەمبەر دا دەست بەکار دەبیت. کەرتی کەرکووك لە زێی خواروو تا دیالەو باشووری ڕۆژهەلاتی سنووری تورکیا– ئێران دەگرێتەوە و بەشێکی ویلایەتی

---

[٢٣] بێل، پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی، ل٥٩.

[٢٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ویلسن: دلسۆزان، ل١٢٧– ١٢٨.

مووسڵ دەگرێتەوە، کە دوا کاروبار ڕێکخستنە لە ژێر چاودێریی حوکمەتی خاوەن شکۆدا. لە حاڵی حازردا دەبێ داگیرکردنی سەربازی و بەڕێوەبردنی هێزەکە ڕەچاو بکرێت و دەبێ تۆ لەسەر ئەم گریمانەیە کار بکەیت لە مامەڵە کردنتدا لەگەڵ سەرۆکەکان و ئەوەت لە زەیندا بێت کە ئەگەر ئەوە نییە دەسەڵاتدارانی سەربازی خۆیان تاوتوێی ناردنی هێزی جێگیر دەکەن بۆ سلێمانی یان شوێنەکانی تر لە ڕۆژهەڵاتی هێڵی ئێستامانەوە. هەروەها ئەرکی تۆ دەبێت کە هەماهەنگی لەگەڵ سەرۆکە لۆکەڵەکاندا بکەیت بۆ بەرقەرارکردنی ئارامی لە ناوچەکانی دەرەوەی سنووری داگیرکردنی سەربازیماندا، بۆ دەرپەڕاندن و گرتنی بەکرێگیراوانی دوژمن و دابینکردنی پێداویستیی هێزەکانمان. بە هەمان شێوە تۆ دەسەڵاتپێدراوی سەرفکردنی لەو بوارەدا و لە حاڵەتی بڕی زۆر و قەبەدا و بە پێی لێك حاڵیبووون دەبێ سەرۆکەکان لایان ڕوون بێت کەوا هەر ڕێکخستنێکی کارو بارکە تۆ ئەنجامی دەدەیت بە زەرووڕەت کاتی دەبێت و دەکرێ لە هەر کاتێکدا چاوی پێدا بخشێنرێتەوە. تۆ دەسەڵاتپێدراوی بە دامەزراندنی شێخ مەحمود وەك نوێنەری خۆمان لە سلێمانی و ئەگەر بە گونجاویشت زانی بە هەمان شێوە کەسانی هەڵبژاردەو جێمتمانەی خۆت لە چەمچەماڵ و هەڵەبجە و شوێنانی تر دابنێ. دەبێ ئەوەش ڕوونبکرێتەوە بۆ سەرۆك هۆزەکانی پەیوەندییان لەگەڵ گرێ دەدەن کەوا نیازی سەپاندنی هیچ جۆرە ئیدارەیەك لە ئارادا نیە نامۆ بێت لەگەڵ دابونەریت و ئارەزووی ئەواندا. لەم حاڵەتەدا سەرۆك هۆزەکان خولیای پێکهێنانی هاوپەیمانێتیان دەکەوێتە سەر بۆ ڕاییکردنی کاروباریان بە سەرپەرشتی ئەفسەرە سیاسییەکانی بەریتانیا و بە شێوەیەکی یاسایی باجیان لێوەر دەگیرێت بە پێی یاسای تورکی، بەڵام بە پێی پێویست دەسکاری و گۆڕانکاری تێدا دەکرێت، بۆ ئەنجامدانی ڕێکخستنی کاروبار بەڕێوەبردن و پەرەپێدانی وڵاتەکەیان"[٢٥].

لە ناوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەری ١٩١٨ مێجەر نوئێل گەیشتە سلێمانی و بە گەرمی پێشوازی لێکرا. ئەمیش دەستبەجێ دەستی کردە کار کردن بۆ

---

[٢٥] بێل، ویلسن.

دامەزراندنی سیستەمێکی نوێی بەڕێوەبەرایەتی، کە ئوێدی لێدەکرا لای خەڵك پەسەند بێت. شێخ مەحمود بە حوکمداری ناوچەکە و سەرۆکی باشووری کوردیی سەربەخۆ دانرا. کاربەدەستانی دیکەی کوردلە ژێر سەربەرشتی ئەفسەرە سیاسییەکانی بەریتانیادا کاریان دەکرد و کاروباری جۆراو جۆری ئیدارەکەیان پێ سپێردرا. سەرۆك هۆزەکانیش لەلایەن حکومەتەوە کاروباری هۆزەکانیان خرابووە ئەستۆ و لە ڕێگای شێخ مەحموودەوە بەرپرسیار بوون بەرانبەر بە دەسەڵاتداری بەریتانیا. ئەوان وەك کاربەدەستی ڕەسمی حکومەت دەناسران و مووچەیان دەدرایە[٢٦].

گومانێکی ئەوتۆی تێدا نییە کەوا سیستەمی تازە دامەزراوی حکومەت لە باشووری کوردستاندا بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی کۆلۆنیالیی بەریتانیا لە هیندستان و شوێنانی تردا. سروشتی ئەو ئەرك و کارانەی نێوان حکومەتی بەریتانیاو کۆنفیدراڵیەتی باشووری کوردیدا لەو پەیوەندی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی باڵایە دەچوو کە لە نێوان تاجی بەریتانیا و ویلایەتەکانی هندستاندا هەبوو[٢٧]. سیستەمی نوێی بەڕێوەبردن لە باشووری کوردستاندا بە ئاشکرا پشتی بە بنەمای حوکمی ناڕاستەوخۆ[٢٨] دەبەست و لە فرە ڕووەوە ئاسەواری سیستەمی ساندیمانی تێدا بوو، بە تایبەتی سیستەمی بروسی و مەلیکی، کە لە مەوە دا کەوتبوون.

---

[٢٦] E.J.R، ل٩–١٠؛ بێل، ل٦٠؛ ویلسن، ل١٢٨.

[٢٧] کورتەیەك لە سکێچی جێمتمانە لە بارەی پێگەی ویلایەتە هندییەکان لەناو ئیمپراتۆرێتی هندی بەریتانیدا و پەیوەندییان بە حکومەتی بەریتانیەوە،بڕوانە ك.م.پانیکار: ویلایەتە هندییەکان، نامەکانی ئۆکسفۆرد لەسەر کاروباری هندستان، ژمارە ٤ "شاری میسور- هندستان، چاپخانەی زانستگەی ئۆکسفۆرد، ١٩٤٢".

[٢٨] بەریتانیەکان سیستەمی حوکمی ناڕاستەوخۆیان لە ماوەی چەندین ساڵدا پەرەپێدا. بە هەر حاڵ لەو دەمەوە کە سێر لوگارد "دواتر بوو بە لۆرد دوگارد" لە نایجیریا سیستەمی حکومی ناڕاستەوخۆی چەسپاند ئیتر بە ناوی ئەمەوە وابەستە بوو. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم سیستەمە بڕوانە فریدریك لوگارد: ماندێتی دوانە لە ئەفریقای ئیستیوائیدا- ١٩٢٣.

## سیستەمی ساندیمان:

ئەم سیستەمە بە ناوی سێر ڕۆبەرتساندیمانەوە[٢٩] ناونراوە و شێوازێکی بەڕێوەبردن بوو لە بلوجستاندا بە مەبەستی پێکهێنانی ئەم دەڤەرە کێوی و شاخاوییە لەگەڵ سیستەمی ئیمپراتۆریێتی هندی بەریتانیدا. ئەم سیستەمە بریتیە لە ڕژێمێکی خێڵەکیی لاوەکی و لە لایەن فەرمانڕەوایەکی بالا دەستی خۆماڵییەوە سەرۆکایەتی دەکرا، کە خانی کەلات بوو، کە وەك بڵێی سیاسەتێکی پێشکەوتووی سەرکەوتووانە بوو[٣٠]. مەبەستی ئەم سیاسەتە پاراستنی دانیشتوانی سنوری سند لە تالان و بڕۆی یاخیبووانی ئەو هەردە و چیایانە، کە وڵاتی سەخت و شاخاوییان بووبوو بە داڵدە و حەشارگەیان و لە سەرێکی تریشەوە مەبەست بەهێز کردنی بەرگریی هندستان بوو لە دژی داگیرکردنی بێگانە.

سیستەمی ساندیمان کەوتبووە بەر ڕەخنە لەبەرئەوەی زۆر پشتی دەبەست بە کاریگەریی شەخسی یەك کەس و هەروەها لەسەر بنەمای ئەو یارمەتییە مادییانەی کە دەدرا شێوازێکی پارە کێشانەوە و گەندەڵیشی دروست کردبوو. بە هەر حاڵ مێژوونووسی بەریتانی سی. کۆڵن دەیڤیس C.Collin Davies سەرەنجی ئەوە دەدا کە ئەم یارمەتییە داراییە بە ئابڕوو چوون و گەندەڵی وەسف ناکرێت، چونکە ئەوان لە بەرانبەر خزمەتی زۆر و تاقەت

---

[٢٩] بۆ باس وخواستی زیاتر لەسەر ژیانی ساندیمان و سیاسەتی خێڵەکی، بڕوانە تۆماس هێنری سۆرنتۆن: کۆلۆنێل سێر ڕۆبەرت ساندیمان، ژیان و کاری لە سنووری هندستانی ئێمەدا "لەندەن ١٩٨٥"، ڕیچارد ئسحاق بروس: سیاسەتی پێشکەوتوو ئەنجامەکانی یان سی‌وپێنج ساڵ کارکردن لە نێو خێڵەکانی باکوری ڕۆژئاوای هندستاندا "لەندەن ١٩٠٠"، هیتو ڕام: ساندیمان لە بەلوچستاندا "کەلکوتا١٩١٦"، کۆڵن داڤیز: کێشەکانی سنووری باکوری ڕۆژئاوا ١٨٩٠-١٩٠٨، لەگەڵ ڕووپێویی سیاسەتدا لە ساڵی ١٨٤٩ وە "کامبریدج ١٩٣٢".

[٣٠] "سیاسەتی پێشکەوتوو" لە بەرانبەر "سیاسەتی سنوور داخراودا" زۆرترینی ئەو مەسەلانە بوون کە مشتومڕیان لەسەربوو لەناو ئیدارییە بەریتانیەکاندا لە هنددا بە درێژایی سەدەی نۆزدە. بڕوانە دەیڤیس: کێشەی سنووری باکوری ڕۆژئاوا، ل٧١-٩٨.

پرووکێندا ئەم پارمەتیانەیان وەردەگرت، وەك پاسکردنی ڕێگەوبانی بازرگانی و دەربەندی نێوچیاکان و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی جیرگە "ئەنجومەنی هۆزەکان"[31].

## سیستەمی بروس یان مەلیکی:

ئەمە ئەو ناوەیە کە دراوەتە سیستەمەکەی ساندیمان و لەناو مەحسوودەکانی سنووری باکووری ڕۆژئاوای هندستاندا پەیڕەوی دەکرا لەلایەن دەرەجات بروس Derajat, R. I. Bruce ی کۆمیسیۆنەوە[32]. ئەم سیستەمە دواتر و لەبەر چەندین هۆکار نوشوستیی هێنا. یەکەم لەبەرئەوەی لەنێو مەحسوودە دیموکراتەکاندا کاری پێکرا چونکە مەلیکەکانیان "سەرۆکەکانیان" ئەو دەسەڵاتەیان نەبوو کە سەرۆکەکانی بروهوی Bruhui و بلوچ لە بلوچستاندا هەیانبوو. بەم پێیە مەبەستی بروس لەوەی کەوا سەرۆکەکانی مەحسوود سەرکەوتوو دەبن لە کۆنترۆڵ کردنی خێڵەکانیاندا، لە بەرانبەر پارەو پارمەتیدا، نوشوستیی هێنا. دووەم ئەو سیستەمەکەی بێدەسەڵات بەسەردا شکانی سەربازی وڵاتی مەحسوود دەستپێکرد بە پێچەوانەی ئەوەی کە ساندیمان لە بلووچستاندا کردی. بێجگە لەوەش، مەحسوودەکان بە پێچەوانەی بلووچەکانەوە هەمیشە دەسەڵاتی سەرکردە ئاینییەکان بەسەریاندا زاڵبووە و لەژێر کاریگەری ئەمانەدا چەکیان لە دژی بەریتانیا هەڵگرتووە بە هاوسۆزی یا بەدەمەوەچوونی بانگەوازی خزمە موسڵمانەکانیان لە ئەفغانستان[33].

---

[31] دەیڤیس کێشەی سنووری باکووری ڕۆژئاوا ل٣٢، کۆڵن دەیڤیس "سنووری باکوری ڕۆژئاوا ١٨٤٣-١٩١٨، لە مێژووی کەمبریدج سەبارەت بە ئیمپراتۆریتی بەریتانی، ژمارە (٥): ئیمپراتۆریتی هندستان، ١٨٥٨-١٩١٨. (نیۆرك-ماکمیلان ١٩٢٩) ل٤٤٨.

[32] بۆ چەندین ساڵ بروس کەسێکی زۆر نزیك و بڕواپێکراوی ساندیمان بوو لە بەلوچستان.

[33] بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی شکستهێنانی سیستەمی مەلیکیMaliki یان بروسی لە نێو مەحسوودەکاندا، بڕوانە لە دەیڤیس: کێشەی سنوری باکوری ڕۆژئاوا ١٢٤-١٢٦، سنووری باکوری ڕۆژئاوا ولیەم بارتۆن: سنووری باکوری ڕۆژئاوای هندستان، ل ٤٥٥-٤٥٦.

بەو پێیە سیستەمی نوێی بەڕێوەبردنی بەریتانییەکان لە باشووری کوردستاندا لە گەڵ ڕووەوە لە سیستەمی بروس یان مەلیکی دەچوو لەنێو مەحسوودەکاندا. تێکچوونی خێرا و دواتر شکستهێنانی تەواوی ئەم سیستەمە لە باشووری کوردستاندا گومانی نەهێشتەوە کە بێسوودبوو بۆ ئەو هەرێمە وەك چۆن کەڵکی نەبوو بۆ مەحسوودەکانی سنووری ڕۆژئاوای هندستان. ڕەنگە ئەم بەراوردە لەوەدا بایەخی خۆی هەبێت کەوا کورد و مەحسوود چونیەکن لە ژمارەیەك ڕووەوە . چونکە کوردەکانیش وەك مەحسوودەکان هەمیشە پەرۆشی ڕزگاربوون و بەردەوام بەگژ ئەوانەدا دەچوونەوە کە لە هەوڵی کۆنترۆڵ کردنیاندا بوون. بە هەمان شێوەی مەحسوود کوردیش لە ڕۆژگاری شێخ عوبێدوڵڵاوە لەلایەن سەرۆکە ئاینیەکانیانەوە کۆنترۆڵ کراون ، کە شێخەکان بوون بێجگە لە ئاغا کە سەرۆکی دنیایی بوون. لە کوردستانی ژێر دەستی بەریتانیادا پڕوپاگەندەی تورکیپان- ئیسلامی زیرەکانە سەرکەوتوو بوو لە هەڵگێڕانەوەی زۆرێك لە کوردەکان لە دژی بەریتانیا. بەم ڕەنگە، کورد وەکو مەحسوود، لە لایەن وڵاتێکی ئیسلامییەوە هاندران لە دژی بەریتانیا ڕاپەڕن و وەك ئەوانیشیان کرد لە ژێر سەرکردایەتی خاوەن پلە و پایە ئاینییەکاندا. شتێکی سەیرە سەرنجی ئەوە بدەیت کەوا بروس، لە نووسینەکانیدا نزیکەی بیست ساڵ پێش ئەوەی بەریتانیا پەیوەندی ڕاستەوخۆ بە کوردەوە پەیدا بکات، بێت و بە مەحسوودیان بەراورد بکات. لە داکۆکی کردنیدا لە مەحسوود بڕگەیەکی دوور و درێژی لە کتێبەکەی لۆردکێرزۆن Cur Zon Lord "ئێران و مەسەلەی ئێران" گواستووەتەوە کەوا کێرزۆن داکۆکی لە کورد دەکات دژ بە ستەم و یاخیگەری و متمانە پێنەکردن. پاشان بروس دەگاتە ئەم ئەنجامە "ئەگەر ئێمە ناوی کوردەکان بگۆڕینە مەحسوودە وەزیرییەکان ئەوە ئەم باسە پڕ بە پێستی بارودۆخی ئەوانیشە"[٣٤].

---

[٣٤] بروس، ل١٧٠-١٧١.

بەڵام ڕەنگە مەسەلەکە مشتومڕی ئەوە هەڵبگرێت کەوا سیستەمی ئیدارەی تازە لە کوردستاندا ڕەنگە کاری خۆی کردبێت چونکە بەریتانیا هێزی تەواوی هێنابوو بۆ سەپاندنی، یان شێخ مەحموودی بەدەستەوە بووە بۆ ئەو کارە، کە هۆکارێکی هەڵبژاردە بوو بۆ جێبەجێ کردنی سیستەمەکە و بەردەوام بوو لە هاوکاری و هەماهەنگی کردنیان. بە تەواوی ڕوون و بەڵگەنەویستە کەوا هەردوك ئەم گریمانەیە سروشتی بنەڕەتیی حاڵەتەکەی فەرامۆش کردووە. تا ئەم ئاستەی گرنگیپێدانی بەریتانیەکان، دابینکردنی هێزی تەواو بۆ سەپاندنی سیستەمی ئیداریی نوێ دەبوو لە خۆیدا شکستخواردوو بێت، چونکە ئەوان بۆ ئەوەی پەنایان بردە ئەو سیستەمە ڕێك بۆ خۆلادان لە بەکارهێنانی هێزی قەبە لە ناوچەکەدا. بەریتانیەکان بەتەمابوون، لەڕێگەی دامەزراندنی سیستەمێکی حکومیی پەسەند لە لایەن خەڵکەوە، ئەرکێکی گرانیان نەکەوێتە سەر کە زۆری تێبچێت. دەبێ ئەوەمان لە یاد بێت کەوا بەریتانیای مەزن لەو دەمەدا سەرگەرمی ئەوەبوو کەوا هێزەکانی لە میزۆپۆتامیادا زۆر ئەمسەر و ئەوسەر پێنەکات و بەو پێیەش نە هێزی بەشەری و نە مادی لەو کاتەدا لەبەردەستدا نەبوو. مشتومڕ لەسەر ئەوەی سیستەمەکە دەبوو کاری خۆی بکات چونکە شێخ مەحموود هاوکار بوو بەڵام کارەکە لەوەدا بوو کە سەرکەوتن یان شکستهێنانی سیستەمێکی حکومەت کە پشت بە هەڵوێستی تاقە کەسێك ببەستێ ئەوە مانای وایە ئەو سیستەمە ڕاست نیە.

## دامەزراندنی شێخ مەحموود وەك حوکمدار:

بۆ ئەوەی زانیاری ئەو بارو دۆخەی لە کوردستانی باشووردا بە دەست بێنین و بەرچاو ڕوونییەکمان لە بارەی دۆخی بەریتانییەکان دەست بکەوێ لەو ناوچەیەدا، سێر ئەرنۆڵد ویڵسنی جێگری کۆمیسیۆنیمەدەنی بە فڕۆکە چوو بۆ سلێمانی لە ١ی دیسەمبەری ١٩١٨ دا. لەم ماوەیەدا کۆبوونەوەیەك ساز کرا لەگەڵ نزیکەی شەست سەرۆك هۆزدا. سەرۆکەکان بە زۆری لە

کوردستانی باشوورەوە هاتبوون بەڵام ژمارەیەکیان لە ناوچەکانی سنە، سەقز و هەورامانی ئێرانەوە هاتبوون. گفتوگۆیەکی دوورودرێژ بە دوای کۆبوونەوەکەدا هات لە نێوان شێخ مەحموود و پیاوانی تردا و گەلێ تەوەرەی باری سیاسیی قسەی لەسەر کرا. ویلسن ڕاپۆرتێکی لەسەر ناوەرۆکی ئەم گفتوگۆیانە نووسیوە. بە گوێرەی قسەکانی ئەو کوردەکان بە بڕیاری بەرهەڵستیی گەڕانەوەی تورکەکانیان داوە کەوا دەستبدەنە چەك لە دژیان هەرچەندە سەرۆکە کوردەکان دانیان بەوەدا ناوە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان پارێزکاریی بەریتانیان پێویستە بەڵام وا پێدەچوو بە کۆی دەنگ نەگەنە ڕێکەوتن کە چۆن ئەو کارە بکرێت. هەندێك سەرۆك هۆز خۆیان وا دەردەخست کە ئیدارەی بەریتانیان پێ پەسەندە لە کوردستاندا، بەڵام بەشێکیان دژ بەم پرۆژەیە بوون هەندێك پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەوا دەبێ کوردستان لە لەندەنەوە بەڕێوەببرێت نەك لە بەغداوە و لە دیدی ئەوانەوە لەندەن شوێنی ئەستەموولی گرتووەتەوە . بە پێی قسەی ویلسن بێت چەند کەسێکی کەم لەو سەرۆکە کوردانەی لەوێ کۆبوونەوە بە نهێنی بەمیان وتووە کەوا هەرگیز سەرۆکایەتی شێخ مەحموود قبوڵ ناکەن بەڵام بە گرنگییەوە ئەوەش دەڵێت کە ئەمانە نەیانتوانیوە پێشنیاری کەسێکی ئەڵتەرناتیڤ بکەن[٣٥].

لە پاش گفتوگۆیەکی زۆرْ شێخ مەحموود بەڵگەنامەیەکی داوەتە دەست ویلسن کە لە لایەن نزیکەی چل سەرۆکەوە مۆرکراوە و ناوەرۆکی بەڵگەنامەکە بەم شێوەی خوارەوەیە:

"حکومەتی خاوەن شکۆ جاڕی نیازی خۆی داوە بۆ ڕزگار کردنی میللەتانی ڕۆژهەلات لە دەست زوڵم و زۆری تورك و هاوکارییان بکات لە دامەزراندنی سەربەخۆیی خۆیاندا. بۆیە سەرۆکەکان وەك نوێنەری گەلی کوردستان تکا لە حکومەت دەکەن بیانخاتە ژێر پارێزگاری بەریتانیاو بیانبەستێ بە عێراقەوە و

[٣٥] ویلسن، ل١٢٩؛ بیل، ل٦٠-٦١؛ E.J.R، ل١٠. باسەکە تا ڕادەیەك لە هەرسێ سەرچاوەکەدا وەك یەکە. هەروەها زانیارییەکانی تێکستەکە بە پلەی یەکەم پشت بە گێڕانەوەکەی ویلسن دەبەستێ و من هەندێ وردەکاریم لە دوو سەرچاوەکەی ترەوە وەرگرتووە کە لەوەی ویلسندا نەهاتووە.

بێبەشیان نەکات لە سوود و خێراتی ئەو پێکهاتەیە. ئەوان داوایان لە کۆمیسیۆنی مەدەنیی میزۆپۆتامیا کرد نوێنەرێك بنێرێتە لایان لەگەڵ هاوکاری و یارمەتیی پێویستدا تاوەکو گەلی کورد لە ژێر چاودێری بەریتانیادا بتوانێ بە ئاشتی گەشە بکات و پێشبکەوێت و ژیانی مەدەنیی خۆی بەرقەرار بکات. ئەگەر حکومەت هاوکاری و پارێزگاریی خۆی بۆ ئەوان درێژە پێداوە و بەڵێن دەدەن لە فەرمان و ئامۆژگارییەکانی دەرنەچن"[٣٦].

لە وەڵامدانەوەی ئەم داواکارییەدا، ویڵسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنی نامەیەکی دایە دەست شێخ مەحموود کە جەخت و پشتیوانی دەکات لەسەر ئەو خاڵانەی لە دوکیومێنتەکەی ئەواندا هاتووە. لە هەمان کاتیشدا نامەکە دوا مۆری ڕەسمیی مێجەر نۆئێلی چەسپاند لەمەڕ پێشتر دامەزراندنی شێخ مەحموود بە حکومداری باشووری کوردستان. من نەمتوانی تێکستی تەواوی ئەم دۆکیومێنتە بە دەستبهێنم کە بە ئاشکرا بنەمای یاسایی دامەزراندنی دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە باشووری کوردستاندا ڕادەگەیەنێت. بە هەر حاڵ دەکرێ ناوەرۆکی ئەم نامەیە لە ژمارەیەك خاڵدا کورت بکەینەوە:

"لە بەرانبەر دا شێخ مەحموود نامەیەکی دراوەتێ و ئەوەی تێدا هاتووە کەوا هەموو هۆزە کوردەکان لە زێی گەورەوە تا دیالە"سیروان" "ئەوانەیی لێبەدەر کە لە خاکی ئێراندان"، بە تەواوی ئازادی و خواستی خۆیان سەرۆکایەتیی شێخ مەحموودیان قبوڵەو ئەم نامەیەش پشتگیریی ئەخلاقیی ئێمە دەگەیەنێت بە کۆنترۆڵ کردنی ئەو ناوچانەی سەرەوە، لە بری حکومەتی بەریتانیا، کە دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت"[٣٧].

هەردوو بەڵگەنامەکە- ئەو بەیانەی کە لە لایەن سەرۆکەکانەوە مۆر کرابوو و ئەو نامەیەی ویڵسنیش- هەریەك بە جیا یان پێکەوە وەریانبگرین بە ڕێکەوتننامەیەکی ڕەسمی ناژمێردرێن لە نێوان دوو لایەنی وەك یەك و

---

[٣٦] ویلسن ل١٢٩؛ بێل ل٦١، ل١٠ E.J.R .

[٣٧] هەمان سەرچاوە.

سەربەخۆدا. شێخ مەحموود یان سەرۆکە کوردەکانی تر هەرچۆنێك بیریان کردبێتەوە لەم ڕێکەوتننامە تازەیە، هیچ گومانی تێدا نیە کە بەریتانیەکان تەنها بە ڕێکەوتنێکی شلوشۆلیان لە قەلەم داوە بۆ باروزروفێکی کاتی، لەگەل جەمسەرێکە دەسەلات بە دەستی لۆکالدا کەوا چەند ئامانجێکی کورتخایەن بێنێتەدی. لە هیچ شوێنێکی هەردوو بەلگەنامەکەدا هیچ باسێکی ڕوون و ئاشکرای سروشتی دەسەلاتەکانی شێخ مەحموود نەکراوە.

لە یەکەم بەلگەنامەدا لە لایەن نزیکەی چل سەرۆك هۆزەوە مۆر کراوە و بە "نوێنەرانی گەلی کوردستان" خۆیان ناو دەبەن. کێشەکە لەوەدایە کەوا شێخ مەحموود و سەرۆکەکانی تری کۆبوونەوەکە بە ناوی گەلی کوردستانەوە قسەیان دەکرد. ڕاستێکەی خودی شێخ خۆی هەمیشە ئەوەی دەردەبڕی کە هێز و دەسەلاتی ئەو لە لایەن خەلکی کوردەوەیە و لە لایەن هەموو کوردی ویلایەتی مووسلەوە تەخویل کراوە.

بەلام وا دەردەکەوێت بەریتانیەکان ئەم سووربوونەیان بە ئیدیعایەکی بێ بنەما لە قەلەم دابێت و ڕووی خۆیان لەم مەسەلەیە وەردەگێڕا. جێگری کۆمسیۆنی مەدەنیی نەك ئەمەی تەنها پشتگوێ دەخست بەلکو ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە دەسەلاتی شێخ لە حکومەتی بەریتانیاوە. ڕاستێکەی نامەکەی ویلسن بە ئاشکراییەکی ئازار بەخش ئەوە دەردەبڕێ کەوا تا ئەو ئاستە دەتوانێ پشتگیری بەریتانیا مسۆگەر بکات کە ملکەچی ئەوان بێت و خواستیان جێبەجێ بکات وەك ئەلقە لە گوێیەکی خۆیان.

لە سەردانەکەی ویلسندا بۆ سلێمانی گفتوگۆ لەسەر چەند مەسەلەیەکی تر کرا. وا باس دەکرێ کە شێخ مەحموود داوای کردبێت ئەفسەرە بەریتانییەکان بکرێنە بەرپرسی هەموو دام و دەزگاکانی حکومەت و ئەو هێزەی لێڤی کەوا نیازبوو دروستی بکەن، بەلام ئەو مەرجەی داناوە کە بە پێی توانا کاربەدەستی لەوان خوارتر کورد بن نەك عەرەب[٣٨]. خەلکی شارەکان

---

[٣٨] هەمان سەرچاوە.

و عەشایەری کەرکووك و کفری ڕازی نەبوون بدەنە پاڵ حکومەتێکی پێشنیارکراوی وا بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود و لەبری ئەوە داوای ئیدارە دانی ڕاستەوخۆی بەریتانیایان کرد و شێخ مەحموودیش پێی لەسەر هاتنە پاڵی ئەوان دانەگرت[39].

نوێنەرانی تیرە و هۆزە کوردەکانی ئێران کە داوایان کردبوو بخرێنە سەر حکومەتە سەربەخۆکەی شێخ مەحموود ئاگادار کرانەوە کە ئەوە کارێکی مەحاڵە و تێیانگەیاندن کەوا ئیلتیزاماتی نێودەوڵەتی بەریتانیا ڕێگە بە حکومەتی ئەو وڵاتە نادات پشتگیریی پرۆژەیەکی لەو چەشنە بکات، بەڵکو داوایان لێکرا لەسەر ئێران بمێننەوە و پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ باشووری کوردستانی سەربەخۆدا بهێڵنەوە. ئەوانیش قەناعەتیان بەو ڕوونکردنەوەیە کردو وایان دەربڕی کە ئەو بارودۆخەیان قبووڵە[40].

مێجەر نوئێڵ، کە بۆ هەولێر و ڕەواندز نێردرا بوو بە مەبەستی هاندانی تیرەو هۆزەکانی ئەو ناوە بۆ ئەوەی بچنە پاڵ حکومەتی کوردستانی باشوور بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود، لەم ئەرکەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کوردەکانی ئەو ناوچانە وەك باسی دەکرا بە پەرۆش بوون هاوبەشی ئاشتی و ئیمتیازاتی حکومەتەکەی شێخ مەحموود بکەن، کەوا بە خەیاڵدا دەهات ڕووی پارێزگاری و مادییەوە بەریتانیای لە پشت بێت[41]. پاشان زۆری نەبرد ئەفسەرانی سیاسی بۆ کۆیەو ڕانیە دانران و سیستەمی بەڕێوەبردنی سلێمانی پەلی کوتا بۆ ئەوێ و ناوچەی ڕەواندزیش. کاری سەرەکی لە ڕەواندزدا بەرەنگاری بوونەوەی وێرانەی جەنگ بوو. ڕەواندز و ناوچە دێهاتییەکانی دەورو پشتی لە بارێکی زۆر خراپدا دەژیان لە ئەنجامی شەڕی یەك لەدوایەکی تورك و ڕووس و بەدوایدا گرانی و برسێتی و تاعوونماڵکاولییەکی بێئامانی بەرپا کرد. هەنگاوی بە پەلە گیرایە بەر بۆ مامەڵەکردن

---

[39] هەمان سەرچاوە.

[40] هەمان سەرچاوە.

[41] بێل: پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی، ل٦٠-٦١.

لەگەڵ بارودۆخەکەدا و لە هەولێرەوە بارە دانەوێڵەیان بۆ ڕەوانە کراو دەستکرا بە فریاکەوتنی برسێتی و هانی کشتوکاڵ کردن دراو کەمێك لە یاساو نیزام هاتە ئاراوە. ئەرکەکە زۆر گران کەوتەوە لە ناوچە شاخاوی و دوورە دەستەکانی باکووری ڕەواندزدا"[٤٢].

## شێخ دەسەڵاتی خۆی بەهێز دەکات:

شێخ مەحموود هەر لە سەرەتاوە بڕیاری دابوو هەموو ئەو ناوچانە بەهێز بکات کە کەوتبوونە ژێر دەستی ئەم وەك حکومدار. بەم دید و بۆچوونەوە هەردەم لە پەلەقاژەی ئەوەدا بوو تەواوی دەسەڵات لە دەستی خۆیدا کۆ بکاتەوە. ئەو دەیویست دڵسۆزیی زۆرێك لە سەرۆك هۆزەکان مسۆگەر بکات لە ڕێگەی دابەشکردنی پارە و ئیمتیازاتەوە، هەریەکە بە پێی خۆی. بەکارهێنانی یارمەتی دارایی زۆر و زەبەند کە لە لایەن حکومەتی بەریتانیاوە بۆی ڕەخسێنرابوو و ئەو شێوازی دەسەڵات قۆرخکردنەی وەك حوکمدار بۆ چەسپاندن و بەهێز کردنی پێگەی خۆی لەنێو تیرەو هۆزەکاندا بە چاکی درکی پێدەکرێ لە لایەن بەریتانییەکانەوە. ڕاپۆرتێك کە لە ساڵی ١٩١٩ دا نووسراوە سەرنجی ئەوە دەدا کەوا:

"هەروەها دڵسۆزی بۆ شێخ مەحموود وەك حکومداری وڵاتەکە هەلومەرجێکی ڕەخساندووە کە بەهۆی پارەو ماڵی حکومەتی خاوەن شکۆوە لە یەك کاتدا ببێ بە کەسایەتییەکی بەناوبانگ و خاوەن ماڵ و دەسەڵاتێکی شاهانە. لەپاش ملکەچی و دڵسۆزی خەڵات و بەرات بە کاشی ئامادەیە، کە لەو ڕۆژگارەدا دەگمەن بوو، بەپێی ئەو سیستەمە سەرۆك هۆز پارەی باشی دەست دەکەوێت و هی هۆزەکەشی بۆ خۆی قۆرخ دەکات بێ ئەوەی چاوی کار بەدەستێکی حکومەتی بەسەرەوە بێت"[٤٣].

---

[٤٢] هەمان سەرچاوە ل٦١.

[٤٣] عێراق، "ئیدارەی بەریتانی"، ئۆفیسی کۆمیسیۆنی مەدەنی، ڕاپۆرتی بەڕێوەبردنی کەرتی سلێمانی بۆ ساڵی ١٩١٩.

شێخ، له گەڕانیدا بۆ بەستنەوەی هۆزەکان بەخۆیەوە له پاکژکردن و کۆنترۆڵ کردنی بەڕێوەبەرێتییە تازەکەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو پۆستی جۆراو جۆری بە خزم و ناسیاوەکانی پڕکردەوەو بە زیرەکی هەموو ئەوانەی دوورخستەوە کە بە دڵسۆز و پشتیوانی لە قەڵەم نەدەدان[44]. ئەوانەی ملکەچ و سەر بەخۆی بوون هەموو پۆستە گرنگەکانیان له حکومەتە نوێکەدا قۆرخ کردبوو. بەم ڕەنگە سەرۆکی پۆلیسی سلێمانی و قازیی دادگای سلێمانی و ئەوانیتریش لەسەر دەستی شێخ خۆیدا دانرابوون[45]. تەنانەت لێڤیی کورد کە هێزێکی کاریگەر بوو لە سەروبەندی پێکهێنانی حکومەتی کوردستانی باشووردا دامەزرابوو دەبوو سوێندی دڵسۆزییان بۆ خودی شێخ مەحموود بخواردایە[46]. شێخ سوودی لە کەش و هەوای دەرکەوتنی تاك دەبینی. بەریتانیەکان پێویستیان بە پشتگیریی ئەم بوو وەك چۆن ئەمیش پێویستی بەوان بوو. بێڵ دەگێڕێتەوە کە:

"بە بێ ئەو هاوکاریو یارمەتییەی ئەو دەبوو پێگەیەکی سەربازیی بەهێز دامەزرێنین، کە لەو دەمەدا لە تواناداا نەبوو ئەو کارە بکەین. لە دید و بۆچوونی سیاسییەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو ئێمە بتوانین یاسا و نیزام لەو ناوچەیەدا بپارێزین و لە هەمان کاتیشدا خۆ لادەین لە بەکارهێنانی هێز بۆ ئەو مەبەستە"[47].

ئەڵبەتە شێخ مەحموود بە ئاگا بوو لە ڕۆڵ و بایەخی خۆی بۆ بەریتانیەکان. ئێمە نازانین تا چەند بڕوای هەبوو بەوەی کە پشتی دەگرن، بەڵام ئەو هیچ کاتێ بێ دوو دڵی گوزارشی لەوە دەکرد کە "ئەوان ئامادەبوون بۆ دامەزراندنی حوکمدارێتییەکەی و ئەگەر پێویستی بکردایە هێزیان بەکار دەهێنا"[48].

---

[44] هەمان سەرچاوە، لە بێڵ وەرگیراوە "پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی"، ل٦٤.
[45] هەمان سەرچاوە، ل ٩-١٠.
[46] نەك تەنها لێڤییەکان بەڵکو کاربەدەستە ڕەسمییەکانی بەڕێوەبەرێتی نوێ دەڵێن گوایە سوێندی پشتگیرییان بۆ شێخ مەحموود خواردووە. ل "دوو ساڵ لە کوردستاندا" ل٢٥٤. بە گوێرەی قسەی بێڵ "لێڤییە کوردەکان لە لایەن ئەفسەری کوردەوە سەرکردایەتیی دەکران و ئامادەی پشتگیریی شێخ مەحموود بوون و خۆیان بە قەرزاری ئەو دەزانی لە دامەزراندنیاندا". بێڵ: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤ لە:ویلسن: دڵسۆزان Loyalties ، ل١٣٥، وەرگیراوە.
[47] بێڵ: پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی ل٦٣، ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٥.
[48] هەمان سەرچاوە، ل١٣٥.

بەپێی زەروورەتی ئەو کات وساتە کەسانی کاریگەری تایبەت لەو بەڕێوەبەرێتییە تازەیەدا دەیانتوانی هەر بەرەنگارییەك ڕابماڵن ئەگەر ڕێی لە فراوانخوازیی دەسەلاتی شێخ مەحموود بگرتایە. کورد کە زۆری بە دەست شەڕو شۆڕەوە چەشتبوو تامەزرۆی حەوانەوە و پشوودان بوو، هەروەها بەریتانیەکانیش کە هێز و دەسەلاتێکی نوێ بوون لەو خاکەدا، واپێدەچوو بڕیاریان دابێت سوود و قازانجی بەڕێوەبەرێتییەکەیان پەرەپێبدەن لە ژێر سایەی سەرکردایەتی شێخدا. بەم ڕەنگە بەرەنگاریی خەفەکرابوو و ڕژێمی تازە لە سەرتاپای هەرێمەکەدا قبووڵ کرابوو تا ڕادەیەك بۆ بەرهەڵستی مێجەر سۆن باسی کاردانەوەی کوردەکان دەکات لە ئاست دامەزراندنی حکومەتی نوێی شێخ مەحموودا:

"هیچ کاتێ کوردەکان هێند پەرۆش نەبوون بۆ ئاشتی، چون ئەوەندەیان نەبوونی و نەداریی چەشتبوو کەوا ئامادە بوون بۆ مۆر کردنی هەر دوکیومێنتێك یان جاڕەوانی هەر ڕاگەیاندنێك بۆ ڕەخساندنی ئارامی و خۆراك. بەم جۆرە هۆز لە دوای هۆز کە تا ئەمرۆ شێخ مەحموودیان نەناسیبوو یان لە باشترین حاڵەتدا وەك نەوەی پیاوچاکان ناسیبوویان، کەچی دوعایان دەکرد بخرێنە ژێر دەسەلاتی حکومەتە تازەکە "بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود"،ئەو بڕگەیەی واتێدەگەیشتن کەوا حکومەتی بەریتانی بۆ مەبەستی خۆی دایتاشیوە"[49].

## ڕەخنە لە سیستەمی خێڵەکیی
## کە لە کوردستانی باشووردا پەیڕەو کرا

مێجەر سۆن، لە ڕاپۆرتێکی ڕەسمیدا بە توندی ڕەخنە لەو سیستەمە نوێیەی ئیدارە دەگرێت. لە بڕگەیەکدا لەژێر سەردێڕی "سەرنج لەسەر سیستەمی خێڵەکیی بەڕێوەبردن" دەستنیشانی لایەنە خراپ و زیانبەخشەکانی سیستەمە تازەکە دەکات و خاڵ بە خاڵ خراپییەکانی باس دەکات. لە بڕگەی یەکەمدا باسی مەبەست و چاوەڕوانیی سەرکردە دەکات و

---

[49] عێراق، "ئیدارەی بەریتانی" ئۆفیسی کۆمیسیۆنی مەدەنی، ڕاپۆرتی ئیداری کەرتی سلێمانی سالی ۱۹۱۹.

هیچ بوارێکی گومانی نەهێشتەوە کەوا بەریتانیا پێشنیاری سیستەمەکەی کردووە و پشتی گرتووە و شێخ مەحموود وەك ئامێرێك دانراوە بۆ جێبەجێ کردنی و هەردوك بە پێچەوانەی یەکتر دەجولێنەوە.

"سیستەمێکی بەڕێوەبردن کە دەکرێ ناوی لێبنێی سیستەمێکی خێڵەکی پەیڕەوی کراوە. ئەمە لە لایەن ئەفسەری سیاسیی بەرپرسەوە وا دانراوە ئاسوودەییەکی نەتەوەیی بێت و کەسایەتی وخاسیەتی کوردستان بپارێزێت ئەمە ئارەزووی شێخ مەحموود بوو بۆ دامەزراندنی سیستەمی خێڵەکی، واتە لەم ڕێگەیەوە بە ئاسانی دەیتوانی بەرتیل بداتە سەرۆك هۆزەکان یان هەڕەشەیان لێبکات و زیاتر کۆنترۆڵ لە دەستی خۆیدا کۆبکاتەوە و خێرا پێگە و دەسەڵاتی ڕەها بە دەستبێنێ کە مەبەستی بوو پێیبگات. سیستەمی حوکمکردنی ڕاستەوخۆ لەلایەن کاربەدەستانەوە کەوا بەشێوەیەکی سروشتی بەلای تێکشکاندنی تیرە و هۆزدا دادیەشکێنێ و دەخوازێ کۆمەڵگایەکی دیموکرات و تەبا لە ڕەنجدان و کارکردندا دامەزرێنێ‌و ئەمەیان ئەو نەیدەخواست. ئەو وەك ڕاوێژکاری سەرەکی ئەفسەری سیاسی هانی بووژانەوەی سیستەمی خێڵەکیی دەدا- کە لە سلێمانیدا — لە حاڵەتی گیانەڵادا بوو"[50].

ئەگەرچی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کەوا سۆن زۆر ڕقی لە شێخ مەحموود بوو و خۆیی بۆ مەڵاس‌دابوو لە داهاتوودا پێی بڕێژێت بەڵام هێشتا هەر سیستەمەکە و ئەوانەشی کە لایان پەسەند بوو بێ دەسکاری مابوونەوە.

لەمەداو لە هەموو پەیوەندییە ڕەسمییەکانی تریشدا سۆن هەرگیز قسەی نەدەخواردەوە و نە پێداویستی ڕەسمیی نەریتی ڕەفتارکردن و نە ترس لەوەی دیسپلینی کاروبار دەشێوێنێ، هیچیان نەیانتوانی زمانی ئەم کابرایە نەرم بکات یان هەڵوێستی چاك بکات[51].

---

[50] هەمان سەرچاوە.

[51] بۆ وەسفکردنی کاراکتەری سۆن و قسەی ڕەقی و عادەتی لە نووسینی ڕاپۆرتدا "زۆر جار بە زمانی زبر و بێڕێزیی دەینووسی" بڕوانە ویلسن: دڵسۆزان، ل٨٢-٨٣، هەروەها سێر ئەرنۆڵد ویلسن، "ئی.بی.سۆن، یاداشت: بۆ میزۆپۆتامیاو کوردستان" ١٩٢٦.

له باسی هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا و سەرۆکی کورددا، سۆن دێته سەر باسی پرۆسەکه و خراپیی ئەم سیستەمه نوێیه کەوا بێکەڵکه، دواکەوتووه وجێبەجێ ناکرێت:

"بووژاندنەوەی سیستەمی خێڵەکیی بزووتنەوەیەکی پێچەوانەو پاشگەزبوونەوەیه. ئێستا کوردستان به شێوەیەکی فراوان له خێڵگەرێتی دەرچووه و ئاستێکی بووژانەوەی تێدا هاتووەته ئاراوه و له فره ڕووەوه چووەتەوه دۆخی پێش جەنگ. ئێستا ئەفسەری سیاسی دیدو بۆچوونی شێخ مەحموودی قبووڵ کردووه که تەواو وزەو توانای تەرخان کردووه بۆ دووباره گێرانەوەی خێڵگەری. هەر پیاوێك نازناوی هۆز یا خێڵی پێوەبێت خراوەته ژێر ڕکێفی سەرۆك هۆزێکەوه. بیرۆکەکەوابوو که باشووری کوردستان دابەش بکرێت بەسەر ناوچەکانی خێڵدا و بخرێته ژێر ڕکێفی سەرۆك خێڵەکانەوه. پیاوانی دێهاتنشینی بێکەڵك و گەمژەیان دۆزیوەتەوه و به سەرۆکی ئەو خێڵانەیان داناون که دەمێکه پووکاونەتەوه و لەناوچوون. به دەستەو تاقمی خانوونشینی ناوچه گەرمەکانی لای کفرییان وتووه که یەکگرنەوەو بیری خۆیان بخەنەوه که ڕۆژگارێك خەڵکی خێڵەکیی بوون و سەرۆك خێڵیان بۆ دۆزراوەتەوه. باج و خەراجی داهات دەبوو به پێی خەملاندنی ئەم سەرۆك هۆزه بدرێ. دەبوو ئەم سەرۆك هۆزه ئیدارەی یاسا بدات ، که تەنها دەبوو دانی بەوەدا بنایا که شێخ مەحموود حکومداری کوردستانه "حکومداری ڕەهان خێرخوا" و له بەرانبەر دا خەڵات و یارمەتی وەربگرێت. ژیانی خۆش بۆ پیاوی عەشایەر بەڵام مردن و فەوتان بۆ بازرگانی وشارستانیەت و ئارامی. ئەمه هەر وابوو و تۆماری جێگری ئەفسەری سیاسی له سلێمانی شەڕیکی سەخت و درێژخایەن دەخاته ڕوو دژ به ئەنجامه سروشتیەکانی سیستەمەکه. تاوانبارێکی خێڵەکیی خۆی فڕێبداته بەر پێی سەرۆکەکەی، گوناهکارێکی گەوره کوڕنۆش بۆ شێخ مەحموود ببات دەبەخشرێ و تەنانەت بەر سۆز و خۆشەویستیش دەکەوێت. هەر جۆره گوناه و تاوانێك دەکرێ ببەخشرێت ئەگەر بەرزبکرێتەوه بۆ شێخ مەحموود کەوا دەستبەجێ کارەکه لەگەڵ ئەو به

ناو سەرۆك عەشیرەتەی گوناهكاردا چارەسەر دەكات. خەڵكی وڵاتەكە بە جارێ نائومێدبوون، دەست و قاچیان دەبەسترێت و دەخرێنە بەر دەستی ئەو سەۆك هۆزانەی بوون بە خاوەن دەسەڵات بۆ ئەوەی زوڵم و ستەمیان لێبكەن و خڵتانی خوێنیان بكەن"[52].

ئەنجامی چوونە ناو ئەم سیستەمەوە سەپاندنی ڕژێمێكی گەندەڵی ستەمكار بوو بەسەر خەڵكەوە. سۆن بە چاكی ڕەوتی خراپەكاری و ناعەدالەتی ئەم ڕژێمە باس دەكات:

"سیستەمی خێڵەكیی سیستەمێكی ئایدیالیستەو وەك گەڵێ پرۆژەی لەو چەشنە هەڵدەوەشێتەوە كاتێ پەیوەندیی لەگەڵ بێڕێزكردنی مرۆڤدا دەگرێت. كاریگەریی ئەو لە نایاسایی بەربڵاودایەو خەڵكی دەرفەتی ئەوتۆیان نیە بۆ سەرفراز بوون و ڕزگاربوون لە ستەمكاری ئاست نزم و بە كورتی ئەم سیستەمە بوو بە چاودێر و باوكی خەڵكی خراپ و زیانبەخش و سەركوتكەری كەسانی دیموكرات"[53].

سۆن باسی ئەوە دەكات كەوا ئەفسەرە سیاسییەكانی بەریتانیا ناتەواوی و كۆسپی ئەم سیستەمەیان دۆزیوەتەوە، هەروەها ڕاپۆرتێكی گواستووەتەوە كە لە لایەن كاپتن لۆنگریگ "دواتر بووە بە بریگادێر" یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە كەركووك بەرزكراوەتەوە، لە ڕۆژی ٢٩ ی نۆڤەمبەری ١٩١٨ دا. كورتەی ڕاپۆرتەكەی لۆنگریگ ئەوەیە كەوا سەرەڕای قبوڵ كردنی ئەم سیستەمە لەلایەن ژمارەیەكی زۆری كوردەوە، بەڵام تەنها بۆ ئەو گونجاوە ببێتە مایەی نیگەرانی ئەو كەسانەی كە بە بێكەڵكی دەزانن. هەروەها سەرنجی ئەوەش دەدا كەوا ڕەنگە هەندێك تا ئەوساتە لێی ناڕەحەتبن كە حەز بكەن ئەفەندییە كۆنەكان دواتر كاربەدەستانی تورك بگەڕێنەوە. لەوەش زیاتر، لۆنگریگ ترسی ئەوە دەردەبڕێ كەوا كورد لەژێر سایەی ئەم سیستەمە نوێیەدا ڕەنگە بیسەلمێنن كە یەكسان بن لەگەڵ توركدا وەك ستەمكارێك[54]. تەنانەت پركێشیی ئەو ڕایەش دەكات كە ئەم ڕژێمە نوێیە ڕەنگە

---

[52] عێراق "ئیدارەی بەریتانی"، مەكتەبی كۆمسیۆنیمەدەنی، ڕاپۆرتی ئیداری كەرتی سلێمانی ساڵی ١٩١٩، ل٣.

[53] هەمان سەرچاوە.

[54] لۆنگریك لە سەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە، ل٣-٤.

لەلایەن جووتیارانەوە بدرێتە دواوە. دواجار دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا "ئەمە بە ئاشکرا دیموکراسی دەکاتە قوربانی نەتەوەیی، جا باشتر بێت یان خراپتر. کارێکی ئاسانە، با خۆشیشی نەبێت کەر بێت لە ئاست هاواری ڕاستەقینەدا دژ بە کاری هەڵبژاردەی خۆمان"[٥٥].

لەڕاپۆرتێکی تردا کە مانگێك دواتر "دیسەمبەر-کانوونی دووەم ١٩١٨-١٩١٩" لۆنگریگ بەرزیکردووەتەوەو دیسان مشتومڕ لەسەر سیستەمی خێڵەکیی دەکات و وەك ئەزموونێك بۆیدەگێڕێتەوە. پاش ئەوەی تێبینی ئەو مەترسییانە دەکات کە پەیوەندیدارە بەوەی خەڵکی خێڵەکیی بخرێنە بەر ڕەحمەتی سەرۆك خێڵەکانیان و باس لە سوود و قازانجێك کە لەم سیستەمە بەدەستدێت. بە پێی بۆچوونی ئەو سیستەمەکە چاودێری هەستی نەتەوەیی دەکات لای کورد و کەسی خێڵەکیی لە گەندەڵی و کاریگەریی خراپی کاربەدەستان دووردەخاتەوە و ژمارەی گوناهکارانی دژ بە دادپەروەری و ئازادی کەمدەکاتەوە[٥٦].

کارێکی باشە ڕای ئەفسەرێکی بەریتانیی تر ڕەچاو بکەین سەبارەت بە سیستەمی نوێی کارپێکراوی خێڵەکی. ڕ.ئێس.جاردین R.S Jardine کە لەو دەمەدا یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی بوو لە کفری لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێ:

"سیستەمی خێڵەکیی قەزا لە بارێکی هەڵوەشاندنەوە و لەناوچووندایە و ئەمە پرۆسەیەکە لەلایەن سیاسەتی تورکەوە چاودێریی دەکرێت لەدەمی حووڕییەتەوە[٥٧]. لە هەندێ حاڵەتدا کوێخای گوند کەس بە سەرووی خۆی نازانێ ئەفسەری سیاسیی لێبەدەر. ئەمە وا دێتە بەرچاو کە ئاسانکردنی کاری کۆکردنەوەی داهات بێت، بەڵام وا لە ئیدارە دەکات کە لە ڕووی دادپەروەری و یاساو نیزامەوە قورسایی زیادی بکەوێتە سەر وەك لەو شوێنانەی سیستەمی

---

[٥٥] هەمان سەرچاوە، ل٤.

[٥٦] عێراق "ئیدارەی بەریتانی" مەکتەبی کۆمیسیۆنی مەدەنی، ڕاپۆرتی ئیداریی کەرتی کەرکووك بۆ ساڵی ١٩١٨. ل٤٣٢.

[٥٧] حوڕیە عەرەبییەو واتای ئازادی دەگەیەنێت. ئەمە زاراوەیەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەروەختی ڕیفۆرمی دەستووری لە دوای ڕووخاندنی سوڵتان عبدالحمید لەسەر دەستی تورکە لاوەکان.

خێڵەکیی لە شێوازی سەرەتاییدا خۆی دەنوێنێ. لە چەندین شوێنی ئەم ناوچەیەدا من توانیومە وا لە سیستەمی خێڵەکیی بکەم بەر پرس بێت لە قانوون و نیزام، بەڵام هەموو هەوڵەکان بۆ بەکارهێنانی ئەو سیستەمە لە داهات کۆکردنەوەدا تەنها بووە بە مایەی دواخستنی بێپاساوی کۆکردنەوە یان مامەڵەی نا عەدالەت و نا بەجێ لەگەڵ فەلاحدا "واتە جووتیار". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی خێڵەکیی بە تاقیکردنەوەیەکی باشی دا دەنێم"[٥٨].

لەم ڕاپۆرتەوە تێبینی ئەوە دەکرێت کەوا تەنانەت ئەو ئەفسەرە سیاسیانەش کە وەك سۆن بەو توندییە بەرهەڵستیی سیستەمی خێڵەکییان نەکردووە بەڵام ئەمانیش بەدگومانیی خۆیانیان لە ئاست دادپەروەری و حیکمەتی کارپێکردنی. بێگومان بەریتانیەکان وەك هۆکارێکی کاتی پەنایان بردووەتە بەر سیستەمی خێڵەکیی. بە نەبوون و دەست نەکەوتنی ژمارەی گونجاوی کارمەندی ئەزموونداری بەڕێوەبردن و هێزێکی گەورەی کارامە کە بتوانێ مامەڵە لەگەڵ ئەرکی پارێزگاریی قانوون و نیزامدا بکات لە ناوچە تازە داگیر کراوەکاندا، بۆیە ناچار دەبن سیستەمێکی حوکمەت دابهێنن کە بتوانن لە ڕێگەی بەگەڕ خستنی ژمارەیەکی کەمی ئەفسەرانی خۆیانەوە و بە سەرپەرشتیی ئیداریی ئەوان کار ڕایی بکەن.

بەریتانیەکان پێویستیان، یان وای لێکردەدەنەوە کە پێویستیان بە پشتگیریی سەرکردە خۆماڵییەکان هەیە، بەشێوەیەکی هێندخراپ کەوا بێ دوو دڵی تاپەڕی ئەو پەڕ دەڕۆن بۆ ڕازیکردنیان. لەپێناوی مسۆگەر کردنی هەماهەنگی و هاوکارییاندا، کاربەدەستە بەریتانیەکان زۆر دوور دەڕۆن تا ئاستی ملکەچکردن و مامەڵەی نارەوا لەسەر حیسابی خەڵکەکە بەگشتی. زۆرێك لە سەرکردە خێڵەکییە دەسەڵاتدارەکان و خاوەن موڵکەدەوڵەمەندەکان هەلیان بۆ ڕەخساوە زەوی‌وزار بکەنە موڵکیان و هیچ ناونیشانێکی ڕوونیشیان نییە. ڕاستێکەی لەزۆر حاڵەتدا ئەوان هیچ مافێکیان لەو زەوی و زارەدا نییە کە لەژێر دەستیاندایە بەدەر لەوەی کە بە زۆر داگیریان کردووە. بێڵ، ئەم کێشەیە لەچەند دێرێکدا ڕوون دەکاتەوە:

---

[٥٨] هەمان سەرچاوەی خالی(٥٦)، ل٤١٧.

" له یەکم جارەوە دڵەڕاوکێیەکی تایبەتی لەناو ئاغاکاندا پەیدابوو لە ترسی ئەوەی کەوا داگیرکردنی بەریتانیەکان دەبێ ئەو پرسیارەی بەدوادا بێت چەشنی خاوەندارێتی زەوی کە لە زۆربەی حاڵەتدا هیچ مافێکیان بەسەرەوە نییە بە زۆر داگیرکردنی نەبێت. هەر چەندە تواناو دەسەڵاتی ئاغاو سەید لەگەڵ بەرژەوەندیی خەڵکی عەوامدا یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام لەو دەمەدا مەحاڵ بوو بەربەستیان بۆ دابنێی. بۆ هێورکردنەوەو ڕەواندنەوەی مەترسییەکانی چینی فەرمانڕەوا تۆماری تاپۆ نەنێردرا بۆ بەغدا، کە دەبوو وردبینی تێدا بکرایەو لەبری ئەوە ڕێگەدرا کە بەشێوەیەکی کاتی لە سلێمانی بمێنێتەوە"[59].

لەبەر ڕۆشنایی پەرەسەندنەکانی دواتر، ئاشکرا بوو کە ئەم ئیمتیازاتانە بە تەواوی بێسوودن، لەبەرئەوەی گەلێك لەوانەی ئەم خەڵات و بەراتەیان درایە دواترو پاش چەند مانگێك لە دژی بەریتانیا هەستان.

## تێکچوونی پەیوەندیی نێوان شێخ مەحموودو بەریتانیەکان

### بێزاریی شێخ لە کۆت و پێوەندەکانی بەریتانیا:

ئێستا شێخ مەحموود ئەو پێگەیەی بەدەستهێناوە کە بەپەرۆشەوە هەوڵی بۆ داوەو ئەو ڕاستییەی نەدەشاردەوە کە هەموو ئیمتیازێکی ویستووە بەڵام هیچکام لەو ئیلتیزامانەی بۆ بەدینەهات کە هاوشانی ئیمتیازاتەکان بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیی دامەزراندنی وەك حوکمدار هەندێ بارودۆخی تایبەتی هێنایە پێشەوەو واپێدەچوو حیسابی دەسەڵاتە بێسنوورەکەی خۆی بۆ دەکردن. ئەو ناوچەیەی بۆی هەبوو ئیدارەی بدات سنوورەکەی لە نێوان زێی گەورەو ڕووباری سیرواندا بوو وە دەسەڵاتی ئەویش وەك فەرمانڕەوایەك بەتەواوی کورتکرابووەوە بەوەی سەر بە بەریتانیایە. شێخ نەیدەویست ئەوە

---

[59] بێل، پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی، ل٣٠.

قوبووڵ بکات کە بە کۆیلەکردنێکی ئەنقەستی لەقەڵەم دەدا بۆ تەگەرەدان لە دەسەڵات و کاریگەری ئەو و دەستوەردان لە ئازادیی کارکردنیدا.

ئیدمۆندز، لە نووسینێکدا چەندین ساڵ دوای ئەم ڕووداوانە باس لە کاردانەوەی شێخ مەحموود دەکات بەرانبەر بەو کۆت و سنووردانانەی خستبوویانە سەردەسەڵاتەکەی و سەرنج ڕادەکێشێ بۆ سەرجەمی بارودۆخەکە کەوا نەگونجاو و قوبووڵ نەکراو بووە بۆ میزاج و ئەقڵییەتی کەسێکی وەك شێخ مەحموود. "ئەو زۆر بێتاقەت بوو لە سنووردارکردنی دەسەڵاتەکەی بۆ ئەو ناوچانەی دیاریکرابوون. تەنانەت لە سەردەمی تورکیشدا ئەو وەك هاوڵاتییەکی کاربەدەست لە ڕێگەی دەستوپێوەندیەوە ترسی خستبووە دڵی شارەوە، کەچی ئێستا بەرەسمی حوکمدارە تێناگات لەو گرفت و کۆسپانەی خراونەتە بەردەمی تەنانەت لەلایەن دەستەی ڕاوێژکاریی نۆئێلی لە سەرخۆو میانڕەویشەوە"[60].

بێل، گومان ناهێڵێتەوە لە هەڵوێستی شێخ مەحموود سەبارەت بەم مەسەلەیەو جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەم هەڵوێستەی شێخ لەژێر کاریگەریی توندی پیاوەکانی دەورووپشتیدا بوو. بە پێی قسەی بێل، ئەم پیاوانە لە جیاتی ئەوەی هانی بدەن بۆ گفتوگۆیەکی هێمنانەو لە سەرخۆ، دنەی ئەوەیان دەدا هەڵوێستێکی ڕەق و پڕ لە ڕەنگاری وەربگرێت.

" شێخ مەحموود ئامادە نەبوو کەمتر لە تورکمانمان لێ قوبووڵ بکات و هیچ سنوورێك بۆ دەسەڵاتی دابنێین. کۆمەڵێك کەسانی خۆپەرست و مەراییکەر دەوریان دابوو و مێشکیان پڕکردبوو لە ئایدیای پەڕگرو ناواقیعی و خستبوویانە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە فەرمانڕەوای تەواوی کوردستانە. ئەو بەردەوام دەستی دەخستە کاروباری ئیدارەوەو دەزگاکانی بەرێوەبردنی پڕکردبوو لەخزمی خۆی و کەسانی مفتخۆر"[61].

---

[60] ئیدمۆندز: کورد، تورك، عەرەب، ل٣٠.

[61] بێل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣ ، لە E.J.R ، ل١٣ وەرگیراوە.

هەچەندە شێخ مەحموود دڵی خۆش بوو بە پشتگیری و یارمەتیدانی بەریتانیا، بەڵام بە ئاشکرا بڕیاری دابوو مل بۆ هیچ ڕێگرییەك کەچ نەکات. سەرەتا بە ئاگادارییەوە خۆی پیشان دەدا پێداویستیەکانی سیاسەتی بەریتانیا جێبەجێ دەکات، بەڵام پێدەچوو بڕیاری خۆی دابێت کە بەرێگەی تایبەتی خۆی شوێن ئامانجەکانی بکەوێت. بەم ڕەنگە هەموو توانای خستەگەڕ بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی و فراوانکردنی کاریگەریی لە سەرانسەری کوردستاندا، بێگوێدانە ئەوەی بەریتانیەکان چۆن بیردەکەنەوە و چیدەکەن. لە ماوەیەکی قیاسیی کەمدا توانی سەرکەوتن بەدەستبێنێت لە زیادکردنی هێزو دەسەڵاتیدا و فراونکردنی کاریگەریی بۆ ئاستێك کەوا بەریتانیەکان هەستیان کرد ناچارن هەندێك کاری بە پەلە بکەن بۆ ئەوەی رایبگرن پێش ئەوەی بارۆدۆخەکەیان لە دەست دەربچێت.

هێشتا مانگێك تێپەر نەبوو بوو بەسەر دامەزراندنی شێخ مەحموودا وەك حوکمدار لەلایەن جێگری کۆمیسیێونی مەدەنییەوە کاتێ بەریتانیەکان بەخۆیان زانی کەبەرەو ڕووی پێویستبوون بە پێداچوونەوەیەکی کاریگەر بوونەتەوە بۆ تەواوی کاروباریان لە باشووری کوردستاندا. دوو تێکستی چون یەکی دوو ڕاپۆرتی ڕەسمی باس لەوە دەکەن کە " بەکۆتایی مانگی دیسەمبەر دوودڵی و گومان سەریان هەڵدا کە ئایا ئەقڵ قوبووڵی دەکات ڕێگە بە زیادبوونی دەسەڵاتی شێخ مەحموود بدرێ بەم ڕادەیە گەورە بێت و پەرەبستێنێت". [٦٢]

ڕەنگە مەسەلەکە سەیرو نامۆ بێت و تەنانەت دژواریش بێت کەوا بەریتانیەکان هێند بێزاربن لە گەشەکردنی هێزو دەسەڵاتی پیاوێك خۆیان پشتیان گرتبێت و یارمەتیان دابێت ودەسگرۆییان کردبێت کە بکرێتە فەرمانڕەوای حکومەتێکی کوردیی نیمچە سەربەخۆ. تا ئەو ئاستەی ئەم مشتومڕە پەیوەندیی بەو مەسەلەیەوە هەبێت، مەسەلەیەکی بنەڕەتی نییە

---

[٦٢] E.J.R ل١٢، هەروەها بڕێ: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣.

بڕیاری ئەوە بدەیت ئاخۆ شێخ مەحموود لەم پێگەیەیدا قەرزاری بەریتانیەکانە و ئەگەر وابوو تاچ ئاستێك. ئەوەی بایەخدارە ئەوەیە کە شێخ چۆن بیر لەم بارە دەکاتەوە. ڕاستییەك هەیە کەوا شێخ مەحموود بەریتانیەکانی بە خاوەن چاکەو پیاوەتی بەسەرخۆیەوە نەدەزانی و بەم پێیەش هەستی نەدەکرد چاولەبەریانەو دەبێ هەتا هەتایە دڵسۆزیان بێت و لەمامەڵەکردنیاندا وا دەردەکەوت سیاسەتێکی هەلپەرستانەی گرتبێتەبەر. ئەو سوودی لەو یارمەتییە مادی و مەعناوییانە دەبینی کە دەیاندایەو ئەم پەیوەندی و مامەڵەیە سوودبەخش بوو.

شێخ مەحموود بە هەڵپە کاری دەکرد بۆ زیادکردنی تواناو دەسەڵاتی و فراوانکردنی کاریگەریی خۆی نەك تەنها لە سنووری کوردستانی باشووردا، بەڵکو لە هەر شوێنێك بۆی بلوایە دەیکرد. ئەگەرچی لەڕاستیدا ئەو بەدوای تێکدانی پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیادا نەدەگەرا بەڵام لەمەودوا کەمتر گوێی بەرازیکردنی ڕووکەش دەداتو بەئاشکرا سەرگەرمی بەهێزکردنی پێگەی خۆی بوو، لە هەمان کاتیشدا گاڵتەی بە ڕێککەوتننامەکانی دەهات لەگەڵ بەریتانیادا و ڕاسپاردەی ئەفسەرە سیاسییەکانی پشتگوی دەخست. وا پێدەچێت گەیشتبێتە ئەو ئەنجامەی کەوا شتێکی ئەوتۆ نەماوە بە دەستبێت لەڕێگای هاوکاریی زیاترەوە لەگەڵیاندا. سەرباری ئەوەش وای بۆ دەچوو کەوا هێند بەهێزبووە بەریتانەییەکان زات ناکەن بەرەنگاری ببنەوە و بەگژیدا بچن و بەوپێیە چی بخوازێ دەیکات و کەس پێی ناوێرێت. سەیر لەوەدایە کەوا شێخ مەحموود، وا بە پەلەو پاش قۆرخکردنی دەسەڵات، کۆمەڵێك کار و کردەوە بکات بیپلکێنێتە باری ناکۆکی و ململانێ لەگەڵ بەریتانیەکاندا. لەبەر هەر هۆیەك بووبێت کە ڕەنگە ویستبێتی خۆی دەرباز بکات لە وابەستەیی بە بەریتانیەکانەوە، گومانی تێدا نییە کەوا پەلەی کردووە لە کارەکەیدا وتەکتیکی نەبووەو زۆری بیر نەکردووەتەوە لە پاریزکردن لە ململانێیەکی نابەرنبەر. کاربەدەستە بەریتانیەکان لە حکوومەتی ئۆتۆنۆمیداری باشووری کوریدا پەشۆکاو و نائومێد و تووڕە بوون لە هەڵسوکەوتی شێخ. ئەمانە

هـەرگیز لێـی نـابوورن چـونکە زۆر بـەرەقی هیـواو ئـاوات وچـاورەروانییانی بـەباداو هـەرکاتێ نـاوی بێـنن لێـی پـرن و بەباشـە باسـی ناکـەن و لـە باشـترین حالەتـدا ئەگـەر زمانیـان بـەخێر بگـەرێ لـە ئاسـتیدا دەڵـێن پیـاوێکی شـێت یـان منـداڵ بـوو. سـاڵی ١٩٢٨ و لـە هـەوڵدانێکدا بـۆ دۆزینـەوەی ڕوونکردنـەوەیـەک لـەبارەی ڕەفتـارو هەڵـسوکەوتی شـێخ مـەحموودەوە جـی. ئـێم. ل G. M. leesحوکمێکی سەخت بەسەر کەسایەتیی شێخدا دەدات.

"ئاوبانگی خراپی شێخ مەحموود لەسەر مەسەلەی پارەو فروفێڵ زۆر باش زڕاوە، بەڵام بەرژەوەندییەکانی لەگەڵ هی ئیمەدا هاوکات بوو بۆیە دەرفەتی نەبوو چیتر درۆمان لەگەڵ بکات. بەداخەوە زۆر بەرەهایی متمانەی پێکراو زۆر ڕێگەی پێدرا کۆنترۆڵی پارەو پوولی پارمەتییە قەبەکەی بکات. ئەو هەر زوو قۆرخکردنی دەسەلات و پارە لەخشتەی بردو کەڵکەڵەو خولیای لەو سنوورە تێپەڕی کە بۆی دیاریکرا بوو و لە دواییدا خۆی بەشای کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو لەقەڵەم دەدا"[٦٣].

ویلسن، لەبارەی شێخ مەحموودەوە دەڵێ: "لەکەمتەرخەمیدا، نەک لە بەرائەتدا، لە منداڵێک دەچوو، بەخولیایەکی گەورە و کارامەییەکی سروشتیی زۆرەوە. ئەو خاوەنی سۆزێکی بەلێشاو و لەهەمان کاتیشدا دڵڕەقییەکی بێپایان بوو و وەک سۆن بۆی دەچێت کەوا فرەجار بەرپرسی نەبووە لە هەڵسووکەوتی"[٦٤].

## کاریگەریی ئایدیاو ڕووداوەکان لەسەر شێخ مەحموود:-

نووسەرانی تری بەریتانیی ڕاوبۆچوونی هاوشێوەیان لەبارەی شێخ مەحموودەوە دەربڕیوە. ئەم تۆمەتانە تاچەند ڕاستن یان ئەمەسەلەیەک نین و هەندێ شتی تر دەبێ کاریگرییان بووبێ بەسەر هەڵوێست و کردەوەکانی شێخ مەحموودەوە. بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی شیاو لەسەر بیرکردنەوەی شێخ

[٦٣] ل Less"، دووساڵ لە باشووری کوردستاندا"، ل٢٥٣-٢٥٤.

[٦٤] ئەی.تی. ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٤؛ هەروەها لونگریگ، عێراق١٩٠٠-١٩٥٠، ل١٠٤.

مەحموود دروست بکەین و بگەینە هەڵسەنگاندنێکی ڕەوا بۆ ئاکار و ڕەفتاری، دەبێ هەموو فاکتەرەکان ڕەچاو بکەین.

بیرکردنەوەی شێخ مەحموود ئەو ئایدیایە داگیری کردبوو کەوا کوردەکان بە تایبەتی ئەوانەی باشووری کوردستان –مافی ئەوەیان هەیە دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان هەبێت و ئەویش بە هەقی خۆی سەرۆکی دەوڵەتێکی وابێت. ئایدیای دەوڵەتێکی کوردی لە گەڵێ بەیان و جاڕنامەی جۆراوجۆر ی هاوپەیماناندا بانگەشەی بۆ کراوە لە سەردەمی جەنگ و دواتریش کەش و هەوای گشتیی ئەم بیروبۆچوونەو پاشان زاڵبوون و تەشەنەکردنی لەناو سەرکردە کوردەکاندا لە هەموو شوێنێك و ئایدیای سەرۆکایەتی ئەو لە کەسایەتیی خۆی وەدەرکەوتن و دەسەڵاتی بنەماڵەی بەرزنجی لە باشووری کوردستاندا سەری هەڵداوە.

شێخ مەحموود، لەم پلەو پایەیدا بە زۆری قەرزاری شکۆ و ناوبانگی بنەماڵەکەیەتی پیرۆزی و شکۆی سێ کەس لە باوباپیرانی خەرمانەیەکی پیرۆزیی گەورەیان بۆ ئەم بەجێهێشتووە. باپیرەگەورەی کە شێخ مارفی نۆدێیە زانایەکی ئاینیی گەورەبووە لە مشتومڕی موعجیزە ئامێزدا سەرکەوتووە بەسەر مەولانا خالیدی نەقشبەندیدا[٦٥]. حاجی کاك ئەحمەدی باپیری شێخێکی گەورەی تەریقەت بووە لە باشووری کوردستاندا[٦٦]. ئەوجا شێخ سەعیدی باوکی هێزو شکۆیەکی گەورەی بووە و هاوڕێی سولتان عەبدولحەمید بووەو بە شەهیدیی کۆچی دوایی کردووەو لە ئاژاوەگێڕییەکی شاری مووسڵدا کوژراوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بوو بە ڕەمزی ستەم وناپاکی دەرهەق کردن لە بنەماڵەی بەرزنجی و شوێنکەوتووانیدا دژ بە حکوومەتی عوسمانی[٦٧].

---

[٦٥] بۆ ژیاننامەیەکی کورت و کارەکانی شێخ مارف بڕوانە محەمەد ئەمین زەکی، "تاریخ السلیمانیة وانحائها –مێژووی سلێمانیو دەوروبەری"، گوڕینی لە کوردییەوە بۆ عەرەبی: مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی–١٩٥١. هەروەها: ئەدمۆندز: کورد، تورك، عەرەب ل٧١.

[٦٦] ئەدمۆندز:هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤ بەوردی زانیاریی لەسەر ئەو موعجیزانە دەدات کەوا کاك ئەحمەد نواندوونی. لە ئەمین زەکی: تاریخ السلیمانیه وانحائها وەرگیراوە، ل٢٢٤.

[٦٧] لە بەشی دوانزەدا بەوردی باسی چالاکی شێخ سەعید کراوە.

ئەم بنەماڵەیە، کە لە شوێنی تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ناوی هاتووە، بەردەوامترین و بەهێزترین داواکاری دەسەلاَت بووە لەناوچەکەدا لە سەردەمی کەوتنی بابانەکانەوە. شێخ مەحموود، ئەگەرچی بە تەمەنترین کەسی بنەماڵەی دەسەلاَتداری ساداتی بەرزنجە نەبوو، بەلاَم وەك سەرۆکی تەواوی، پێشسپیانی بنەماڵە پیرۆزەکە ناسرا و بەیعەتی پێدرابوو. کەوابوو وەك سەرۆکی بنەماڵەی بەرزنجە وەك سەرکردەیەکی کاریزمی، شێخ هەستی ئەوەی لا دروست بوو بەهێزترین داوای هەبێت بۆ سەرکردەیەتیی کوردستانی باشوور.

لەم سۆنگەیەوە، شێخ مەحموود هەمیشە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە لایەن کوردی ویلایەتی مووسڵ و تەنانەت بەشی سەرەکیی کوردەکانی ئێرانیش ماندێتی هەیە. ئەگەر ئەو بەراستی قەناعەتی بەم حەقیقەتە هەبێت، کەوا دەردەکەوێ هەشیەتی، دەبێ ڕەچاوی سنووردانان بۆ حوکم کردنی تەنها بەشێکی ئەو خاکەی داوای دەکات و ملکەچی دەسەلاَتەکەی بۆ بەریتانییەکان وەك ستەمێکی ناڕەوا و بێنابڕوو بۆ سەر مافەکانی. بەڵگەی بۆ ئەمە ڕوون و ئاشکرایە و شێخ قەناعەتی تەواوی هەبوو بە ڕەوایی داواکانی و مافی شوێنکەوتنیان. سێر ئەرنۆڵد ویڵسن، کاتێ سەردانی شێخ مەحموودی کرد بە بۆنەی برینداربوونی قورسیەوە لەشەڕی دەربەندی بازیاندا، وێنەیەکی یادەوەریمان بۆ دەگێڕێتەوە لەبارەی ئەم سەرۆکە کوردەوە، ویڵسن، کە نزیکەی دە ساڵ دوای ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ شێخ مەحموود بەم شێوەیە دەگێڕیتەوەو دەڵێ:

"من لە ئۆفیسی سلێمانی لە سێ بۆنەدا چاوم پێکەوت، لە نەخۆشخانە بینیم، کاتێ بەشکۆوە ئیشارەتی بۆ کردم و نکوولّی لە توانای هەر دادگایەکی سەربازی کرد بۆ دادگاییکردنی و بەندی دوانزەی سەرۆك ویڵسن و جاڕنامەی ئەنگلۆ-فەرەنسی ٨ی نۆڤەمبەری ١٩١٨ی بۆ دەرهێنام، کە وەرگێردراوێکی کوردی بووو لەسەر پەڕەی قورئان نووسرابوو، وەك بازیبەندکردبوویە قۆڵی"[٦٨].

---

[٦٨] ویڵسن: سەرچاوەی پێشوو. ئەم ڕووداوە وەك کە لە لایەن ویڵسنەوە باسکراوە و نووسەری سۆڤێتی ك. سارێژنین لە بابەتەکەیدا ئیشارەتی پێداوە: "عێراقی ئەمڕۆ: وێنەیەکی جوگرافی" نیوتایمز ژمارە(٦) ١٥ی مارتی ١٩٤٥)، ل٢٢.

لە ڕاستیدا ئەمە وێنەیەکی کارای سەرۆکێکی شۆڕشگێڕی کورد بوو بە ڕوحییەت و میزاجی ئەو دەمەوە لە کوردستاندا. ئەو دۆکیومێنتانەی شێخ بە شەخسی هەڵیگرتبوون و بەوانە داواکاری و داکۆکی خۆی پێشکەش دەکرد، بێگومان هەڵبژارەیەکی باش بوو، بە هەرحاڵ ئەمە دوان لەو فاکتەرە زۆرانە دەنوێنێ کە نەك هەر کاریگەرییان لەسەر شێخ هەبوو بەڵکو لەسەر ژمارەیەکی بێپایانی نەوەی ئەو هەبوو. ئێمە دەبێ بۆ ئەم هێزانە بگەڕێینەوە ئەگەر بمانەوێ لە پیاوێك تێبگەین کەوا بەم تۆنە دۆغری و ڕاستەقینەیە دەدوا لەگەڵ یەکێك لە نوێنەرە سەرەکییەکانی ئیمپراتۆریەتێك کەوا بەگژیدا چووەوەو بەرەنگاری بووە یا سەرکەوتنیشی بەدەست نەهێنابێت.

هەڵسوکەوتی شێخ مەحموود بوو بەجێی باس و لێکدانەوە تەنها لەو کاتەدا کە دژ بە کاروباری شێواوی حکوومەت دەخرایە ڕوو لە میزۆپۆتامیای داگیرکراودا لەلایەن بەریتانیاوە. تێکەڵوپێکەڵی ئایدیای نوێ و نامۆ. داواکاریی دژ بەیەکی گرووپە ناحەزەکان و کێبەرکێی ئایدیۆلۆجییەکان، فرۆفێڵ و ناپاکیی تەوژمە سیاسییەکان، واتەوات و دوو دڵی و گومان مێشك و دڵی زۆرێك لە پیاوان. بەیان و جاڕنامەی جۆراوجۆر ی هاوپەیمانان و جەنگ، چەشنی بەیاننامەی ئەنگلۆ-فەرەنسی ۸ی نۆڤەمبەری ۱۹۱۸ و چواردە بەندەکەی سەرۆك ویلسن، بەتایبەتی بەندی دوانزە لەمەڕ چارەی خۆنووسینی گەلانی غەیرە تورکی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی[٦٩].ئاژاوەگێڕیی تورك بە تۆنی پان ئیسلامی مەیلدار بەلای کورددا[٧٠]، پرۆپاگەندەی شەریفی مەککە، بە شێوەیەکی سەرەکی پان عەرەبی

---

[٦٩] کاریگەری جاڕنامەی ئەنگلۆ- فەرەنسی و ١٤ بەندەکەی سەرۆك ویلسن، لەسەر میللەتانی میزۆپۆتامیایی داگیرکراوی بەریتانیا بە گشتی، بڕوانە: ئەی.تی. ویلسن: دڵسۆزان Loyalties، ل١٠٢؛ هەروەها بێل: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦-١٢٧.

[٧٠] "هەروەها بەکرێگیراوانی شەریفیش لە کوردستانی باکووردا کاریان دەکرد بە ختووکەدانی هەستی موسڵمانان بە مەبەستی وروژاندنیان"E.J.R ل١٧.هەروەها بڕوانە: درایڤەر، کوردستان و کورد، ل٩٨. بێل: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٩. لە بارەی بانگەشەی شەریفەوە بۆ کوردەکان لە

و ناوچە عەرەبی زمانەکان، چالاکییەکانی نەتەوەپەروەرانی کورد لە سەرچاوەی جیاوازو بە بەرگی جۆراوجۆرەوە[٧١]. هەڵچوونی شۆڕشی کۆمۆنیستی و تەشەنەکردنی لە ناوچەکەدا لەپاش شۆڕشی ڕووسیا. هەموو ئەمانە تەنها جەختکردن بوو لەسەر هیواو ئاوات و مەترسیی ئەو ساتەوەختەو زیادبوونی پەشۆکاوی و شپرزەیی نیاز و مەبەستی نەزانراویان گومانی لێئالاّ بوو[٧٢].

پاشان واتەوات و ڕاپۆرتی دژ بە یەك دەهاتن و دەچوون. لە هەموو لا قسەو باسی دەستبالاّیی ئەرمەن[٧٣]، زاڵبوونی عەرەب[٧٤]، بووژاندنەوەی هێزی سەربازیی تورك[٧٥]، فەرەنسا ویلایەتی موسڵ بۆ خۆی دەبات[٧٦]،بەریتانیا لەوەدایە میزۆپۆتامیا چۆڵ بکات و هەر هەموو ئەمانەش بنەمایەکی خۆی هەبوو.

لە باکووردا، پاشەڕۆژی ویلایەتی مووسڵ هێشتا هەر لە گوماندا بوو، تورك کردبووی بە هەراوهوریاو هەڕەشەکردنی گێڕانەوەی بۆ خۆیان. زۆر

---

کاتی پەلاماردانی تەلەعفەردا بڕوانە: عێراق "ئیدارەی بەریتانی" ئۆفیسیی کۆمیسیۆنی مەدەنی، ڕاپۆرتی ئیداری مووسڵ بۆ ساڵی ١٩٢٠، ل٢-٣.

[٧١] چالاکیی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد لەپاش جەنگی جیهانی یەکەم لە ئەستەموڵ، قاهیرە، پاریس، دیمەشق و گەلێ شوێنی تر لە کوردستانی تورکیا و عێراق و ئێران سەری هەڵدا.

[٧٢] بە پێی ڕاپۆرتێکی بەریتانی "شۆڕشی ڕووسیا لە پشتی تورکەکانەو بەلشەڤیزم ئامادەیە بۆ یارمەتیدانی هەموو ئەوانەی سکالاّیان لە دژی ئیزامی جیهانیی ئێستا هەیە و جاڕی ئەوە دەدەن کە سیستەمی جیهانی ئەمڕۆ نەگونجاوە بۆ ڕێکخستنی کاروباری مرۆڤ"، بێل: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٩. ڕاپۆرتێکی تری ڕەسمیی دەڵێ:"تێبینی ئەوە دەکرێت کە باسکردنی بەلشەفیکەکان لە مووسڵدا لەمساڵدا ڕوو لە زیادبوونە. هاوپەیمانیی مستەفا کەمال لەگەڵیان پارەی باشی پێوەردەگیرێت و خەڵك وای باسدەکەن کە بڕێکی باش ئاڵتوونی لێوەرگرتوون". عێراق (ئیدارەی بەریتانیا) ئۆفیسی کۆمیسیۆنیمەدەنی، ڕاپۆرتی کەرتی مووسڵ بۆ ساڵی ١٩٢٠ ل٥.

[٧٣] E.J.R. ل١١. درایڤەر: کوردستان و کورد ل٨٠، بێل: هەمان سەرچاوەی پێشووڵ٥٨-٥٩.

[٧٤] درایڤەر، هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨١، ویلسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٨-٥٩.

[٧٥] ویلسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٢-١٥٣.

[٧٦] لە بارەی پڕوپاگەندەی فەرەنسییەوە بڕوانە: درایڤەر، "کوردستان و کورد"، ل٨٠-٨١؛ E.J.R، ل١١؛ ویلسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢.

لە ناوچە شاخاوی و دوورەدەستەکانی ویلایەتەکە یان دەسەڵاتێکی کزی بەریتانیەکانی بەسەرەوەبوو یان کەس دەستی پێنەدەگەیشت و تورك بۆی دەچوو. لە ناوچە عەرەبنشینەکان لە باشوور دۆخەکە تاڕادەیەك هەر گرژ بوو[٧٧]. سیاسەتی بەریتانیا ئەزموونگەری و کاتی بوو[٧٨].

بۆ کەسانی وەك شێخ مەحموود کە زۆری لەپێشەوە مابوو، ئەوەی کە سکاڵاو گومان بوو ئێستا وەك ئەگەرێکی جیاکار دەرکەوتووە. ئا لەم کاتەدا بوو کەوا شێخ بڕیاریدا پەیوەندی لەگەڵ تورك دامەزرێنێ و هەر زوو نووسراوی نارد بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ سەنتەری هەراو ئاژاوەی تورك لە شرناخ و ناو هۆزی گۆیانی یاخی[٧٩]. لێرەدا پێویستە ئیشارەت بەوە بکرێ کەوا کەسێك لە پێگەی شێخ مەحموودا بێت پێویستە دوورتر بڕوانێت لە هاوکارە بەریتانیەکان.

لە بەرەی شێخدا هەندێ شتی جیدی حیسابی بۆ نەکرابوو و شیرازەی تێکچوو بەهۆی خولیاو پەلکوتانی لە سنوور بەدەری و گەوجیی ڕاوێژکارانیەوە. ئەو ئامۆژگاریی ڕاوێژکارە بەریتانییەکانی پشتگوێ خست و گاڵتەی بە خواست و ئیرادەیان دەکرد و بەگشتی هەڵوێستێکی ڕەقی وەرگرت. پیاوێکی سەرچلی توندڕەوی لەرووی سیاسییەوە وشك و بەئاشکرا حیسابی بۆ دەرەنجامی ململانێ و پێکدادان نەدەکرد لەگەڵ هێزێکی گەورەدا. هەڵچوون

---

[٧٧] ویلسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٥-٢٨٦، ٢١٢،٩٢؛ لۆنگریگ، عێراق ١٩٠٠-١٩٥٠، ل٨١-٨٢، لیLess، "دووساڵ لە کوردستاندا"، ل ٢٥٥.

[٧٨] بەپێی ویلسن، "هەموو مانگێك هێزەکان بە ژمارەی قەبەوە لە وڵاتەکە دەڕۆن، بەڵام باس لە کەمبوونەوەی ئەرکی سەربازی نیە... بازرگانان و خەڵکی تر کە لە بەسرەو بەغداوە دەگەڕێنەوە بۆ سلێمانی باس لەوە دەکەن کە ڕۆژانە سەرباز بە کەشتی و شەمەندەفەر دەڕۆن و تەنانەت زۆر کەس پێیان وایە کەوا ئێمە جارێکی تر کوردستان چۆڵ دەکەین و خەڵکەکەی بە دەردی خۆیانەوە بەجێدێڵین بۆ ئەوەی گرفتاری دەستی ململانێی پیلانگێڕیی هێزە ناکۆکەکان بن". بڕوانە ویلسن: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٢،١٢٨،١٢٥؛ لی "دووساڵ لە باشووری کوردستاندا، ل٢٦٠-٢٦١؛ لۆنگریگ: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٨-١٢١.

[٧٩] E.J.R، ل١٥؛ بێل: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.

و تووڕەیی خاوبکەنەوە، تەنها هانیان دەدا بۆ پەرگری لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا. کارێکی مەحاڵ نەبوو کەوا شێخ دەیتوانی سەرکەوتن بەدەستبێنێ لە ئەنجامدانی زۆرێك لە نیازو مەبەستەکانی ئەگەر نەرمی و زمان خۆشی بەکاریهێنایە. بەریتانیەکان زۆر بێزار و خەمناك بوون لەسەر کێشەو سەرئێشانەو زۆر لەوە زێرتر بوون کە دۆستێکی بەنرخیان لەدەست بچێت. ئەوان تووشی کێشەو گرفتی زۆر بوون لە میزۆپۆتامیادا و لە سەرانسەری جیهاندا کەوا هەرگیز ئارەزووی ئەوەیان نەبووە بە دوای هیچ شتێکدا بگەڕێن لە چارەسەری ئاشتیانە بەولاوە هەر کاتێ گونجابێت.

## کەمکردنەوەی دەسەلاتی شێخ لەلایەن بەریتانیاوە:

ئێستا بەریتانیەکان قەناعەتیان هێناوە کەوا چیتر ناتوانن بڕوا بە شێخ مەحموود بکەن و تا ئیجرائاتی توند نەکەن بۆ تەگەرە خستنە ڕێی دەسەلاتەکەی ئەوە تەواوی پێگە و شوێنیان لە کوردستاندا بەردەوام هەرەشەی سەختی لەسەرە. ویلسن، ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەڵێ: "ئێستا وا ڕوون بووەتەوە کە ناتوانین بە ئاقڵانە و بە ڕێکی و چالاکانە پشتی شێخ مەحموود بگرین بۆ ئەوەی دەسەلاتی بشکێ بەسەرخێڵەکاندا، چونکە بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەوە ڕێککەوتووین کەوا پێویستە بەجۆرێك سیاسەتمان لە باشووری کوردستاندا بگونجێنین کە شێوازێکی بەڕێوەبردنی وا بخەملێنین هاوشێوە بێت لەگەڵ شوێنەکانی تری عێراقدا"[80].

لە سەرەتای مارتی ١٩١٩دا ویلسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنی کۆنفرانسێکی لە بەغدا بەست بە مەبەستی گفتوگۆکردن لەسەر دوا پەرەسەندن و پێشهاتەکانی کوردستانی باشوور. ژمارەیەك خەڵکی شارەزا چوونە کۆنفرانسەکە، لەوانە سۆن، نۆئێل، لیچمان و ئەی.ئێل. گۆردن وۆکەر. لەپاش مشتومڕێکی زۆر لەسەر شێخ مەحموود و تەواوی دۆخەکە لە

---

[80] ویلسن، هەمان سەرچاوە، ل١٣٤.

کوردستانی باشووردا هەموو کۆك بوون لەسەر ئەوەی کەوا "دەبێ دەسەڵاتی شێخ مەحموود وردە وردە کەم بکرێتەوە، بەڵام ئەگەر بکرێ بەشێوەیەك بێت کە خۆبپارێزین لە بەرپابوونی ناکۆکیی گەورە"[٨١]. لێرەدا گەیشتنە دوو بڕیاری بایەخدار: یەکەم، دەبێ سۆن جێگەی نوئێل بگرێتەوە وەك ئەفسەری سیاسیی لە سلێمانی و دووەم ژمارەیەك لەو خێڵ و ناوچانەی تا ئێستا لەژێر ڕکێفی شێخدان دەبێ ڕێگەیان بدرێ جیابنەوەو لێی بکشێنەوە[٨٢]. دامەزراندنی سۆن بەڵگەیەکی ڕوون بوو کەوا بەریتانیەکان نیازیانە بە توندی مامەڵە لەگەڵ شێخدا بکەن و بەش بەحاڵی سۆن ناسرابوو بەوەی کە توندو ناحەزە لەگەڵ بنەماڵەی بەرزنجەدا بەگشتی و شێخ مەحمووديش بەتایبەتی. ئەمەش ئەو هەستە دەگەیەنێت کەوا هەرگیز ناتوانێ ئەم کارە بشارێتەوە، وەك پێشتر باسی لێوەکرا[٨٣].

هەنگاوی بە پەلە نرا بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی لە کۆنفراسەکەدا وەرگیرابوون. سۆن سەفەری کرد بۆ سلێمانی و لە ڕێگەیدا بەرەو ئەو شارە لە کفری و کەرکووك لایدا، بەنیازی کارکردن لەو پرۆسەیەدا کەوا بە زووترین کات جێبەجێی دەکات و ئەویش داماڵینی ناوچەو هۆزی جۆراوجۆرە لەژێر دەسەڵاتی شێخ[٨٤].

هۆزی جاف، کە هەواری زستانەیان لە ناوچەی کفری بوو، وا باسبوو کۆکن لەسەر ئەوەی لە شێخ مەحموود جیاببنەوەو ڕاستەوخۆ بخرێنە ژێر

---

[٨١] ل، ویڵسن، هەمان سەرچاوە.

[٨٢] ویڵسن، ل، لۆنگریگ: هەمان سەرچاوە.

[٨٣] ڕق هەڵسانی سۆن لە شێخەکانی بەرزنجە دەگەڕێتەوە بۆ دوانزە ساڵی لەمەوپێش کاتێ بە نەناسراوی نیشتەجێی کوردستانی باشوور بووە. بێگومان لەمەیاندا کاریگەریی بەگزادەکانی هەڵەبجەی لەسەربووە، بە تایبەتی عادیلە خانم، کە زۆر دۆستی بووە. سۆن زۆر بەتوندی ڕەخنە لە شێخ مەحموودو بنەماڵەکەی دەگرێت لە کتێبەکەیدا "بە نهێنی لە میزۆپۆتامیاو کوردستاندا" و ژمارەیەك ڕاپۆرتی ڕەسمیش، وەك ڕاپۆرتەکەی لەسەر ناوچەی سلێمانیی لە کوردستان"ساڵی ١٩١٨".

[٨٤] بێل: هەمان سەرچاوە، ل٦٤.

دەسەڵاتی بەریتانیاوە[٨٥]. کاپتن جی.ئێم.ڵی کەوا کرابوو بە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی بەرپرس لە کاروباری جاف لە هەڵەبجەدا، لە ناوەڕاستی مارتدا گەیشتە ناوچەی کفری و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك خۆی خەریك کرد. لەو ماوەیەدا یارمەتیی مانگانەی بەسەرۆك تیرەکانی جاف، لەوانەی کە نەیانویستبوو لە شێخ مەحموودی وەربگرن و ئەم بڕە پارەیەشی لە سەرجەمی کۆی یارمەتییەکەی شێخ مەحموود بڕی. بێگومان ئەم کارە لای جافەکان ئەوەی بەجێهێشت کەوا بەریتانیا هەڵوێستی گۆڕیوە لە بەرانبەر سەرۆکی کورددا و ئێستا سیاسەتێکی نوێ جێی گرتووەتەوە[٨٦]. لە مارتی ١٩١٩دا ناوچەکانی کەرکووك و کفری لە کۆنفیدراڵیەتی باشووری کورستانی شێخ مەحموود دابڕاو بەشێکی نوێیان پێکهێنا[٨٧]. قەزای هەڵەبجەش کە لەسەر سلێمانی بوو ئێستا خرایە ژێر ڕکێفی ڕاستەوخۆی بەریتانیا.

ئێستا ڕوون بووەوە کەوا شێخ بڕواو متمانەی بەریتانیای لەدەست داوەو بەو پێیە ئەو یارمەتیو پاڵپشتە ماددیو مەعنەوییەشی لەدەستدەدات کە بۆیان دابینکردبوو. ئەم پیاوەی کە ماوەیەك لەمەوپێش جاڕی سەرۆکی کوردستانی باشووری بۆ دراو هەموو کوردی دڵسۆز دایانە پاڵی، وا ئێستا بە ساختەچییەکی فێڵباز لە قەڵەم دەدرێت و دەبێ هەموو کەسی لێ بتەکێتەوە. ئەم پەرەسەندن و پێشهاتە بە قووڵی کاری کردە سەر کوردەکانی باشوور. ڕکابەرو ناحەزەکانی گومان و دوودڵییەکی زۆریان لە ڕۆڵی شێخ دەربڕی وەك سەرۆك و دەمڕاستی باشووری کوردستان و قۆرخکردنی دەسەڵاتی ئەویان بەناچاری قبووڵ کرد. ئەم کەسانە ئێستا خۆشحاڵن بەوەی کەوا گلۆڵەی شێخ کەوتووەتە لێژی وەك پاکانەیەك بۆ هەڵوێستی ناچاریی پێشوویان لە ئاستیدا. بە هەرحاڵ، لە چاوی موریدو شوێنکەوتووانییەوە و ئەو ژمارە زۆرەی

---

[٨٥] عێراق، "ئیدارەی بەریتانی" ئۆفیسی کۆمیسیۆنی مەدەنی، ڕاپۆرتی ئیداریی لەسەر کەرتی سلێمانی ١٩١٩.

[٨٦] ڵی، "دووساڵ لە کوردستانی باشووردا"، ١٩١٩، ل١٠٢،٤.

[٨٧] عێراق، (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

خزمەکانیەوە کەوا شێخ پیاوێکی زوڵم لێکراوەو ئێستا لە هەموو کات زیاتر شیاوی بەزەیی‌و دڵسۆزییە.

قرتاندنی دەسەڵاتی شێخ بە ئاشکرا جێبەجێ کرابێ هیچ ڕووداوێکی بەرهەڵستکاری. ئەو واقیعەی کەوا دوژمنانی بەخۆشییەوە لێیان دەڕوانی‌و شێخ و دەستەو تاقمیشی لێی بێدەنگ بوون بەرهەڵستییان نەکرد، وای لە سۆن کرد کە ڕاپۆرتێکی پێشوەخت بدات لەسەر کاریگەریی ئەم حاڵەتە لە سلێمانی‌و دێهاتی دەوروبەری. بەپێی قسەی ئەو کاریگەریی شێخ مەحموود بە خێرایی وادابەزیوەو لە بەرقەراربوونی یاساو نیزامدا خەڵکی شارو عەشایرەکان بارودۆخی نوێیان پێ باشەو پێشوازی لێدەکەن[88].

بۆ بەدبەختی، ئارامی بارودۆخەکە ساختە بوو وە گەشبینیەکە لەجێی خۆیدا نەبوو. شێخ چەند بە تاڵی کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکەی وەرگرت و چەند بە توندی لێیان دێتە دەست هەر زوو دەرکەوت. لە ڕاستیدا نەدەکراو ڕێی تێنەدەچوو کە چاوڕێی پیاوێك بکەیت لە سروشت و کەسایەتی شێخ مەحموودا بێت هەروا بە ئاسانی لێگەڕێ دەسەڵاتی لە دەست بدات و بێدەنگی لێ بکات و ئابڕووی بچێت بێ ئەوەی خەبات و ململانێ بکات. لە ڕاپۆرتێکی ڕەسمیدا کە ساڵێك پاش ئەو ڕووداوانە نووسرابوو. سۆن بە توندی کارو ڕەفتاری شێخ تۆمەتبار دەکات لەو کاتەدا. بەگوێرەی قسەکانی ئەم شێخ کۆسپی بۆ بەڕێوەبردنی ڕێکوڕاست دروست دەکردو بە هەموو شێوەیەکی خراپ هەوڵی سووککردنی حکومەتی بەریتانیاو کاربەدەستانی دەداو تاقمێك شەڕخوازو داخ لە دڵی لەدەوری خۆی کۆکردبۆوەو کەوتە پلاندانان بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لە حکوومەتی بەریتانیا بکاتەوە[89]. ئا بەم ڕق و تووڕەییەوە بوو کە بەریتانیا بەرەنگاری دەسەڵاتی بووەوە.

---

[88] بێل: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤؛ ویلسن: هەمان سەرچاوە، ل١٣٤-١٣٥.

[89] هەمان سەرچاوەی ڕاپۆرتی کۆمیسیۆنی مەدەنی لەسەر سلێمانی.

## یاخیبوون و بەزینی شێخ مەحموود:

### گرتنی سلێمانی لەلایەن هێزەکانی شێخەوە:

لـە کاتێکـدا کـە بەریتانیـەکان بـە جیـددی بیریـان لـەوە دەکـردەوە بگەنـە رێککـەوتنێك لەگـەڵ شـێخ مـەحمووددا[90]، کەچـی ئـەو کوتـوپڕ کەوتـە هێـرش و پـەلاماردانێکی نائومێدانـە بـۆ گێڕانـەوەی شـکۆ و دەسـەڵاتەکەی[91]. هێزێکـی خێڵەکی کە بەزۆری لە هۆزەکانی هەورامیو مەریوانی لەو دیوی سنوورەوە لـە ئێران پێکهاتبوو بەسەرکردایەتی مەحموود خانی دزڵی[92]، بەڵام لەژێر فەرمانی شـێخ مـەحموودا، لەبـەیانی زووی ٢٣ مایـسی ١٩١٩ هاتـە قـەراخ سـلێمانیو بێگرفتێکـــی ئـــەوتۆ تـــوانی ئـــەو هێـــزەی لێڤـــی بـــشکێنێت کـــە بـــۆ بەرەنگاربوونـــەوەیان نێردرابـوو. شـوێنکەوتووانی تـری شـێخ مـەحموود لـە سـلێمانیو ناوچـەکانی دەوروبـەری دایانـە پـاڵ ئـەم هێـزەو شـاریان گـرت. مێجـەرگرینهاوس F.S.Greenhouse، کـە لـەجێی مێجەرسـۆن بـەرپرس بـوو، لەگەڵ ژمارەیەك ئەفسەری تری بەریتانیدا بەدیل گیران[93].

---

[90] به پێی ویلسن، ئەو ئاگاداریی داوە له بارەی بارودۆخی ناسکەوە له سلێمانی و وای نیاز بووە بچێتە ئەوێ بە مەبەستی ڕاوێژکردن لەگەڵ شێخ مەحموودا بەڵام شۆڕش و یاخیبوونەکە ڕێگەی ئەو کارەیان نەدا. ویلسن دەنووسێت "من کاری ئەوەم ڕێکخست بە فڕۆکە بچمە ئەوێ، لە دەوروبەری ئاخرئۆخری مایسدا بە مەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵ شێخ مەحموودا بە شەخسی وەك هەوڵدانێك بۆ ئەوەی بگەینە چارەسەرێك بە مەبەستی گەڵاڵەکردنی چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیی کورد.

[91] شتێکی سەیرە کەوا ژمارەیەك سەرچاوەی بەریتانی(بە تایبەتی E.J.R ، ل١٦؛ درایڤەر "کوردستان و کورد ل٩٠"؛ بێل: پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی، ل٦٦) لە بارەی شۆڕش یان یاخیبوونەکەوە بەم جۆرە دەست پێدەکەن "بەرپابوونی کوتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو بوو". لیLess بە وردییەکی زیاترەوە دەڵێ: "بارودۆخی سیاسـی ئەگـەری زۆری لـەخۆگرتبوو، ئایـا لـەم هـەوڵ و تەقەلایەمانـدا دەتـوانین وردە وردە بـاڵی کەسـی دەستنیشان کراو ببڕین یان ئەو هەوڵی خۆی سەرپەخات بۆ باڵەفڕەیەکی سەربەخۆ پێش ئەوەی تەگبیر و پیلان ئێمە جێبەجێ بکرێت؟" لیLess: "دووساڵ لە باشووری کوردستاندا" ل٢٥٩.

[92] لە بارەی چالاکییەکانی مەحموود خانی دزڵی لەپێش پەلاماردانی سلێمانیدا بڕوانە: سەرچاوەی پێـشوو، ل٢٨٥-٢٨٩ کـە لـە درایڤـەر، "کوردسـتان و کـورد"، ل٩٠، E.J.R، ل١٦؛ بـێڵ: پێداچوونەوە...ل٦٤، ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٣٠ وەرگیراوە.

[93] E.J.R، ل١٦، درایڤـەر، "کوردسـتان و کـورد"، ل٩٠؛ بـێڵ، "پێداچـوونەوە..."ل٦٤؛ ئەی.تی.ویلسن: "دڵسۆزان"، ل١٣٦؛ ئیدمۆندز: "کورد و تورك و عەرەب"، ل٣٠.

شێخ مەحموود، وەك فەرمانڕەوای هەموو كوردستان جاڕی لەخۆیداو خەزێنەی گرت[٩٤] و ئالای خۆی هەڵكرد[٩٥] و كاربەدەستانی تایبەتی خۆی دامەزراند[٩٦]. خەتی تەلگراف بۆ كەركوك پچڕاو ڕێگەیان لە پەیامنێرانی گرینهاوس بڕیو پۆستەكانیان پێگرتن[٩٧]. یەكەم هەواڵی ئەم ڕووداوانەی سلێمانی لە ڕێگەی ل‌ییەوە Less كە یاریدەدری ئەفسەری سیاسی بوو لە هەڵەبجە گەیشتە جیهانی دەرەوە[٩٨]. ل Less لە هەڵەبجە هەڵاتبوو و لە خانەقین خۆی حەشاردابوو پاش ئەوەی هەوڵی گرتنی درابوو[٩٩]. هەر دوا بەدوای هەراو ڕاپەڕینەكەی پیاوەكانی شێخ كاروانێكی حكوومەتیان ڕووتكردەوە كە لە كفرییەوە بەرەو سلێمانی دەهات. دەسكەوتەكان، كە پارەو تفەنگ و ئەسپ بوون سامانێكی گرنگ بوو بۆ ئەو سەرچاوە كەمەی شێخ[١٠٠]. ڕاستێكەی ئەمە سەرەتایەكی مژدەبەخش بوو، بەڵام شێخ هەر زوو چەندین سەركەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنا.

---

[٩٤] بە پێی سەرچاوەیەك ئەو پارەیەی دەستی بەسەردا گیرابووە بڕەكەی دەگەیشتە دووسەد هەزار ڕۆپیی، كە ئەمە لەو دەمەی كوردستانی باشووردا پارەیەكی هێجگار زۆربوو. درایڤەر، "كوردستان و كورد"، ل٩٠.

[٩٥] بەپێی ئیدمۆندز، ئالاكەی بریتیبوو لە نیوە مانگێكی سوور "كەوانەی‌مانگ" لەسەر باكگراوندێكی سەوز. ئیدمۆندز: "كورد و تورك و عەرەب"، ل٣٠.

[٩٦] ویلسن باس لەوە دەكات كەوا شێخ "مودیر و خەڵكی شوێنكەوتووی خۆی دادەمەزراند بۆ ئەوەی كۆنترۆڵی هەموو ناوچەیەك بكەن"، ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٦. سەرچاوەی هاوچەرخی تر باس لە دانانی "قایمقامی سەربەخۆی" دەكەن، درایڤەر، "كوردستان و كورد" ل٩٠؛ E.J.R، ل١٦؛ بێل: پێداچوونەوە...،ل٦٤. بەپێی ئیدمۆندز لێرەدا مەبەست لە قائیمقام شێخ محەممەد غەریب بووە، كە هەم زاوای و هەم پیاوی دەستە ڕاستی بووە لە شۆڕشەكەدا و پاشتر لە دەربەندی بازیان گیراوەو لە دادگایەكی سەربازیدا لەگەڵ شێخدا حوكمدراوە. ئیدمۆندز: كورد و تورك و عەرەب ل١٠٢.

[٩٧] لLees، "دووساڵ لە كوردستاندا"، ل٢٥٩-٢٦٠، ئەی.تی. ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٦ لە درایڤەر "كوردستان و كورد"، ل٩٠ وەرگیراوە، E.J.R، ل١٦؛ بێل: پێداچوونەوە، ل٦٤؛ ئیدمۆندز: كورد و تورك و عەرەب، ل٣٠.

[٩٨] بۆ وردەكاریی زیاتر بڕوانە ل Lees، "دووساڵ لە كوردستاندا"، ل٢٦٠.

[٩٩] ل ئەو هەوڵانەی ئەوی لەو كاتەدا بە ئەزموونی گاڵتەجاڕ داناوە. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦٠-٢٦٤.

[١٠٠] E.J.R ل١٦؛ بێل: پێداچوونەوە، ل٦٥.

**بەزینی بەریتانیا لە ملەی تاسلووجە:**

بەریتانیەکان، پاش ئەوەی بە پێشهات و بارودۆخەکەیان زانی، بڕیاری ئیجرائاتی پێچەوانەیان وەرگرت و وەك هەنگاوێکی ڕێخۆشکەر ئەو ئەفسەرەی فەرماندەیی سەربازخانەی کەرکووکی دەکرد ڕاسپێردرا هێزێك بنێرێتە چەمچەماڵ لەسەر ڕێگای سەرەکیی کەرکووك –سلێمانی. هەر چەندە فەرمان و ڕاسپاردەکان ڕوون بوون کە نابێ لەو شوێنە بەولاوە بڕۆن. بەلام ئەفسەرە فەرماندەکە بایەخێکی بۆ کارامەیی شەرکردنی کوردەکان هەڵەت و سەختیی ناوچەکە دا نەنا و حیسابی بۆ فەرمانی سەرووی خۆی نەکردبوو. لەبەرئەوەی فەرمانی دەرکرد بۆ هێزێکی بچووك کە لە هێزی سوارەو لیڤیەو چەند ئۆتۆمبێلێکی زرێپۆش و ڕەشاشی لویسی سەر ئۆتۆمبێلی فۆرد پێکهاتبوو، تا دەربەندی تاسلووجە پێشڕەوی بکات کە دوانزە میل لە سلێمانییەوە دووربوو. هێزەکە دووچاری تێکشکان و پاشەکشە بووەوە و کورد تا دووریی بیست و پێنج میل ڕاویان ناو بە جاریێ شپرزەیان کرد. هێزەکە زیانێکی قورسی لێکەوت و چوار ئۆتۆمبێلی زرێپۆش و نۆزدە ئۆتۆمبێلی بارهەڵگری فۆردی لەدەستدا[١٠١].

سەرکەوتنی شێخ کاریگەرییەکی خێراو کارەبا ئاسای دروست کرد لە سەرتاپای کوردستانی باشووردا. ویلسن، لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە، ئەو بڕوایەی لای دانیشتووانی کوردستانی باشوور چەسپاند کەوا جارێکیتر ئێمە توانای کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکەمان نابێت. شۆڕش و یاخیبوون لە هەرێمەکانی ئێراندا بەرپابووەو گەلێ لە تیرەو هۆزەکان دژ بە حکوومەتی ئێران هەڵساون و بانگەشەی ئەوە دەکەن جەنگاوەر و پارتیزانی شێخ مەحموودن لە پێناوی کوردستانێکی سەرفراز و یەکگرتوودا"[١٠٢].

---

[١٠١] ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٦–١٣٧؛ ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٣١.

[١٠٢] ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٧.

**بەزینی شێخ مەحموود لە دەربەندی بازیان؛**

بەریتانیەکان تەواو دەرکیان بەمەترسیی دۆخەکە کردبوو. وا ئێستا هەموو باشووری کوردستان زانیویێتی کەوا شێخ بەریتانیەکانی لەسلێمانیدا بەزاندووەو لە دەربەندی تاسلووجەشدا بەسەریاندا زاڵ بووەو ڕاوی ناون. ئەوان لەوە تێگەیشتن کەوا مانەوەیان لەبەشێکی بایەخداری ناوچە داگیرکراوەکاندا بە جیددیی هەڕەشەی لەسەرەو هەستیان کرد کەوا ئەگەر ئیجرائاتی کاریگەرو بەپەلە نەکەن بۆ لە کۆڵکردنەوەی شێخ ڕەنگە سەرکەوتن بەدەست بێنێ لە ڕاپەڕینی تەواوی وڵاتەکە لە دژیان. ویڵسن لێرەدا درێژە بە قسەکانی پێشووی دەدا و دەڵێ " فەرماندەی گشتی لەوە گەیشتووە کە دەبێ بەخێرایی ئەم هەستە لای بەریتانیەکان بڕەوێتەوە"[102]. ئەرکی پێکهێنان و فەرماندەیی هێزێکی لووتشکێن دژ بە شێخ مەحموود بە مێجەر جەنەراڵ سێر تیۆدۆر فەرەیزەر سپێردرا، کە فەرماندەی تیپی هەژدە لە مووسڵ. ئەو هێزە لە کەرکووك کەوتە خۆئامادەکردن و بریتی بوو لە دوو لیوای پیادە بە پاڵپشتی هێزی سوارەو زرێپۆش و یەکەی هێزی ئاسمانی. ڕەتلێکی تریش دەبوو لە خانەقینەوە پێشڕەوی بکات بۆ سلێمانی[104].

هێزەکەی جەنەراڵ فرەیزەر لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩١٩دا گەیشتە چەمچەماڵ و لە ١٧ی ئەو مانگەدا تەواوی هێزەکە پێشڕەوی کرد بۆ گوندی تەکیەی کاك ئەحمەد، کە نزیکەی سێ میلێك لە دەربەندی بازیانەوە دووربوو[105]. لە بەرەبەیانی ١٨ی حوزەیراندا هێزەکانی پیادە بە بەرزاییە

---

[102] هەمان سەرچاوە: وا دیارە بەریتانیەکان گەیشتوونەتەئەو قەناعەتەی کە تاقە ڕێگا بۆ ئەنجامدانی ئەم کۆتاییە تێکشاندنی تەواوی هێز و توانای شێخ مەحموودە. سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوی بەریتانی ڕاستیەکی سەرنجڕاکێش دەردەخات کەوا ئینگلیزەکان خوازیاری دانووستان نەبوون لەگەڵ شێخدا هەرچەندە ئەو دەیویست ئەو کارەیان لەگەڵ بکات. بە پێی بێڵ "لە ١١ی حوزێراندا و سەریاری ئەوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە بەرەنگاربوونەوەی هێزێکی ئیستیتلاعی بەریتانیدا، کەچی ئەو ئامادەی گفتوگۆ بوو بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو". بێڵ: پێداچوونەوە.... ل٦٥.

[104] ویڵسن: دڵسۆزان، ل١٢٧؛ هەروەها ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٣١.

[105] هەمان سەرچاوە.

تووشەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دەربەندەکەی بازیاندا هەڵکشان و هێزەکانی تریش دەربەندەکەیان بە چەکی قورس کوتا[١٠٦]. هەر کە هێزەکانی شێخ هێرشیان هێنا بۆ بەرگری کردن لە دەربەندەکە دژ بەهێزە سەرەکییەکەی ئینگلیز کە شەپۆل دەڕژانە دەربەندە تەنگەکەوە، و کاتێ بەخۆیان زانی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دراون. ئەو هێزانەی زووتر بە ڕووی ڕۆژاوای شاخەکەدا هەڵگەڕابوون و ئێستا بە ڕووکاری ئەمدیودا بەرەوخوار دەبنەوە. زۆری نەخایاند هێزەکانی شێخ لە هەر چوارلاوە ئابلووقەدران و تێکشکان و شێخ بە تەواوەتی شکستی خواردو بەزی و چلوهەشت کەس لە پیاوەکانی کوژران و زیاد لە سەد کەسیان بە دیل گیران و ئەوانی تریشیان پەرتو بڵاوبوونەوەو هەڵاتن[١٠٧].

بەم ڕەنگە لە حوزێرانی ١٩١٩دا شەڕی دەربەندی بازیان کۆتایی هات، کە یەکێك بوو لە چەندین شەڕ لەم شوێنە ستراتیجییەدا[١٠٨]. بەم جۆرە لە مێژووی

---

[١٠٦] لە لای ڕۆژئاواوە و لەو شتاییەوە کە لەبەر دەمی دەربەندی بازیاندایە کە تەماشا دەکەیت زنجیرە چیای قەرەداخ بە شێوەی دیوارێکی ستوونی و زۆر زەبەلاح ڕاوەستاوە و ڕێگەی لە هەموو شتێك داخستووە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە. نەبوونی لاپاڵ زۆری قەبەو زل کردووە و کردویەتیە بەربەست. هەردوو شانی دەربەندەکە بە شێوەی پیتی٧ ئینگلیزییەو ڕێك ڕاست بووەتەوە بە بەرزیی هەزاروحەوتسەد پێ لە بنی دەربەندەکەوە. ئیدمۆندز: کورد، تورك، عەرەب ل٤٥ و ویڵسن: دڵسۆزان ل١٣٧–١٥٨.

[١٠٧] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ویڵسن: دڵسۆزان ل١٣٨، ئیدمۆندز: کورد، تورك، عەرەبل٤٦.

[١٠٨] دەربەندی بازیان، دەروازەیەکی بنەڕەتییەو ناوچە شاخارییەکانی ڕۆژهەڵاتی قەرەداخ بە دەشتی میزۆپۆتامیا و دنیای دەرەوە دەبەستێ، بە درێژایی چەرخە جۆراو جۆرەکان بایەخێکی بازرگانی و ستراتیجی گەورەی هەبووە. لێرەدا هەمیشە هەمەوەند بۆسەیان بۆ کاروان و هێزەکانی عوسمانی دادەنا کە دنێردرایە سەریان. سۆن " گەشتێك بۆ میزۆپۆتامیا و کوردستان" ل٣٢٨–٣٢٩ لە ساڵی ١٨٠٥دا و نزیکەی سەدەیەك پێش شۆڕشی شێخ مەحموود، ئەم دەربەندە شانۆی شەڕوشۆڕێکی هاوشێوەبوو لە نێوان شازادەی گەورەی کورد "عبدالرحمان پاشای بابان" و پاشای بەغدا دا. چونکە پاش نێوان تێکچوونی لەگەڵ عوسمانیدا ئەم دەربەندە تەنگەی بە دیوارێکی بەرد هەڵچنی و چەند تۆپێکی لەسەر دامەزراند. هەرچەندە پلانەکەی یەکمجار سەرکەوتووبوو، بەڵام دواتر شکستی هێنا چونکە مەحموود بەگی کوڕی خالید پاشای بابان کە ئامۆزای عبدالرحمان پاشاو ڕکابەری بوو،لە تووڵە ڕێیەکی پشتەوە کەوتە پێش سوپای عوسمانی و بەم جۆرە سەرداری کورد هیچ چارێکی نەما

ئیمپراتوریتی بەریتانیادا ڕووداویکی وا کە شۆرشی شیخ مەحموورە بەرپابوو و ڕیوشوینیکی بایەخداری وەرگرت لە میژووی نەتەوەی کورددا. ڕاستیکەی ڕەنگە ئەمە هەندێ کاریگەریی بەجیهیشتبیت لەسەر ڕەفتاری هۆزەکانی دەلۆ و زەنگەنەو داودە و خیلە کوردەکانی تری باشووری کەرکووك، کەسالیك دواترو لە دەمی یاخیبوونە چەکدارییە ترسناکەکەی ناوچە عەرەبی زمانەکانی میزوپۆتامیادا دژ بە دەسەلأتەکانی داگیرکەر ڕاپەرین و تەقینەوە[109].

لەپاش تەواوبوونی شەڕی دەربەندی بازیان، ئینگلیزەکان چەند سەعاتیك بە دلەراوکیوە بە دوای شیخ مەحموودا دەگەڕان کە دواتر بە برینداربیەکی سەختەوە

---

لە پاشەکشە بەرلاوە. ئەوجا پاشای بەغدا ئەم دیوارەی تەخت کرد پێش ئەوەی پێشڕەوی بکات بۆ سلێمانی، (ریچ ل٥٩). "المنشي البغدادي" کە وەك ئەمیندار یاوەری ڕیچی کردووە لە سەفەرەکەیدا بۆ کوردستان، باسوخواسی دەگێڕێتەوە بەلأم بە کورتی. بڕوانە (سید محمد إبن السید احمد الحسیني المنشي البغدادي: رحلة المنشي البغدادي"واتە مونشیی بەغدادی" کە لە لایەن عباس العزاوییەوە لە فارسییەوە کراوەتە عەرەبی ، بەغدا- ١٩٤٨ ل٥٨). دەربەندی بازیان لە نەخش و نووسینە میخییەکاندا بە دەربەندی بابیت ناوی هاتووە. ئەفرایم ئەفیگدۆر سپایسەر "باشووری کوردستان لە سالنامەکانی ئاشوورناسرپال و ئەم ڕۆژگارەدا" (سالنامەی قوتابخانەی ئەمریکی بۆ لێکۆلینەوەی ڕۆژهەلأتناسی) ئۆرشەلیم ١٩٢٦-١٩٢٧ هەروەها سی.جەی. ئیدمۆندز "ناوی شوێنەکان لە قەوالەکانی هەورامانـدا" "بلأوکراوەی قوتابخانەی ڕۆژهەلأتناسی و توێژینەوەی ئەفریقی" ژمارە (٣) ١٩٥٢،ل٤٧٨-٤٨٢. دەربەندی بابیت بە ڕوونی لە سالنامەکانی ئەو سێ هێرشەدا دەردەکەوێت کەوا ئاشوورناسرپالی سێیەم (١٠٤٧-١٠٢٧پ.ن) ئەنجامیدا لە دژی خەلکی زاموا، کە ولأتەکەیان پارێزگاری ئەمڕۆی سلێمانی دەگرێتەوە لە عێراقدا. شتێکی سەرنجڕاکێشە کەوا هۆکاری شەڕوشۆڕشەکانی ئاشوورناسرپال دژ بە خەلکی زاموا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەل هۆکاری ئەوەی کە سوپای عوسمانی لەسەری هێرشی کردە سەر عبدالرحمان پاشای بابان لە سالی ١٨٠٥دا و سوپای بەریتانیا هێرشی کردە سەر شێخ مەحموود لە سالی ١٩١٩دا. بە پێی سپایزەر سالنامەکان جەنگەکان دەگێڕنەوە بۆ نور- ئەدەدی شازادەی داگارا، بۆ ئەوەی هەر بە ملکەچی ولأتی ئاشوور بمێنێتەوە. کاتێ ئاشوور دەستی دایە شۆڕش هەموو خەلکی زاموا چوونە پالی. کاتێ پاشای ئاشوور هێرشی کردە سەر میللەتی زاموا تەماشای کرد "دەربەندی بابیت قایم کراوە و بە دیوارێك داخراوە". لە ئەنجامی شەڕی دەربەندەکەدا ١٤٦٠ پیاو لە یاخییەکان تێداچوون. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە سپایزەر " باشووری کوردستان ل١٥".

[109] لە بارەی وردەکاریی چالاکیی ئەم هۆزانە بڕوانە: عێراق "ئیدارەی بەریتانی"، ئۆفیسی کۆمسیۆنی مەدەنی "ڕاپۆرتی ئیداریی کەرتی کەرکووك بۆ سالی ١٩٢٠"، بەغدا- ١٩٢١، ل٦-١٢.

دۆزییانەوە. بەپێی گێڕانەوەی ئەدمۆندس کە وەك ئەفسەرێکی سیاسی هاوڕێیەتی هێزەکەی فرەیزەری کردبوو "مەسەلەیە زۆر گرنگ بوو کەوا دەبێ نەبمرێ، پێش ئەوەی لەلایەن کەسایەتییەکی کوردەوە دەستنیشان بکرێت و نەمەڵبێت و هەر دیارنەمانێکی ئەفسانە و موعجیزە ئامێز دواتر کێشەو گرفتی لەڕادەبەدەری بۆ دروست دەکردین"[110].

مەسەلەیێکیتر کە لەم کاتەدا خولیای بەریتانیەکان بوو ئەویش چارەنووسی ئەفسەرە دیلەکان بوو لە سلێمانی[111]. هەرچەندە ئەوە زانرابوو کەوا زیانیان پێنەگەیشتووە، بەڵام ترسی هەبوو کەوا بکوژرێن پاش ئەوەی هەواڵی بەزینی شێخ لە سلێمانیدا ئاشکرا بوو[112]. بەم پێیە فەرمان درا بە هێزێکی سوارەی بچووك دەستبەجێ بڕۆن بۆ سلێمانی.هێزەکە ئەرکی خۆی بە سەرکەوتوویی بەجێهێنا و گەیشتە سلێمانی پێش ئەوەی دەنگوباسی کارەساتەکەی بازیان بگاتە ناوخەڵکی شار. پاشان دیلەکان ئازادکران و شاریش داگیرکرایەوە[113].

## تاوانبارکردن و حوکمدانی شێخ مەحموود:

برینەکەی شێخ مەحموود زوو چاکبووەوە و درا بە دادگایەکی سەربازیەو تاوانبارکراو حوکمی سێدارەی بۆ دەرچوو. بەڵام فەرماندەی گشتی بەریتانی

---

[110] ئیدمۆندز: کورد، تورك، عەرەب، ل ٤٩.

[111] حەفسەخان، ئامۆزای شێخ مەحموود و ژن خوشکی وا باسدەکرێت کە پارێزگاریی لە ئەفسەرەکان کردووە لە ماوەی بەندکردنیاندا.بە پێی ئیدمۆندز، شێخ قادری مێردی حەفسەخان، کەوا ئەفسەری فەرماندەی لیڤی بووە، مێجەر ئەی.ئێم. دانیاڵی مەشقدەری بەریتانیی لیڤییەکانی بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ بردووەتە ماڵی خۆی و لەو ماوەیەدا کە لەوێ بووە حەپسەخان لە ڕاڕەوی بەردەمی ژوورەکەی ئەمدا خەوتووە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە هیچ زیانێکی پێنەگات. سەرچاوەی پێشوو ل٨٢.

[112] ئیدمۆندز باس لەوە دەکات گوایە لە پاش شەڕی بازیان لە دوو ئەفسەری لیڤییەوە بیستوویەتی کەوا شێخ مەحموود ڕایسپاردووە ئەگەر ڕۆژگار لە دژی ئەم وەرگەڕا ئەوە دیلەکان بکوژن. ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٤٧.

[113] لە بارەی ئازادکردنی دیلەکانی ئینگلیزەوە بڕوانە:ل Lees، "دوو ساڵ لە باشووری کوردستاندا"، ل٢٦٤-٢٦٥؛ ئەی.تی.ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٨؛ ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٤٧.

سێر جۆرج ماكمون Sir George MacMunn حوكمەكەی بۆ گۆڕی بە بەندكردنی هەتاهەتایی. پاشان جارێكیتر بەر بەزەیی كەوت و ئەم حوكمەش گۆڕا بە دووخستنەوەی بۆ هندستان لەساڵی ١٩٢١دا[١١٤]. ویلسن، لە ساڵی ١٩٣٦دا دەنووسێت كەوا هەرچەندە لەو كاتەدا لەو هۆیانە تێدەگەیشت كە پاڵی ناوە بە فەرماندەی گشتییەوە ئەم هەڵوێستی بەزەییە وەربگرێت، بەڵام ئەم "واتە ویلسن" لەسەر بنەمایەكی پراكتیكی بەرهەڵستی ئەو بڕیارەی كردووە. ئەم لەوە ترساوە كە هەتا شێخ مەحموود لە ژیاندا بێت هیچ هیوایەكی ڕاستەقینە بەهێمنیو ئارامی نابێت لە ناوچەی سلێمانیدا[١١٥]. چەند ساڵێك دواتر سێر جۆرج ماكمون ئەو بارو زرووفی سووككردنی سزاو بەزەییە بەم جۆرە لێكدەداتەوە: "شێخ مەحموود وەك دیلێك لە دەربەندی بازیانەوە هێنرا. من دامە دادگاو حوكمی سێدارەدانی بۆ دەرچوو. من دەمزانی ئەم كابرایە زۆڵ و شەیتانەو خەڵك دەیانویست هەڵیواسم، بەڵام من وای بۆ دەچووم كەوا كردەوەیەكی ئاوها ڕەوا نییە. بەگشتی دواكەوتنی سەقامگیركردنی پاشەڕۆژی عێراق هێندە كارێكی گەورە بوو كە هەموو كەسی تووشی چەواشەو سەرگێژە دەكرد. شێخ مەحموود قەرزاری دڵسۆزیی كاتی نەبوو بۆ بەریتانیا. كاتێ كە كوودەتاكەی ئەنجامدا ئەو چوارپێنج ئەفسەرە ئینگلیزەی نەكوشت كەوا كەوتبوونە دەستیو من وای بۆ دەچووم كەوا كوشتنی گەمەیەكی عادیلانەی بەریتانیا نەبوو"[١١٦].

---

[١١٤] ئەی.تی. ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٨-١٣٩. بەپێی بێڵ سزای شێخ دە ساڵ حوكم بووە و شێخ محەممەد غەریبی زاواشی پێنج ساڵ و دە هەزار ڕۆپی جەزا بووە. بێڵ: پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی ل٦٥. بە پێی لی شێخ بیست ساڵ بە كاری قورس و بە دورخستنەوە بۆ هندستان حوكم دراوەو دەستەو تاقمەكەشی سزای لەوە كەمتر دراون. لی، "دوو ساڵ لە كوردستان"ل٢٦٥. بە پێی ئیدمۆندز حكومەكەی شێخ بۆ دە ساڵ بەندكردن كەمكراوەتەوە و پاشان نێردراوە بۆ هندستان. ئیدمۆندز: كورد و تورك و عەرەب ل٥٢.

[١١٥] بە پێی ئەی.تی. ویلسن شێخ مامەڵەی نەرمی لەگەڵ كراوە چونكە خراپەی دەرهەق دیلە ئینگلیزەكان نەنواندووە و لە سەرێكی تریشەوە سیاسەتی حكومەتی بەریتانی لە ویلایەتی موسڵی ئاڵۆزدا دۆزینەوەی بیانوو نەبوو بۆ ئیعدام كردنی ئەم سەركردەیەی شۆڕش. ئەی.تی.ویلسن: دڵسۆزان، ل١٣٩.

[١١٦] ئەم بەیانە لە لایەن لیوتینانت- جەنراڵ سێرجۆرج ماكمونەوە لە ١٤ی مارتی ١٩٢٨ دا دەركرا، لە دەرئەنجامی موحازەرەیەك لەلایەن جی.ئێم.لیەوە درا لە كۆمەڵەی ئاسیای سێنتراڵ. لی: "دوو ساڵ لە كوردستان"، ل٢٢٧.

ئیجرائاتەکان، وەك ڕووداوە یەك لە دوای یەکەکاندا سەلماندیان، شکستیان هێنا لە بەدیهێنانی هەر ئەنجامێکی جێگیردا. سەرەڕای ئیشارەتی تایبەتی چاکبوونێکی ڕووکەش، دۆخەکە هەر بە مولەقی مایەوە وەك پێشتر. تەنانەت دوو ساڵیش دوای ئەم ڕووداوانە، ئارامی کە ئامانجی سەرەکیی ئینگلیز بوو لە باشووری کوردستاندا، پێ دەچوو هەر لە ئارادا نەبێت. بەریتانیەکان، بە نائومێدییەکی ئاشکرا، پەنایان دەبردە بەرچارەسەری چاوەڕوان نەکراو. ئەوان شێخ مەحموودیان بەخشی‌و هێنایانەوە بۆ سلێمانی و جارێکی‌تر کردیانەوە بە حوکمدار، بۆ ئەوەی چەند مانگێك دواتر خەبات و ململانێکە دەست پێ بکاتەوە. چیرۆکی ئەم تاقیکردنەوە بێهوودەیە لە بەشی یازدەی ئەم باسەدا دێت. لەهەمان کاتدا پێویستە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕشی یەکەمجاری شێخ هەڵسەنگێندرێن، کەوا گەیاندیانە ئەو نوشوستی‌و بەزینە لە دەربەندی بازیان.

## هۆکارەکانی شکستهێنانی شۆڕشەکانی شێخ:

ڕێکخستنی لاوازو سەرچاوەو دەرامەتی ناتەواو ڕەنگە بەرپرسی سەرەکیی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکە بووبێتن. بەپێی سەرچاوەیەك نامەو نووسراوی دەست بەسەراگیراو ژمارەیەك هۆکارو ڕاستیی بایەخی تایبەتی سەربازی ڕوون دەکاتەوە. یەکەم، تەواوی هێزەکەی شێخ لە تاقە یەك بەتالیۆن پێکهاتبوو بە چوار لقەوە، لەهەمان کاتدا توانای جموجۆڵی ئەم هێزە سنووردار بوو بەهۆی نەبوونی هێزێکی سوارەی تۆکمەوە[117]. دووەم،

---

[117] درایڤەر، "کوردستان و کورد"، ل٩٢. ڕەنگە ئەم خاڵە پێویستی بە هەندێ ڕوونکردنەوە بێت. ئەم سەرچاوەیە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کەوا شێخ مەحموود هێزێکی سوارەی مەشقدراوی شیاوی نەبوو و بەم پێیەش جەنگاوەری سوارەی قاڵبووی شك نەدەبرد. ئیدمۆندز باس لەوە دەکات کە لە پێش پەلامارداني دەربەندی بازیاندا لە لایەن ئینگلیزەوە نزیکەی دووسەد ئەسپ سوار بینرابوون چاودێرییان دەکرد. ئیدمۆندز: کوردو تورك و عەرەب ل٤٦. درایڤەر باس لەوە دەکات کە ئەسپ لەنێو ئەو دەسکەوتانەدا بوو کە لەپاش شەڕەکە لە لایەن بەریتانیەکانەوە بەدەستهاتن. درایڤەر: "مەسەلەی کورد"، ل١١٣.

بەماوەیەکی کەم پاش هەڵگیرسانی شۆڕشەکە، شێخ مەحموود نەیتوانی پارەی مووچەی هێزی لێڤی دابین بکات و ناڕەزاییەکی بەرچاوی هێنایە ئاراوە و خۆدزینەوەیەکی زۆری لێکەوتەوە لە خزمەتی سەربازی[118]. سێهەم، کەمی چەك و فیشەك کێشەیەکی جیددی و گەورەبوو، وەك لە فەرمانێکی دەست بەسەردا گیراودا دەردەکەوێت سەبارەت بە قەدەغەکردنی سەرفکردنی تەنانەت تاقە یەك فیشەکیش بێ ڕەزامەندیی پێشتر و بەپێچەوانەوە ئەو کەسە سزای توندو سەخت بدرێت. بە پێی ئەم فەرمانە، هەموو جۆرە تەقەکردنێك بە توندی قەدەغەیە تاوەکو ڕەشاشەکان دەستڕێژ نەکەن[119]. خاڵی چوارەمیش لە سەرچاوەی پێشوودا باسیی لێوە نەکراوە بەڵام بە زمنیی ئاماژەی پێکراوە، مەسەلەی ورە بوو[120]، ئەگەرچی شێخ و ژمارەیەك لە شوێنکەوتووانی بە ئازایەتی و ورەیەکی بەرزەوە شەڕیان دەکرد، بەڵام جێی گومانە تەواوی هێزەکەی لە هەمان ڕوحییەتدا بووبێتن. ڕاستێکەی ئەو لێڤییانەی کە بەرێکی مووچەیان نەدەدرایەو لەسەر دەستی بەریتانیەکاندا مەشقیان کردبوو، وەك باس‌دەکرا لەشەڕەکەدا تفەنگەکانیان خستبووە لاوە و تەقەیان نەکردبوو بۆ ئەوەی هەرکاتێك گیران و تفەنگەکانیان پشکێنرا بیسەلمێنن کەوا شەڕیان نەکردووەو تەقە لە تفەنگەکانیانەوە نەکراوە.[121]

هێزو پێکهاتەی چەکدارەکانی شێخ مەحموود متمانەیەکی بەجێیان دەگەیاندو بەڵگەی تواناو میللەت پەروەریی ئەویان دەنواند لەو دەمەی شۆڕشەکەدا. بێجگە لە موریدو شوێنکەوتووانی لەناو سلێمانی و دەوروبەریدا[122] خزمە زۆرەکانی لە بنەماڵەی بەرزنجەو دۆست و شناسیان[123]،

---

[118] درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٢، لە بێڵ: پێداچوونەوەل٦٥ وەرگیراوە.

[119] هەمان سەرچاوە، ل٩٢.

[120] ئیدمۆنز: کورد و تورك و عەرەب، ل٤٦.

[121] درایڤەر: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

[122] قەبارەی شوێنەکەوتووانی شێخ مەحموود لە ناوچەی سلێمانیدا پێدەچێت مسکێنی گوندەکانی خۆی بووبێت لەو ناوەدا. ل: دووساڵ لە کوردستاندا"، ل٢٥٤، هەروەها بارث، ل١٢٧.

ژمارەیەکی زۆری خەڵکی تیرە و هۆزوکانیشی لەگەڵ بوو[١٢٤]، لەوانە هەورامانی بە سەرکردایەتی مەحموود خانی دزڵی[١٢٥]، مەریوانی[١٢٦] بەسەرکردایەتی مەحموود خانی کانیسانان[١٢٧]، هەمەوەند بەسەرکردایەتی کەریمی فەتاح

---

[١٢٣] درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٠، ل Lees" دووساڵ لە باشووری کوردستاندا" ل٢٧٣-٢٧٥، ئەی.تی. ویلسن: دلسۆزان، ل١٣٥، ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٣٠ و شوێنانی تردا.

[١٢٤] سەرچاوەی جۆراوجۆر ژمارەی جیاوازی هۆزەکانی هەورامانی و مەریوانی باسی دەکەن، ئەوانەی کە چوونە پاڵ شۆڕشەکەی شێخ مەحموود. ڕاپۆرتێکی ڕەسمیی (درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٠) باس لە ژمارەی (١٥٠١٠٠) سەربازی پیادە و (٥٠)سوارە دەکات تەنها لە لایەن هەورامییەکانەوە ل: "دووساڵ لە کوردستان ل٢٥٩" ژمارەکە بە (٥٠٠)دەدات و ویلسن: دلسۆزان ل١٣٦ تێکڕا ژمارەی جەنگاوەران لەودیو سنووری ئێرانەوە بە ٢٠٠ لەقەڵەم دەدات.

[١٢٥] مەحموود خانی دزلی، سەرۆکی بنەماڵەی بەهرام بەگی لە هەوراماندا، بوو بە نووکی نێزەی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود بە گرتنی سلێمانی. بەینێك لەوەوپاش لە سنەی کوردستانی ئێران گیرا بەهۆی بۆتێچاندنی ئەفسەرێکی ئینگلیزەوە. هەردوك ئەو و مەحموود خانی کانیسانانی هاوەڵی تەسلیمی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا کران لە میزۆپۆتامیا. مەحموود خانی دزلی دوورخرایەوە بۆ هندستان، بەڵام چەند مانگێك دواتر ڕێگە درا بگەڕێتەوە وڵاتەکەی. وەك باس دەکرێت لەپاش گەڕانەوە چالاکانە کەوتە کارکردن لە دژی ئینگلیزەکان. ل: "دووساڵ لە باشووری کوردستاندا" ل٢٥٨-٢٥٩، ٢٦٥. هەروەها بڕوانە ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل١٢٢،١٨٠ سەرچاوەیەکی ڕەسمیی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە کوردەکانی ئێران لەپاش گرتنی سلێمانی خێرا گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، بەڵام ئەمە بەتەواوی ڕاست نیە چونکە هەردوولا هەورامانی و مەریوانییەکان بەردەوام بوون لەسەر بێزارکردنی بەریتانییەکان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژی دواتر لە ناوچە شاخاوییەکانی خۆیانەوە کە دەڕوانێتە سەر دەشتی شارەزووردا. E.J.R، ل١٦.

[١٢٦] سەرچاوەیەك لە بایەخی ڕۆڵی مەریوانییەکان کەمدەکاتەوە و وا باسی دەکات کە هەڵوێستیان لەگەڵ شێخدا یەکلا نەبوو بە درێژایی ماوەی شۆڕشەکە. درایڤەر: کوردستان و کورد، ل.٩٠

[١٢٧] پاش ئەوەی حکومەتی ئێران مەحموود خانی کانیسانانی تەسلیم بە ئینگلیزەکان کرد. پاشان لە تەموزی ١٩٢٠ دا بەردرا و ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە ماڵی خۆی لە ناوچەی مەریوان لە ئێران. وا دیارە گەڕانەوەی ئەم، ئەرفەعول مولکی حاکمی مەریوانی هێندە ترساند کە ناچاریکرد هەڵبێت بۆ سنە. حکومەتی ئێران دواتر فەرمانڕەوایی مەریوانی دا بە سەرۆکێکی خەڵکی ناوچەکە بەناوی کەیخەسرەو خان، کە دواتر گلۆڵەی کەوتە لێژی. بۆ ماوەیەك، هەردوو سەرۆك هۆز، مەحموودخانی کانیسانان و کەیخەسرەو خان پێکەوە حوکمی ناوچەکەیان دەکرد، بەڵام فرەی نەخایاند بوو بە ناکۆکی و ململانێیان. عێراق (ئیدارەی بەریتانی) ئۆفیسی کۆمیسیۆنی مەدەنی، ڕاپۆرتی ئیدارەی مەدەنی کەرتی سلێمانی ساڵی ١٩٢٠، ل٥.

بەگ[١٢٨]، تیرەی میکایەڵیی جاف[١٢٩]، جەباری بەسەرۆکایەتی سەیید محەمەدی جەباری[١٣٠]، شێخ بزێنی بە سەرۆکایەتی فارس ئاغای سەرۆکیان[١٣١]، بەشێك لە سمایل عوزێری[١٣٢]، تاقمێك لە شوان بەسەرۆکایەتی عەزەی شەریف جەلال[١٣٣] و دەستەو تاقمی بچووکتر وەك مووریدانی شێخ عەبدوڵای عەسکەر لە ناوچەی قەڵاسێوکە (ئاغجەلەر)[١٣٤]. سەرەڕای ئەم هەموو ناوە شکۆدارانەی عەشایەر، ئەو یارمەتی و پشتگیرییەی لە شێخ دەکرا لاواز و بێسوود بوو، چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی بە یەکدڵی لە بەرەی ئەمدا بوون هەرگیز لە چەند سەد کەسێك تێپەڕی نەدەکرد، دەنا هەموو ئەوانیتر هەندێکی لێبەدەر، وا دیارە دڵسۆزییان جێی متمانە نەبوو و پشتگیرییان هەروا بەڕێکەوت و

---

[١٢٨]- ویلسن: دڵسۆزان، ل١٢٥، درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٠، لەبارەی کەریمی فەتاح بەگەوە بڕوانە ل: "دووساڵ لە باشووری کوردستاندا"، ل٢٧٣،٢٧٥؛ ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٢٤٥-٢٤٦ و شوێنانی‌تر.

[١٢٩]هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٣٠]سەید محەمەدی جەباری کە سەرۆك و دەمڕاستی بیست سی گوند بوو لە باشووری چەمچەماڵدا یەکێك بوو لە دۆستە دڵسۆزەکانی شێخ مەحموود و تاسەر لەگەڵی مایەوە. ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب ل٣٧-٣٩. ئەو جەخت کردنەوەی کەوا سەید محەمەدی جەباری و دەستەو تاقمەکەی لە ٥ی حوزێرانی ١٩١٩دا وازیان لە شێخ مەحموود هێناوە، وەك لە ڕاپۆرتێکی ڕەسمی بەریتانیدا دەردەکەوێت، ڕاست نیە. درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٠.

[١٣١] واباسە نزیکەی پەنجا کەس لە هۆزی شێخ بزێنی کە چووبوونە پاڵ شێخ، زۆریان وازیان لێهێناوە. درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٠، لە ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب ل٣٧ وەرگیراوە. ئیدمۆندز فارس ئاغا وا دەناسێنێ کەوا برازای تۆفیق ئاغای قەسرۆکە، کە کوڕەزای مەلا عەباسەو یەکێك لەو چوار برایەی هۆزی شێخ بزێنییان لێکەوتەوە. هەمان سەرچاوە ل٣٨-٤٢.

[١٣٢] بە پێی ڕاپۆرتێکی ڕەسمی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەوا عەشیرەتی سمایل عوزەیری بەشدارییان کردووە لە شەڕی ملەی تاسڵووجەدا و پاشان زوو بڵاوەیان لێکردووە و گەڕاونەتەوە ماڵەکانی خۆیان لە دۆڵی سلێمانیدا. درایڤەر: کوردستان و کورد، ل٩٠.

[١٣٣]شوان بەسەرۆکایەتیی عەزەی شەریف جەلال، وەك باسدەکرا ژمارەیان ٢٥٠ کەسێك بووە و لە قەرەهەنجیر شەڕیانکردووە. سەرچاوەی پێشوو ل٩٠، لە ئەئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٢٧٦، وەرگیراوە. عەزەی شەریف جەلال وەك جەردەیەکی بەدناو باسدەکرا لەوناوەدا.

[١٣٤] وەك دەوترێت شێخ عبدوڵا، کە دە دوانزە گوندی لەژێر دەستدابووە، هەر لە سەرەتاوە بووە بە جەنگاوەری شێخ. ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٣٩.

گۆترەكاری و كورتخایەن بوو. دڵسۆزە كەمەكانیش لەسەر بناغەی كۆمەڵگای خێڵەكی ڕێكخرابوون نەیاندەتوانی دژ بە سوپای گەورە و توندوتۆڵ بووەستنەوە. خەڵكی خێڵەكی كورد بەهۆی ناكۆكیی ناوخۆ و ناحەزیی نێوان هۆزەكانیان بەكەمی دەتوانن بەرەیەكی یەكگرتوو پێكبێنن لەبەرانبەر دوژمنی هاوبەش بۆ تێكڕا خەڵكی خێڵەكی تیرمێكی دژوارەو لەم ڕووەوە دوژمن واتە دوژمنەكەی و ئەم بارە بەتەواویی پێچەوانەی ئەقڵ و ژیربێژیی خێڵەكییە كە خۆی لەم پەندە باوەدا دەبینێتەوە "دوژمنی دوژمنەكەم دۆستمە".

ئەڵبەتە كاتی زۆر دەوێ بۆ كورد لە تەواوی ناوچەكەیاندا كە جیاوازییان بخەنە لاوەو كینەو ناحەزییان بەرانبەر بە یەكتر لە بیربچێتەوە بۆ ئەوەی لە دژی نەیاری دەرەكی یەكبگرن و ئێستا ئەو یەكگرتنە، زیاتر ئیستیسنایە وەك لەوەی نەریتی چەسپاو بێت. لەوەش زیاتر ئەم یەكگرتن و هاوپەیمانێتیانە هەرگیز ئەوەندە بەردەوام نەبوون تا بتووانن مەبەستی خۆیانی پێ بەدیبێنن دژ بە دەسەڵاتی زاڵ و ناحەزی ستەمكاریان.

وەك بینیمان شێخ مەحموود داوای لە كوردەكانی باشوور كرد كەوا شەڕی بەریتانیا بكەن بە ناوی ناشنالیزمی كورد و ئیسلامەوە، واتە ئەمە خەباتی نەتەوەیی و جیهاد بوو. بەهەرحاڵ بۆ زۆرینەی كورد نەتەوەپەروەریی "ناشنالیزم" چەمكێكی تازە بوو و پێی ئاشنا نەبووبوون، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو شكستی هێناو ئەنجامی خواستراوی بەدەستەوە نەدا، بە پێچەوانەوە ، تا ئەو ەەمە جیهاد زۆر ئاشنا بوو بەخەڵكەكە وەك هۆكارێكی بێهیوایی. كوردەكان پێشتر ئەزموونی لەم جۆرەیان لە لایەن كەسێكەوە هەبوو كە زۆر گەورەتر و بەتواناتر بوو لە شێخ مەحموود، بەڵام شكستی هێناوە. بانگەشەكردن بۆ جیهاد لەلایەن سوڵتان یان خەلیفەوە پاشخانی دەستبدانە چەكی هەبوو و بەزۆریی ئامرازی دەستی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیو هاوپەیمانەكانی بوون بەڵام لە دژی هەمان دوژمن كە ئینگلیز بوو نوشوستی هێنا لە پاش چوار ساڵی جەنگ.

شێخ دەیزانی کە ناتوانێ کوردستانی باشوور بخاتەوە جووڵە ئەگەر گیانێکی نوێ نەکاتەوە بەر هاوڕەگەزەکانیدا. بەئاشکرا ئەمەشی پێنەدەکراو شکستی هێنا لەچارەسەرکردنی ناکۆکییان و بۆڕدانی ئەو ڕکابەرانەی بەرهەڵستیان دەکرد. جاف و پشدەر دوان لە بەهێزترین هاوپەیمانی خێڵەکی بوون لە باشووری کوردستانداو بە ناحەزی مانەوە و چالاکانە پاڵپشتی ڕکابەرە ئینگلیزەکانی ئەمیان دەکرد[١٣٥].

بێڵ،ساڵی ١٩٢٠ دەنووسێت کەوا "لاوازی و نەکارایی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود لەوەدا بوو کەوا لەو هەزاران کەسەی بەناو لەپشتی بوون، پاڵپشت و دڵسۆزە چالاکەکانی لە سێسەد کەس تێپەڕیان نەدەکرد"[١٣٦]. هەرچەندە ئەم مەزەندە کەمەی بێڵ ڕەنگە هەوڵدانێك بێت بۆ کەمکردنەوەی بەئەنقەستی بایەخی شێخ مەحموود، بەڵام گومانیش لەوەدا نیە ژمارەی پیاوەکانی زۆر لەوە کەمتربوون کە باسی لێوە دەکرا. چونکە لە موریدەکانی بترازێت "کە ئەمانە لەڕووی ئایین و تەریقەتەوە دڵسۆزی بوون"، لەگەڵ ئەوانەی پەیوەندیی خزمایەتیی یان بەرژەوەندییان لەگەڵیدا هەبوو، دەنا ژمارەی ئەوانەی دڵگەرم و دڵسۆزی مەسەلەکەی شێخ بوون زۆر کاریگەر نەبوون.

سەرچاوە: The Kurdish National Movement
(Its origins and Development)
ناونووسەکەی: Wadie Jwadeh
چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠٠٦
بەشی: ١٠ ل(١٦٠-١٨٤)، پەراوێزەکانی ل(٣٤٥-٣٥٢).

---

[١٣٥] E.J.R، ل١٦، دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەوا هەموو جاف و هەموو پشدەر لەپشتی ئینگلیز نەبوون لە دژی شێخ مەحموود. هەرچەند عادیلە خانم و زۆربەی بەگزادە لە هەڵەبجە سەر بە ئینگلیز بوون، بەڵام حامید بەگی زڕکوڕی عادیلە خانم سەر بە شێخ بوو. ل، "دووساڵ لە کوردستانی باشووردا" و شوێنی تری کتێبەکە. بە هەمان دەستووریش ئەگەرچی بابەکری سەلیم ئاغای سەرگەورەی پشدەر سەر بە ئینگلیز بوو، بەڵام عەباسی مەحموود ئاغای خزمی دژیان بوو. ئیدمۆندز: کورد و تورك و عەرەب، ل٢٢٩.

[١٣٦] بێڵ: پێداچوونەوەی ئیدارەی مەدەنی، ل٦٥.

## شرۆڤەیەك لەسەر تێكۆشانی
## شێخ مەحمودی بەرزنجی

- ❖ ئایەت محەممەدی (كەلهوور)
- ❖ وەرگێڕانی لە فارسییەوە: كارزان محەمەد

لای کەس شاراوە نییە کە مێژووی بزووتنەوە ئازادییەکان، هەورازو نشێوی تایبەت بە خۆیان هەبووە. نەتەوەو میللەتە کۆلۆنیکراوەکان و وڵاتە ژێردەسەڵاتەکان لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی بەرەو بەرفرەبوونی ئازادیخوازیی رۆیشتوون، لەماوەی ئەم دوو سەدەیەی دواییدا گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە بگەنە ئاستی میللەتە ڕزگاربووەکانیتر کە ئازادییەکی ڕێژەییان دەستەبەر کردبوو. لەم ڕێگایەدا بزووتنەوە ئازادیخوازەکان لە وڵاتانی جیهانی سێیەمداو یاخود باشتر بڵێین وڵاتانی باشور، زۆرترین پشکیان لەم جوڵانەوانەدا هەبووە.

بە شایەتحاڵی تەواوی دیکۆمێنتە مێژووییەکان، زۆرینەی بزووتنەوەکان، شۆڕشەکان و ڕەوتە ئازادیخوازەکان لەتێکۆشاندا بوون دژ بە زلهێزو کۆلۆنیستەکان و لە ماوەی ئەم دوو سەدەیەی دواییدا لەو نیشتیمان و یاخود لەو وڵاتانەدا بوون کە وڵاتەکانیان لە ڕوانگەی سەرچاوە سەرزەوی و ژێرزەوییەکانەوە (کانزاکان، نەوت، گاز...) دەوڵەمەند بوون. بوونی وڵاتە دەسەڵاتدارەکان و کۆلۆنیزەکردنی میللەتانی ئەم وڵاتانە تەنها بۆ تاڵان و چەپاوڵکردنی سەرچاوەکانیان بووەو بۆ گەیشتن بەم ئامانجە جێبەجێبەستانەیان دەستیان بۆ هەموو کارێك بردووە.

ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەڕیزی ئەو ناوچانەدا بووە کە لەکۆنەوە جێی بایەخی وڵاتە گەورەو دەسەڵاتدارەکان بووە. بوونی ئەنبارەکانی نەوت و گازو هەروەها پێگەی جیۆپۆلۆتیکی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك پردێك لەنێوان ئەوروپا، ئەفریقا و ئاسیای ناوەڕاستدا بووە کە ئەم سێ قارەیەی بەیەکەوە بەستۆتەوە. نەوت، ئەم ئاڵتونە ڕەشەی کە ڕۆڵ و گرنگییەکی زۆری لە بەرەوپێشەوەبردنی پیشەسازی و ئابوری جیهاندا هەبووە، بۆتەمایەی بوونێکی دەسەڵاتدارانەی وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان لە

ناوچەکەدا. زاڵبوونی دەسەڵاتدارانەی کۆلۆنیالیزم بەسەر دەسەڵاتی میللی و ناوچەییانەی وڵاتانی ناوچەکەدا، ببووەمایەی ئەوەی کە ڕێگە بە هیچ جۆرە خۆدەرخستنێکی هێزە ئازادیخوازو نیشتیمانپەرستە شۆڕشگێڕەکان نەدرێت.

لەناو وڵاتانی مەزن و دەسەڵاتداردا، ئەمە دەوڵەتی شاهانشاهی بەریتانیا بوو کە بەهۆی لێزانین و بیرکردنەوەی داڕێژەرانی سیاسەتی بریتانیاوە کە بەرهەمی پتر لە (٣٠٠) سێسەد ساڵ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە بوو بۆ ناسینی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەمەیدان و بوارە جۆراوجۆرەکانی کلتوریی، ئابوری، کۆمەڵایەتی میللەتانی ناوچەکە، توانیان بەبەراورد لەگەڵ وڵاتە دەسەڵاتدارە هاوچەرخەکانیتری خۆیان وەك پورتوگال، هۆڵەندا، ڕووسیا، فەرەنسادا ئامادەگییەکی چالاکترو بەهێزتریان لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبێت. بەجۆرێك کە دواتر هاتەبەرچاوان و بەتایبەتی لەم سەدەیەی دواییدا، نەك تەنها خۆی دەسەڵاتدارەکانی دەستنیشان دەکرد، بەڵکو هێندە لەناو خەڵکی وڵاتانی ناوچەکەدا خۆی جێگیر کردبوو کە هەرجۆرە چالاکییەکی لەناوچەکەدا خستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو بەسودوەرگرتن لە سیاسەتە تاکرەو و کۆلۆنییە کۆنەکانی خۆی وەك: پەرت بکەو زاڵ بە، سیاسەتی گوێزەرو کوتەك ڕۆڵی خۆی لەناوچەکەدا زیاد دەکرد.

بەم پێشەکییە کورتە دەگەڕێمەوە باسکردنی مەسەلەی بزووتنەوە ئازادیخوازییەکان لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەت ئەو بزووتنەوەو ڕاپەڕینانەی کە لەلایەن سەرکردە ناوچەیی و ئاینییەکانی کوردەکانەوە دژ بە حکومەتە فاشیستەکانی کوردەکان و عەرەبەکان ئەنجام دران.

بە باشی دەزانم کە ئینگلیزەکان بەو پێشینە دێرینەیەی خۆیانەوە لە ناوچەکەداو بەو زانیاریانەی کە دەربارەی ڕۆحی خەڵکانی ئەم ناوچەیە بەدەستیان هێناوە، بە ئاسانی بناغەی سیاسەتە کۆلۆنیالیستییەکانی خۆیان دارشتووەو بە چەند بیانوویەکی بێ بنەما درێژە بە ئامادەگی خۆیان دەدەن. بۆ ئەوەی بە گشت ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازییانە ئاشنا ببین کە لە هەناوی خەڵکەوە دژ بە دەسەڵاتی عوسمانییەکان و دواتر عەرەبە فەرمانڕەواکانی

نێوان دووڕووبار هاتبوونەئارا، دەبێ ئاماژە بۆ ڕۆڵی توخمی ئایین بکرێت کە بووەمایەی جیابوونەوەی بەشێکی بەرفراوانی ئێرانییەکان لە زێدی دایکی خۆیان. دوای فۆرمەڵەبوونی دەوڵەتی عوسمانی سوننە لەهەمبەر دەوڵەتی سەفەویی شیعەدا، بەشێکی بەرفراوانی کوردەکان بەهۆی دەمارگیریی ئایینیو مەزهەبی خۆیان لە قبوڵکردنی فەرمانڕەوایی شیعەی سەفەوی دەرباز کردو فەرمانڕەوایی ئەو کەسانەیان قبوڵ کرد کە هیچ جۆرە ناکۆکییەکیان لەڕووی کلتوریی، نەژادی، زمانو... لەگەڵ یەکتردا نەبوو و تەنها بەهۆی دەمارگیریی بیروباوەڕو ئایدۆلۆژییەوە ئەم دیواری بێ متمانەییو جیابوونەوەیان لەنێوان خۆیانو برا هاونەژادو هاوخوێنو هاوزمانەکانیان هێنایە ئارا کە دواتر بووەمایەی ڕەنجو ئازار بۆ میلیۆنەها مرۆڤی نەجیبو ڕەسەنی نەوەکانی دوای خۆیان.

توخمی ئایین بە یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی دروستبوونی ناکۆکیو دروستبوونی جودایی لەنێوان کوردەکانو زێدی دایکیاندا هەژمار دەکرێت کە وەك گرنگترین دەستکەوتو بیانوو بۆ دەسەڵاتە گەورەکان بەتایبەتی بۆ عوسمانییەکان هەژمار دەکرێت تا بەم چەکە، توانی بەشێکی بەرفراوان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە دەوڵەتمەدارانی عوسمانی، خۆیان هێندە بڕوایان بە مەسەلە دینیو مەزهەبییەکان نەبوو و تەنانەت پابەندی پرەنسیپو هێڵە سەرەکییەکانیشی نەبوون.

جگە لە فاکتەری دینو مەزهەب، فرەنەژادیو نەتەوەیی لە ناوچەکەدا یەکێکیتر بوو لەو توخمانەی کە ئینگلیزەکان بەپێی ئەو ناسنە دێرینەکانی خۆیان بۆ خەڵکی ناوچەکە هەیانبوو بە باشی بەکاریانهێنا. بەشێوەیەکی ڕەها دەبێ بڵێین کە ئینگلیزەکان ئەم فاکتەرە فرەنەژادییەی (تورك، عەرەب، کورد، ئاشوری...) بە شێوەیەکی باشتر لە فاکتەرەکانیتری وەك دینو مەزهەب بەکاریانهێنا. بە بیانوە جۆراوجۆرەکانو بزواندنە جۆراوجۆرەکانیانەوە کە ئێوەی کوردو عەرەب نابێ فەرمانڕەوایی تورکەکان

قبوڵ بکەن، بوونەمایەی پەرت پەرت کردن و هاتنەئارای چەند وڵاتێکی عەرەبیان فەراهەم کرد.

لەلایەکەوە ئەو کوردانەی دەبزواندو پشتیوانی لێدەکردن کە لە ژێردەسەڵاتی عوسمانی جیاببوونەوە، لەلایەکیتریشەوە پشتیوانی وڵاتانی تورکیاو عیراقی عەرەبی تازە دامەزراویان دەکرد بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان و هەمیشە ماسیان لە ئاوی لێڵدا ڕاودەکردو بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە نائارامی ناوچەکەدا دەدۆزییەوەو بەم بیانووانە پەیڕەوییان لە سیاسەتەکانی خۆیان دەکرد لەپێناو گەیشتن بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان کە بریتی بوو لە بەدەستهێنانی نەوت، گازو بەرژەوەندییەکانیتریان لە ناوچەکەدا.

توێژینەوەو شرۆڤەکردنی کورت لەسەربنەمای سەدان دیکۆمێنتی بەردەست کە لێرەدا بەشێوەیەکی پوخت ئاماژە بە چەند دیکۆمێنتێك کراوە دەربارەی ڕاپەرینی شێخ مەحمودی بەرزنجی دژ بە ئینگلیزەکان و دەوڵەتی ساوای عیراق و سیاسەتە ئاڵۆزو فرەجەمسەرەکانی ئینگلیزەکان. بەپێی یەکێك لەو دیکۆمێنتانەی لەبەردەستدایە دەربارەی سیاسەتە فرەجەمسەرەکانی ئینگلیزەکان بۆ بەگژداچوونەوەی کوردەکان، عەرەبەکان و... ئەوەیە کە سەرکۆنسوڵگەری ئیران لە بەغداد لە ڕاپۆرتێکدا دەیخاتەڕوو لەسەربنەمای ئەوەی کە :"واتەواتی ئەوە لەئارادایە ئینگلیزەکان دەیانەوێت کوردستان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەوانەوە هەبێت و کوردەکانیش لەگەڵ ئەمەدان و گوایە فەیسەڵ نارەزایی دژ بە ئینگلیزەکان دەربڕیوە کە تۆ کوردستانت بەهۆی ڕێککەوتنامەیەکەوە بە تەواوکەری بەشەکانی عیراقت داناوەو پشتڕاستت کردۆتەوەو ئێستا چۆن دەتەوێ سەربەخۆییان بدەیتێ، کۆمیسیاری باڵا لە وەڵامی فەیسەڵدا وتویەتی کوردستان لە کۆمەڵەی نەتەوەکاندا بە میللەتێکی سەربەخۆ ناسراوەو سەربەخۆیی کوردەکان دژ بە ماددەکانی ڕێککەوتنامەی بەریتانیاو عیراق نییەو بەهەرحاڵ لە ژێر فەرمانی حکومەتی عیراقدا دەمێنێتەوە".

ئــەم سیاســەتە فرەجەمــسەرو ئــاڵۆزەی ئینگلیزەکــان لەهەمبــەر بزووتنەوە ئازادیخوازییەکاندا نەك تەنها کوردەکان بەڵکو میللەتانیترو نەتەوە ستەمدیدەکان چەندین و چەندینجار بەخۆیانەوە بینیوە، بەجۆرێك کە لە دیکۆمێنتێکیتری بەردەستدا بەکردەوە بیری دەوڵەتمەدارانی ئیرانی هێناوەتەوەو دەڵێت:" سەرەنجام واپێویستە هانی بیروباوەڕی پێکهێنانی کورستانێکی سەربەخۆ نەدرێت".

لەلایەکیترەوە، هانی هەندێ لە سەرکردە دینییەکانی کوردی دژ بە حکومەتەکانی ناوچەکە داوەو بەڵێنی پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆی کوردستانی پێداون. شێخ مەحمودی بەرزنجی (مەلیك مەحمودی نەمر) لەڕیزی ئەو سەرکردە دینیانەدا بوو کە وەك گەورە ئاینییەکانیتری کورد چووە مەیدانی سیاسەتەوەو زۆر زوو پێگە مەزهەبییەکەی کەوتە ژێر کاریگەریی رەفتارە سیاسییەکەیەوە. تێکۆشەرێکی ماندوونەناس کە هیچ کات لەبەرامبەر کۆلۆنیالیستەکاندا کەمتەرخەمی نەکردو مەردانە لەڕێگەی بەدەستهێنانی دروشمە ڕەواکانی گەلی کورد پاشەکشەی نەکردو لە ترسی مردن کونجی خەڵوەتی هەڵنەبژارد.

توێژینەوەو شرۆڤەکردنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی تێکۆشانەکانی شێخ مەحمود پێویستی بە کاتو وردەکارییەکی پێویستە تا بتوانرێ لایەنەکانی ئەم سەردەمە شرۆڤە بکرێت تا واقیعە شاراوەکانی ئاشکرا بێت تا نەوەکانی ئایندە باشترو بە تێگەیشتن و تێڕوانینێکی کراوەترەوە بنۆڕنە ئەم مەسەلەو بابەتانە. دەبێ بە وردەکارانە توێژینەوەی لەبارەیەوە بکرێت تا هۆو هۆکارەکانی بەردەوامبوونی ئەم شۆڕشانەو بە ئاکام نەگەیشتنیان ڕوون بکرێتەوە، هەروەها چ کەسانێك سودی زیاتریان لە بەردەوامبوونی ئەم شۆڕشانە وەرگرتووەو چ کەسانێکیش زیانیان پێگەیشتووە.

بەڕاستی نەوەی ئەمڕۆ بەشێوەیەکی گشتی نەوەکانی دوای شێخ مەحمودو سەرکردەکانیتر لەدووتوێی لاپەڕەکانی مێژوودا بەدوای چیدا دەگەڕێن؟ خواستو ئامانجەکانیان چییە؟ پێویستە بە باشی پەی بەم

مەسەلەیە ببردرێت کە چاوپۆشین لە واقیعییەتەکان و قبوڵنەکردنی ڕەخنە لەڕیزی هۆکارەکانی بەئەنجام نەگەیشتن و شکستی مرۆڤەکان و بەشێوەیەکی گشتی هی کۆمەڵگاشە. دەبێ ئەمە قبوڵ بکەین کە یەکێك لە هۆکارەکانی بەئەنجام نەگەیشتنی سەرکردەکانیش، قبوڵ نەکردنی واقیعییەتی سەردەمەکەی خۆیشی بووە. هەڵبەتە سەرسەختی و ئومێد بە ئایندە هەمیشە وا لە مرۆڤەکان دەکات تێبکۆشن و هەوڵ بدەن لەپێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان و تا ئەو دواساتەی لە توانادایە درێژە بە تێکۆشان دەدەن. ئەم ئومێدە بە ئایندەیەکی باشترو ڕزگاربوون و دەستەبەرکردنی سبەینێیەکی باشتر، لە ژیان و تێکۆشانی سیاسیانەی پیاوە مەزنەکاندا باشتر دەبینرێت و شێخ مەحمود ئەو تێکۆشەرە ماندوونەناسەی لەڕیزی ئەو پیاوە ناودارانەدا بوو کە بەئومێدو وێناکێشانی کلاوڕۆژنەیەکی درەخشانەوە هەنگاوی لە مەیدانی تێکۆشاندا هەڵێنا بوو دژ بە کۆلۆنیالیستی پیرەزەمانەو فرت وفێڵی بەکرێگیراوانی تورکەکان و ئەو عەرەبانەی تازە گەیشتبوونە دەسەلات.

بەلام ڕۆڵ و زانیارییەکانی ئینگلیزەکان بۆ بەکارهێنانی خەڵکانی ژێر دەسەلاتی خۆی و ولاتانیتر، بووەمایەی ئەوەی کە ئەم تێکۆشانانە لەسەردەمی خۆیدا نەگەنە هیچ کوێیەك، ئەو نەمامە نێژراوە پێویستی بە کات هەبوو تا گەشە بکات تا بتوانێ لەهەمبەر گەردەلوول و ڕووداوەکاندا بەرگری بکات. شێخ مەحمودو سەرکردە تێکۆشەرەکانیتر، تۆوی ئومێدو ئایندەیەکی درەخشانیان بۆ نیشتیمانێك چاند کە پێویستی بەوە هەبوو تا خەڵکەکەی و نەوەکانی ئایندەی بە هەناسەو هزرێکی پێشکەوتووترەوە بنۆڕنە مەسەلەکان و هیچکاتێ چاوەڕوانی سەردەمەکە نەبن کە تێپەڕبوونی کات مەسەلەکانیان بۆ چارەسەر بکات، بەڵکو دەبێ خۆیان بجوڵێن. لەگەڵ ئەم باسکردنەداو لەسەربنەمای چەند دیکۆمێنتێکی باوەڕپێکراوی سەردەمی تێکۆشانی شێخی نەمردا، بە تێڕوانینێکی گشتیانەو خێراوە ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازییە تا ئەندازەیەك شرۆڤە دەکەین.

زۆرینەی ئێرانییەکان کە وەفاداربوون بۆ نیشتیمان و هاونەژادەکانی خۆیان، هەوڵێکی زۆریان دا تا سود لە ئاڵوگۆڕەکانی سەردەمی سەرهەڵدان و

ڕاپەڕینی شێخ بکەن و هەنگاوێك بۆ سڕینەوەی ئەو سنورە سیاسیانە هەڵبێنن کە لەلایەن کۆلۆنیالیستەکانەوە کێشرا بوون. سەرەتا ئاماژە بۆ دیکۆمێنتێك لەمبارەیەوە دەکەین و پاشان باس لە نمونەیەك لە سودوەرگرتنی نیگەتیڤانە لە ڕاپەڕینی شێخ مەحمودو شەڕەکانی ناوبراو لە جەنگ دژ بە ئینگلیزەکان و عەرەبەکاندا دەکەین.

سەرکۆنسوڵی ئێران لە بەسرە زۆر هەوڵی دا تا شێخ مەحمود بکاتە لایەنگری دەوڵەتی مەزکەزی ئێران بەم ئومێدەی کە لە ئایندەدا بتوانێ بەراییەکانی گێڕانەوەی ئەو کوردانە بۆ باوەشی نیشتیمانی دایکی خۆیان فەراهەم بکات کە لە نیشتیمانەکەیان جیاببوونەوە. بەجۆرێك کە لە (٦ی ئابانی ١٣٠٣ی هەتاوی) بەپێی دیکۆمێنتێکی لەبەردەستانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە تیایدا نوسراوە: شێخ مەحمودی سەرۆکی کوردەکان بەهۆی فشاری سەربازەکانی ئینگلیز بە دووسەد کەس و خزم و هاوکارەکانی و (٣٠٠) سێسەد هەزار لیرەوە بەرەو سنوری ئێران هەڵاتووە، ناوبراو لەڕوانگەی کوردەکانەوە زۆر بەڕێزەو عەشیرەتەکانی کوردستان ناوبراو بە مورشیدو شێخی تەریقەتی خۆیانی دەزانن، ئەگەر پەنا بباتە بەر خاکی ئێران، بۆ خۆخۆشەویستکردن و لەبەرخاتری کوردەکان زۆر گونجاوە. لەلایەن دەوڵەتەوە میهرەبانی لەبەرامبەر ئەودا دەرببڕدرێت و تەنانەت یاریدەی بدرێت و بەهێزتر بکرێت چونکە ڕاکێشکردنی دۆستایەتی ئەم کەسایەتییە بۆ سیاسەتی ئێران لەو بازنەیەدا زۆر سودمەندە.

لەنامەیەکیتردا دەنوسێت: "گوایا شێخ مەحمود لە خاکی ئێراندا موڵك ومالی کڕیوەو بۆ لەبەرچاوگرتنی خاتری کوردان واباشە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت سەبارەت بە شێخ مەحمود میهرەبانی بنوێنن و یاریدەی بدرێت و بەرەولای ئێران ڕاکێش بکرێت."

بەڵام بۆچی لەلایەن دەوڵەتی مەرکەزی ئێرانەوە پشتیوانی لێنەکراو تەنانەت بە بەپێی ڕاسپاردە ئینگلیزییەکان لەبەرنامەیاندا بووە شێخ مەحمود دەرپەڕێنن و لە چەك دایبماڵن و بۆ یەکێك لە ناوچە دوورەدەستەکانی ئێران

دووری بخەنەوە. گۆڕانی ڕژێمی دەوڵەتی مەرکەزی ئێران هاوکات بوو لەگەڵ ئەم ڕووداوانەدا کە بە هاوکاریو دەستوەردانی ڕاستەوخۆی ئینگلیزەکان، ڕەزاشای پەهلەوی جێگەی دەوڵەتی شومی قاجارییەکانی گرتەوە. لەلایەکیترەوە ئەم سەردەمەی شێخ مەحمودی بەرزنجیو ترۆپکی تێکۆشانەکەی ناوبراو هاوکات بوو لەگەڵ ئەو بێسەروبەرەییە بەرفراوانەی کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی پارێزگا جۆراوجۆرەکانی ئێرانەوە لەئارادا بوو. هەرکامیان بەجۆرێك دەوڵەتی مەرکەزیان هەڵدەسوڕاندو بانگەشەی بەدەستهێنانی دەسەڵاتیان لە ئێراندا دەکرد. بێئاگا لەوەی کە یەکێك لە ئەرکەکانی ڕەزاشا، پێچانەوەی ئەم حکومەتانەو دەسەڵاتە ناوچەییو لۆکاڵییەکان بوو. سودوەرگرتن لە ڕاپەرینو جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی شێخ مەحمودو هەوڵە بەردەوامەکانی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی، یەکێکیتر بوو لەو فاکتەرانەی کە دەوڵەتە مەرکەزییەکانی تورکیاو ئێرانی سەرقاڵ کردبوو و سودیان لێدەبینی. بەجۆرێك کە تورکیا بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەرینی کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی، پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ شێخ مەحمود بەستو بەڵێنێکی زۆری بە ناوبراو دا بۆ پشتیوانیلێکردنی تا ئەو بخاتە ژێر چەتری پشتیوانی خۆیەوە، تورکەکان تەنانەت (شەوکەت بەگ)یان وەك نوێنەری دەوڵەتی کۆماری تورکیا بۆ ناوچە کوردنشینەکانی ئێران نارد تا ببێتەمایەی هاوکارییو ڕەخساندنی هەلومەرجێك بۆ ڕاکێشکردنی کوردەکان بەرەو لای تورکیا.

دەوڵەتی ساوای مەرکەزی ئێران کە لەبەردەم گۆڕانو ئاڵوگۆڕی پەیوەندیدار بە ئاژاوەی پارێزگاکانو خۆزستاندا بوو، ئەم ئاژاوەیە کە شێخ خەزئەل سەرکردایەتی دەکردو لەلایەن دەوڵەتی ئینگلیزو دەوڵەتی ساوای عیراقییەوە پشتیوانییەکی توندی لێدەکرا، بۆ سەرکوتکردنی ئەم ئاژاوەو شۆڕشانە بڕیاری دا بۆ سەرگەرمکردنی دەوڵەتی عیراقو ئینگلیز بە ڕاپەرینی شێخ مەحمودی نەمرەوە، بە خەیاڵێکی ئاسودەترەوە شێخ خەزئەل سەرکوت بکات. لەمبارەیەوە بەپێی یەکێك لە دیکۆمێنتە بەردەستەکان کە لەلایەن

کونسوڵگەریی ئیران لە شاری بەسرەوە هاتووە جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکاتەوە کە:" پێویستە سەرکردەکانی دەوڵەت لەڕێگەی نهێنییەوە ئاگری فیتنەی کوردستان (مەبەستی لە ڕاپەڕینی شێخ مەحمودە دژ بە بەریتانیاو دەوڵەتی عیراق) پەرەی پێبدرێت‌و حکومەتی عیراقی بەخۆیەوە سەرقاڵ بکات تا مەسەلەی خۆزستان لەناوببردرێت‌و گوێی لادەران رابکێشرێت".

لەمڕووەوە دەوڵەتی مەرکەزی ئیران ڕازی نەبوو بەمزوانە ئاگری ڕاپەڕینی شێخ مەحمود بکوژێتەوە. لەبەرئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی عیراق بەسەر ناوچە کوردنشینەکاندا دەبووەمایەی ئەوەی کە بە خەیاڵی دەوڵەتمەدارانی دەوڵەتی ساوای عیراق، ئاسوودەتر لەسەر بانگەشەی درۆزنانەی خۆیان بۆ لکاندنی خۆزستان بە عیراقەوەو بزواندنی لایەنە خۆفرۆشەکان‌و ڕۆڵی خۆیان، ببنەمایەی بەهێزکردنی خەیاڵی شێخ خەزئەل‌و نائارامییەکی زیاتر لە خۆزستاندا.

لەلایەکیترەوە ئیرانییە نەتەوەپەرستەکان کە دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو، هەوڵیان دا تا ڕوانگەی دەوڵەتی ساوای پەهلەوی ڕاکێش بکەن لەپێناو پشتیوانیکردن لە کوردەکانی ژێر فەرمانڕەوایی وڵاتی تازەدامەزراوی عیراق‌و لەم ئاقارەوە بە ناردنی چەند نامەیەك بۆ وەزارەتی دەرەوە داوایان کرد کە لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا پشتیوانی لە مافەکانی کورد بکرێت. ئەوان ئەم ئومێدەیان هەبوو تا هەرلەسەرەتای پێکهێنانی وڵاتی عیراق لەلایەن ئینگلیزەوەو بەهۆی ئەو ئاژاوەو ناسەقامگیرییە سیاسییەی لە ناوچەکەدا هەبوو لەمەیدانی نێودەوڵەتیدا بتوانن بەلایەنی کەمەوە ناوچە کوردنشینەکانی ئەم وڵاتە دووبارە بۆ ئیران بگێڕنەوە. لەم پێناوەداو لەهەمان سەردەمی ڕاپەڕینی شێخ مەحمود، نوێنەرەکانیان لە بەغداد دیداریان لەگەڵ کوردەکاندا کردو ڕێککەتن کە پشتیوانی لە گێڕانەوەی کوردەکان بۆ زێدی دایکی خۆیان لێبکرێت. ئەم دیدارو ڕێکەوتنامانە بەبێ ئەوەی ئینگلیزەکان‌و تورکەکان ئاگاداری بن، ئەنجام دران‌و ڕێککەوتنامەو پەیماننامەی نێوان سەرکردەکان‌و نوێنەرە کوردەکان‌و نوێنەرە ئیرانییەکان لە بەغداد ئیمزا کراو

تەنها چاوەڕوانی پشتیوانییەکی جددیانەو پراکتیکیانەی دەوڵەتی مەرکەزی ئێران بوون و دواتر بینرا کە ئەم کارە نەهاتەدی. ئەم پشتیوانی لێنەکردنەش دەگەڕایەوە بۆ گۆڕانی حکومەت لە ئێراندا کە لەڕێگەی بەکرێگیراوی ئینگلیز واتا ڕەزاشا کە بەدەستەپاچە مابۆوە. ئەم کارەش لە فشاری سیاسی دەوڵەتی ئینگلیز بۆسەر دەوڵەتی ساوای ئێرانەوە سەرچاوەی گرتبوو کە بەدەرکردنی بەیاننامەیەك دووبارە وەبیر دەوڵەتی ئێرانی هێنایەوەو داوای لە ئێران کرد کە پشتیوانی لە شێخ مەحمود نەکات و لەکاتی چوونی شێخ مەحمود بۆ خاکی ئێران، لە ئێران دەریپەڕێنێت و یاخود نەهێڵێت بچێتە خاکی ئێرانەوە.

لە دیکۆمێنتێکی‌تردا هاتووە کە ئینگلیزەکان خەیاڵی ئەوەیان هەبووە کە سەرپەرشتیارێتی کەرکوك، سلێمانی، ڕەواندز، کۆیەو هەندێ ناوچەیتری کوردنشین کە بەشێکن لە ویلایەتی موسڵ، بسپێرێت بە تورکەکان. ئەم پیلانەو ئامانجێکیتری ئینگلیزەکان تەنهاو تەنها بۆ ڕزگاربوون بووە لە توندبوون و بەردەوامبوونی ڕاپەرینی شێخ مەحمودو سەرکردەکانیتری کورد کە خۆیان لەبەرامبەریاندا بێهێز بوون، ئەم ڕادەبرینەش بەهۆی ئەوەوە بوو تا تورکەکان بە هەنگاوە دڕندەو بێبەزەییەکانی خۆیان باشتر بتوانن ئەم ڕاپەرینە سەرکوت بکەن، لەبەرئەوەی تورکەکان لە کوشتاری خەڵکانی نەتەوە ژێردەستەکانی خۆیان دریغیان نەدەکردو لەهیچ تاوانێکیش نەدەپرینگانەوە.

بەم نۆڕینەو ئەم توێژینەوە کورتە لەبارەی بارودۆخ و هەلومەرجی شێخ مەحمودو دەوروبەرەکەیەوە لەسەر بنەما و خستنەڕووی چەند دیکۆمێنتێك، ئاماژە بۆ چەند خاڵێکی گرنگ دەکەین وەك هۆو هۆکارەکانی بەئاکام نەگەیشتنی ڕاپەرین و جوڵانەوەی شێخ مەحمود:

-لەبارنەبوونی هەلومەرجی نێودەوڵەتی بۆ قبوڵ کردنی خواستەکانی کوردەکان و فۆرمەڵەبوونی چەند وڵاتێکی نوێ لە ناوچەکەدا، ئەم بزووتنەوانەش بەپێچەوانەی خواست و بەرنامەی وڵاتە دەسەڵاتدارەکانی ئینگلیزو وڵاتە مەزنە هاوپەیمانەکانییەوە بوو.

-پشتیوانی نەکردنی جددیانە لەلایەن دەسەڵاتە دەرەکییەکانەوە یان لەلایەن یەکێك لە وڵاتانی ناوچەکەوە بەتایبەتی ئیران. ئەم کارەش بەهۆی هاتنە ئارای گۆڕان و ئاڵوگۆڕەکانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و گۆڕانی فەرمانڕەوایی و جۆری رژێمی دەسەڵاتدار لە ئیرانەوە بوو کە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لەگەڵ ئەم ڕووداوانەدا هێنرانەئارا.

-زیانگەیاندن لە ناوەوە، یەکێك لە خاڵە گرنگەکان کە دەبێ ئاماژەی بۆ بکرێت نەبوونی هەماهەنگی و هاوئاراستەنەبوونی کوردەکان و بەتایبەتی سەرکردە ناوچەییەکان لەگەڵ جوڵانەوەو ئامانجەکانی شێخ مەحمود. بەجۆرێك کە شێخ مەحمود هەرلەسەرەتاوە و تا ماوەیەك دوای ڕاپەڕینەکەی خۆی، تەنها لەلایەن موریدانی مەزهەبەکەیەوە پشتیوانی لێدەکرا. لەلایەکەوە هۆزو عەشیرەتەکانی ناوچە کوردنشینەکانی ژێر فەرمانڕەوایی عیراق و هۆزە عەرەبەکان لەگەڵ یەکتردا یەکیانگرت و لەگەڵ ئینگلیزەکاندا دژ بە شێخ مەحمود چوونە جەنگەوەو ڕۆڵێکی زۆریان لە شکستی شێخ مەحموددا گێڕا.

- هەژاری و نەخوێندەواری خەڵك.

-ناهۆشیاری و خۆبەزلزانینی خەڵك لەمپەری بەردەم ئەوەبوو تا یەکبگرن و دژ بە کۆلۆنیالیست و دووژمنان ڕابوەستنەوە. (ئەو فاکتەرانەی کە بۆ شێخ دەردناك و ئازاردەر بوو، ناهۆشیاری و خۆبەزلزانینی خەڵك بوو کە بووە لەمپەر لەبەردەم ئەوەدا کە بەیەککگرتنی خۆیان لەهەمبەر کۆلۆنیالیست و دووژمناندا ڕابوەستنەوە.)

١٤ی میهری ١٣٨٥

## سەرچاوە:


١. ئەبریشمی، عەبدوڵلا. مسئله کُرد در خاورمیانەو اوجالان، انتشارات توکلی، تهران، ١٣٧٨.

٢. کۆمەڵی بەڵگەنامەی سازمانی میللی ئێران.

٣. کەلهور، محەمەدی، سیری در تاریخ سیاسی کُرد و کُردهای قم، انتشارات پرسمان، تهران،١٣٨٢

٤. مەلا عومەر عیسی، صالح، بحران افرینی ابرقدرتها در کُردستان عراق، انتشارات توکلی، تهران، ١٣٨٠.

٥. بارزانی، مسعود، مبارزات ازادیبخش مرد کُرد و قیام مصطفی بارزانی، ترجمه: احمد محمدی، ناشر: مؤلف، ١٣٨١.

٦. خواجه، احمد، چیم دی، قیام شیخ محمود برزنجی و ملت کُرد علیه استعمار بریتانیا، ترجمه: احمد محمدی، تهران، بی‌تا.

## (١)

# شێخی ئەمر و سەردانەکەی مەلیک فەیسەڵی دوهەم بۆ سلێمانی

لە ساڵی ١٩٥٥ دا من کوریژگە بوم و قامم هەبوو شێخی ئەمریش زۆری خۆش دەویستم بەهۆی باوکی رەحمەتیموباپیرەمەوە ئەوکات شێخ لە بەغداوە هاتبۆوە کوردستان و داریکەلی کردبووە شوێنی مەقامی خۆی . رۆژێکیان بابا علی کورە ناوەنجی شێخی قارمان هاتە داری کەلی ( ئەوکات بابا علی وەزیری زراعە بولە بەغداد ) عرچی شێخی کرد و وتی باوکە گیان من لەبەغداوە هاتووم ئاگارت بکەم کە جەلالەتی مەلیك فەیسەڵ نیازی هەیە لەم دووسێ رۆژەدا بێتە شاری سلێمانی لام باشە تۆش تشریف بەریت بۆ شار .

شێخ فەرمووی من نایەم بۆ سلێمانی ، شێخ بابا علی وتی : بۆ مقامی جەنابتان وا دروستە هەرچۆن بێت وا بکەیت پێشوازی بکرێت و قەرەباڵغیەك لە سنوری بازیاندا کۆبکەیتەوە هەروەها وا چاکە لەگەورەیی خۆتەوە پێشوازی بکەیت و بیدینی چونکە بە سنووری مقامی جەنابتاندا گوزەر دەکات شێخ فەرمووی : ئەمەیان شیاوە . شێخی ئەمر و باباعلی وایان بەرنامەکە دارشت کە خێمەکانی شێخ لە ( کانی شایەی) تەختای بازیان لە نزێك جادە کە هەڵبدرێت و شێخ لەوێ جێگیر بێت و ئەمر بکات عەشائیری ناوچەکە و هەندێ لە خزمان بەسواری و پیادە چەکدارو بێ چەك هەر لە مەخفەرەکەی سەری تاسڵوجەوە تا ئەولا ( کانی شایە) ئەم بەرو ئەوبەری جادەی گشتی بگرن و بە شێوەیەکی وارابوەستن کە شایستەی پێشوازی بێت لەمەلیك فەیسەڵ .

ئیدی پاش رادەربڕینو مشاوەرە شێخ باباعلی بەرەو بەغدا گەڕایەوە، بەیانی شێخ ئەمری کرد خیمەکانیان بردە ( کانی شایە ) و جێگایان بۆ تەخت کردوو کورسی و مێزیان لە ژێردانا و شێخیش بۆ ڕۆژی دواتر کە ئەو ڕۆژە بو مەلیك تەشریفی دەهێنا لە داری کەلیەوە بەرەو تەختایی بازیان هات و چووە ژێر خێمەکان و چاوەڕێی هاتنی مەلیك فەیسەڵ بو ئەمریشی کرد عەشائیر و خزمان لەسەری تاسلوجەوە هەتاکو ئەولا کانی شایەوە بە ڕیزو بە شێوەیەکی جوان لەهەر دوبەری جادە ڕابوەستن هەر ئەو ڕۆژە بەرلەنیوەڕۆ سەیارەیەك لە کەرکوکەوە هاتە ئەم دیو دەربەندو لە نێوان بازیان و تاسلوجەدا هاتۆچۆ و ئەمسەرە و سەری ناوچەکەی دەکردو بە موکەبەرە بانگی دەدا و ئاگاداری خەڵکی دەکرد کە وا خاوەن شکۆ بەرەو سلێمانی دێت و پێشوازی بکەن دیاربو ئەو سەیارەیە لاسلکی تیا بو بۆیە هەنگاو بەهەنگاو بەیانی دەرکرد کە گەیشتە کوێ و کەی دەگاتە بازیان ، خەڵکیش هەمووی چاوەڕوانی بون ئیدی لەدوای نوێژی نیوەڕۆ گەیشتە بازیان سەیارەکەی باباعلی لە پێشەوە بەرەو خێمەکانی شێخ ڕۆیشت ، مەوکیبی مەلیك فەیسەڵ و عبدول الاهی خاڵی مەلیکیش بەدوای دا هاتن و ڕویان کردە خەیمەکان ئیدی شێخ بابا علی لە پێشەوە دابەزی و عەرضي باوکی کرد کە ئەوە جەنابی مەلیك فەیسەڵە لەگەڵ وەصی کە دەکا عبدول الاه ، ئیدی بەپەلە مەلیك فەیسەڵ لەسەیارەکە دابەزیو سەلامی لە شێخ کردو دوجار دەستی ماچ کردو زۆر بە إکرامەوە بە عەرەبی وتی : عمو کیف الحال والصحە . شێخیش بەعەرەبی وەڵامی دایەوەو یەکسەر ناوچەوانی مەلیك فەیسەڵی ماچ کرد .

ئنجا عەبدول الاە دەستی کردە ملی شێخ و ئەم لاو لای شێخی ماچ کردو پاش چاك و چۆنیەکی گەرم بۆ ماوەی نیو کات ژمێر لە ژێر خێمەکاندا مانەوەو خزمان و پیاوماقولان و سەرۆك هۆزەکانیش بە پێوە لەخزمەتیانا ڕاوەستابوون . مەلیك فەیسەڵ عرضی شێخی کردو وتی : عمو چی ئەمر دەکەیت ، بۆت بکەین . فەرمووی هیچ تکلیفی خۆم نیە بەلام ضابتێکی کوردتان گرتووەو حوکمتان داوە، ئەمر بکەن بەرەڵای بکەن .

گەر لە یادبم ئەو ضابتە ( جلال امین بەگ ) بوو ، مەلیك فەیسەلّیش هەر یەكسەر فەرمانی دەركرد بە ئیرادەی مەلەكی بەر بدرێت . ئیتر بۆ بەیانی بەربو.

لە ژێر خێمەكە گوێم لیّ بو دووجار مەلیك فەیسەلّ تكلیفی لە شێخ كرد لەگەڵیان بچێت بۆ سلێمانی جاری یەكەم بڕیاری نەدا لەگەڵیان بچێت ، بەڵام دیار بو دوبارە تكلیفەكەیان كردەوە ناچار جاری دوهەم قبوڵی كرد لەگەڵیان بچێت ئنجا مەلیك فەیسەڵ فەرموی شێخی كرد كە لەگەڵ مەوكیب و سەیارەكەی ئەو بەیەكەوە بڕۆن بەڵام شێخ فەرمووی پشتم دێشیّ لای بابا علی سەردەكەوم بۆمن ئیسراحەتترە .

ئیدی مەوكیبی مەلیك فەیسەڵ بەرێكەوتوو شێخیش لەگەڵ بابا علی و یەكێكی كە لە خزمان ، هەرسێكیان بەسەیارەكەی بابا علی رۆیشتن ئەو كات باباعلی خۆی سەیارەكەی لیّ دەخوڕی ئەو خەڵكەش ئەم لاو لای جادەكەیان گرتبو بەدەستورێكی جوان پێشوازیان لەهەردوو مەلیك كرد پاشان گەیشتنە سلێمانی خەڵكی شار لای بەنزینخانەی كۆن كە دەكا لای صناعە بە خۆشییەوە پەلاماری سەیارەكەی شێخی ئەمریان دا و بە لاشان هەڵیان گرتو پێشوازییەكی گەرمیان لیّ كرد ، ئەوكاتە جەمهورەكە مەلیك فەیسەڵیان لە فكرچۆوە هەمو خەڵك بەدەوری سەیارەكەی شێخەوە بون هەتا گەیشتنە ناوەراستی شار لەوەدا ئاگادار نەمام ئایا مەلیك فەیسەڵ لەگەڵ شێخ چوو بۆ مزگەوتی گەورە یاخود بەرەو سەرا چو، بەڵام شێخی ئەمر روی لە مزگەوتی گەورەكردو چووە ناو مزگەوتەكەوە ، دیار بوونەیان دەهێشت خەڵك زۆر بچێتە ژوریّ و قەرەباڵغی دروست بێت جەنابی شێخ لطیف لەبەر دەرگای مزگەوت بو لەگەڵ چەند كەسێكدا وابو رێی هەمو كەسیان نەدەدا بچێتە ناوەوە لەوكاتەدا عەریفێكی عەرەبی رەش ویستی بچێتە ژووری بۆ زیارەتی شێخ محمود بەڵام شێخ لطیف ماوەی نەداو پاڵێكی بە سنگی عەریفەكەوە نا عەریفەكەش پاڵێكی بە سنگی (شێخ لطیف)ەوە نایەوە و بەعەرەبی وتی من بۆ دەست ماچ كردن و زیارەتی مەلیكی گەورەی كورد و عەرەب دەچم تۆ مەنعم دەكەیت ، هەر قسەكەی كردو یەك زلەی لە شێخ لطیف دا و جامانە و كلاّوكەی

لەسەر پەڕی لەوەدا کەرەمێکی سەیرم لە شێخ لطیف دیت هیچ ڕقی هەڵنەستاو جامانە و کلاوەکەی خستە وە سەرسەری و دەستی عەرەبەکەی گرت و بە حورمەتەوە بردییە ژوورەوە بۆ لای شێخ بەلام مەسەلەو بەسەرهاتەکەی بۆ شێخ محمود گێرایەو شێخ فەرمووی ( بارك الله بك) بە (شێخ لطیف)یشی گوت دەستی خۆش بێت لێی داوی مادام ئەو هێندە مشتاق بێت بەدیداری من تۆ چۆن مەنعی دەکەیت ، ئیدی عەریفەکە دا هاتەوە قاچی ماچ بکات شێخ راستی کردووە و ماوەی نەدا ئنجا دەستی شێخی ماچ کردو شێخیش ڕێزی چاکی لیٚ گرت و لای خۆیەوە داینا .

( ئەو کاتە مەلیك فەیسەڵ تەمەنی بە پێی دەستوری مەلەکیو یاسا وانەبو بچێتە سەر عەرشی مەلەکی وابزانم چەند ساڵێکی مابو بەلام بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بە مۆقت خاڵەکەی کرابو بە وصی وصایەی عێراق و مەلەکیەتی بەدەستبو ، خاڵەکەی هەر لە عائیلەی هاشمی بو ناوی عبدول الاه بو بەلام هەر لەدوای مەلیك فەیسەڵەوە دەرۆیشت هەرچەندە بە تەمەن تریش بو ! )

لە ٢٠٠٦/١١/٢٦دا شێخ صاڵحی داراغا ئەم باسەی بۆ گێڕامەوە.

## (٢)
## علم القيافه

دیاره مرۆڤ بەدەر لە ڕووە دیارەکەی لە ناخ و دەورنیشیدا واتە لەڕووە شاراوەکەشیدا توانای زۆر شتی کەشی هەیە کە فێر بێت ، چی بە خشندە ئەو بەهرەیەی بێ ببەخشێت و لە خۆرا بزانێت یاد بە هەوڵدان ئەوزانستیە پەیدا بکات و بگاتە ئەو پلە و پایەیە . وەکو عیلمی فیراسەت و عیلمی قیافە و یۆگـاو بەسـیرەت و ئیحساو ئیلـهام و مەوهوبییـەت و بەلاغـەت و زۆر هێـزی شاراوەی دی وەکو زانینی اسمی اعظم و هتد .

شێخی نـەمریش هـەر لەخوابیـەوە بـێ بەش نەبووە لە بەشێك لـەو بەهراتـەو توانایەکی لەرادە بەدەری هەبووە و دەرکی بە زۆر نهێنی و شتی نادیارکردووە .

جارێکیان لە ساڵی ١٩٩٢ دا لە خزمەت شێخ (لطیفـي شێخ صـادق)ی قەتەریدا دانیشتووم مەجلیسەکە زۆر پیاوماقوڵی لێ بو کاك لطیف زۆرشتی لەبارەی شێخی نـەمرەوە گیرایـەوە یـەك لەوانـە وتـی جارێکیـان کابرایـەك هاتـە خزمـەتی شـێخ ، شێخیش فەرمووی تۆ باوکت جۆلا بووە دایکیشت خەراتی کردووە ! .

کابرا وتی : یا شێخ چۆن دەزانیت بەراستی چونت فەرمو وایە، شێخ فەرمووی : کە هاتی تیّ بینی ڕۆیشتنەکەتم کرد بە جوڵەی شان و مل و ڕاوەشاندنی دەستت و شێوەی هەنگاو نان و قاچەکانتەوە ئەوەم بۆ دەرکەوت.

ئەو عیلمی قیافەیە کە جەنابی شێخ هەیبووە کەم کەس توانای فێربوونی ئەو عیلمەی هەبووە چونکە لە ڕووی سایکۆلۆژیەوە فێربوونی زۆرگرانە.

## شێخی نەمر و عیزەتی نەفسی

شێخی نـەمر کەسایەتیەکی زۆر تایبـەت مەنـد بـووە ، عیزەتـی نەفسیـشی هەنـدە گـەورەبووە بـە هـیچ پێوەرێـك پێـوەر نـەکراوە و بەئەنـدازەی تاڵـە

موویەکیش ماوەی نەداوە هیچ هێزێك هەتا لەدارو بەردیش لەو توانا دەرونیەی کەم بکاتەوە ، کابرایەکی دێلیژەیی بۆ زۆر کەسی گێراوەتەوەوتوویەتی خۆم لە خزمەت شێخدا بووم فەرمووی حەزناکەم لە بن داری شۆڕەبی دابنیشم چونکە سەری شۆڕە !!

## نمونەیەك لە توانا شاراوەکانی شێخی نەمر

بەهەق شێخ زۆر بەهەست بو دەرکی بەهەموو شت دەکرد جاری وا هەبو لەنادیارەوە شتی دەزانی و فکر و سەرنجی لەرادەبەدەربو بۆیە زۆر ڕووداوی لێ دەگێڕنەوە ، من خۆم شتێکی زۆر سەیرم لێ دیت، سالێکیان وەرزی بەهار بو باران دەباری کابرایەك هات فەرەنجبەیەکی لەبەردابو بەلام هەموو لەشی تەڕبووبو عرضی شێخیان کرد کە ئەو ڕێبوارە دەیەوێت چاوی بە جەنابت بکەوێت ئەویش فەرمووی با بێت هەر کە هاتە ژورەوەو سەلامی کردو دانیشت شێخ فەرمووی تۆچی حەمە سوری شارەزووری کابرا هەر واقی وڕما کە چۆن شێخ ئەم فیراسەتەی هەیە و ئەوەی زانی ! ئەویش لەوەلامدا وتی وم وەسیاقە و خالمە ، شێخ فەرمووی باشە بە خێربێی کارێکت هەیە کابرا وتی قوربان کوڕەکەم عەسکەرە و ئەبێ پارە بەدەلی بۆبدەم و لە عەسکەری دەری بهێنم وبیهێنمەوە چونکە هەر ئەو کوڕەم هەس هیچ پارەشم نیەو کەساسم شێخ فەرمووی هەرهیچ پارەت پێ نیە ؟

کابرا وتی : هەر هیچ . شێخ فەرمووی باشە خۆکە لە سلێمانی هاتی (١٩) نۆزدەت پێبو جانازانم مەبەستی شێخ نۆزدە دیناربویان لیرە بویا چی بو ، کابرا وتی بەلی گەورەم بم وەقوربانت والله راستە نۆزدەم لە گیرفاندایە . جا شێخ فەرمووی نەکا بەشت نەکا ئادەی محی الدین (١٠) دیناری بدە یە( محەی

سالەسورمەشهور بو پیاو ماقوڵی شار بو بەردەوام لەخزمەتی شێخ دابو )
هەندێ خزمیش لەوێ دانیشتبوون شێخ فەرمووی ئێوەش چیتان لە تواناداییە دەستەوەگیری بکەن ئیدی ئەوانیش (٥٠) دینار یان بۆ کۆکردەوە و کابرا دەستی شێخی ماچ کرد و لێیدا رۆیشت .

ئەم بەسەرهاتەم لە ٢٠٠٦/١١/٢٦ دا لە بەرێز شێخ صالحی داراغا وەرگرت .

## نمونەیەك لەرەوشتە بەرز و میهرەبانیەکانی شێخ و پاکی ئەوزاتە گەورەیە

دیارە رەوشتی پاشا و سوڵتان و حوکمەران و ئەمیر و سەردارانی جیهان وایە کە دەبێ بەدەر لە حەرەمی خۆیان هەمو ئافرەتانی وڵاتەکەیان بە چاوی باوك و ئەولادایەتی سەیر بکەن ، ئنجا دەبنە شکومەندو سەرۆکی راستەقینەی وڵات ، زۆریشیان لایان حەرامە ژن لە وڵاتی خۆیان بهێنن شێخی ئەمریش لەهەوای نەفس بەدوور بووەو زۆر پاك و رەوشت بەرز بووە هەمیشە لە خوای گەورە ترساوە و بە ئاگابووە.

جارێکیان بۆی گێرامە وتی : صالح بەقەبری حاجی شێخ سعیدی باوکم وکاکە ئەحمەدی شێخ و مامە شێخ حسن ی گڵە زەردە ئەم محمودی شێخ سیعدە لە حەیاتی گەنجیمدا تەنها یەك جار تارم بەسەر دا هاتووە ، ئەویش وا بو بەیانیەك زو هەستام و بەرێکەوت چوومە چێشت خانەکەمان بەو نیازەی بزانم شۆربا پێ گەیشتووە یان نا سەرقاپی مەنجەڵەکەم هەڵدایەوەو دام نایەوە ئیدی ویستم بەرەو دوا بگەرێمەوە ئەو کارەکەرەی کەخواردنی بۆ دروست دەکردین هەردو دەستی بەم لاو لای لاشیپانەی دەرگاکەوە ناو وتی وڵاهی ماچم نەکەیت هاوار دەکەم و دەڵێم پەلاماری داوم ، منیش ناچار چاوم نوقاندوو روم تێ کرد و بەشەرمەوە سەرم بۆ لای سەری بردو لوتم بەر

رووممەتی کەوت و بەگورجی بەرەو دوا گەڕا مەوە ، ئەمە هەموو گوناهە گەورەکەم بو لەو بوارەدا .
جا ئامۆژگاری دەکردمودەیفەرمو صالح زۆر بە ئاگا بەو لەخوا بترسە و قەت بەلای حەرامدا مەچۆ .

لە رۆژی ٢٠٠٦/١١/٢٦ دا بە خزمەت شێخ صالح ی داراغا گەیشتم و ئەو بەسەر هاتەی شێخی ئەمری بۆ گێرامەوە .

## باوەڕی شێخ ی ئەمر

سالێکیان جۆگەی ئاوی باسەرەیان هەڵدەگرت بۆ ژاڵەی بەر دەربەند بەلام لە ژێر چاودێری ئەندازیاردا و شێخ احمدی سەرزەلیش سەرەوکاری دەکرد ، شێخ باباعلی نامەیەکی لەبەغداوە نوسیبو بۆ جەنابی شێخ محمود تیایدا بەیانی کرد بو کە قنصل ی بەریتانی لەگەڵ هاورێ یەکی قنصل کە جەنەڕاڵێکی کۆن بو دێن بۆ زیارەتی شێخ بۆسەر پرۆژەکە ئیدی پاش دوو سێ رۆژ هاتن کە هاتن بۆ نیوەرۆ مانەوە و نانیان لای شێخ خوارد پاشان کەوتنە قسەکردنی کۆن و تازە لەناو قسەکاندا وتیان جەنابی شێخ ئەمر بکە چیت بۆ بکەین لەوەلامدا شێخ فەرمووی هیچ باوەرم بە قسەی ئێوە و حکومەتی بەریتانیا نیە چونکە درۆتان لەگەڵ خۆم و قەومەکەم کردوە .
ئەوانیش بەپێکەنینەوە وتیان یا شێخ ئەوسا زەمانێکی کە بو ئێستا زەمانێکی کەیە ، شێخ فەرمووی نە ! هەر یەك زەمانە و هەر بەوچاوە تەماشاتان ئەکەم !
قنصل وتی ئەم قسەی جەنابت دەقاو دەق بەسەرۆکی حکومەتی بەریتانیای عظمی ڕادەگەیەنم .

ئەم باسەم لە ٢٠٠٦/١١/٢٨ دا لە شێخ صالحی داراغا وەرگرت .

# شێخ صاڵحی شێخ مستەفای شێخ فەرەجی داراغا

لە ساڵی ١٩٢٤ دا لە دایك بووەو کەسایەتیەکی ناسراوە بە دڵسۆزی و کوردایەتی و لە شۆرشی ئەیلول دا دەوری چاکی هەبووە و لەدوای راپەرینەشەوە جیاوازی لە نێوان پارتە سیاسیەکاندا نەکردووە و وەکو کوردێکی بێ لایەن مامەڵەی لەگەل کردوون .

شێخ صالح خەڵکی گوندی داراغایە و بنەماڵەیەکەیان کەسایەتیەکی ئاینی و خاوەن مقام بوون ، ئێستا لە سلێمانی دەژی و لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدایە و توانایەکی باشی هەیە و لای دانیشتوانی شاری سلێمانی و لای حکومەتی هەرێم رێزی تایبەتی هەیە .

# لە دەفتەری بیرەوەریەکانی
# محێدین چنارەیی باوکمەوە

❖ سامال محێدین

بـە بۆنـەی سـاڵیادی پـەنجا سـاڵەی کۆچـی دوایـی مـەلیك و ڕابـەری مـەزنی کـورد شـێخ مـەحموودی نـەمر، لـە دەفتـەری بیرەوەرییـەکانی بـاوکم ئـەم چەند بیرەوەریەم هەڵبژارد، بەو ئومێدەی کە گوزارشت بێت لـە ئەمـەك و ڕێـزو خۆشەویستی بۆ ئەو ڕابەرە مەزنە لەلایەك و چەند بەڵگەیەکی تر بن لـە سـەدان بەڵگـەی ئازایـەتی و جـوامێری و وردبینـی و بەئـەزموونی و خۆشەویـستی گەلەکەمان بۆ شێخ مەحمودی نەمر لەلایەکی تر.

**بیرەوەری یەکەم:** باوکم محێدین چنارەیی فەرمووی:

سێ ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ۹۲۳ یان ساڵی ۹۲٤ بوو، شـێخ مـەحموودی نـەمر میـوانی بـاوکم (خـدری حـاجی محەممـەد) بـوو لـە (چـنارە)ی نزیکـی (چـوارتا). دوای بـەربانگی ڕۆژی کۆتـایی ڕەمـەزان شـێخ فەرمووی:- بـەیانی جەژنـە، ئەمشەو من ئێرە بەجێ ئـەهێڵم و ئـەڕۆم ئێـوەش بەیانی زوو تاریك و ڕوونی بچنە دەرەوەی گوندەکە. باوکم بە شێخی وت: یا شێخ بەیانی جەژنە، حەز ئەکەین جەژنمان لەگەڵدا بکـەن و نـەڕۆن. لە وەڵامدا شێخ فەرمووی: دڵنیام بەیانی بە هۆی ئەوەوە کە سێ ڕۆژە من لێرەم، ئێرە بە فڕۆکـەی ئینگلیـز بۆردومـان ئـەکرێت، لەبـەر ئـەوە مـن ئـەڕۆم و هـەم ئێـوەش بەیانی شەوەکی گوندەکە بەجێ ئەهێڵن.

لەسەر ئەو پێشنیارەی شێخ بەیانی زوو چوینە دەرەوەی گوندەکە، بێجگە لە دوو ژن و دوو پیاو کە فریانەکەوتبوون بڕۆنە دەرەوە.

پێشبینییەکەی شـێخ ڕاسـت دەرچـوو، بـەیانی زوو بـە فڕۆکـە بۆردومـانی گوندەکـەمان کـرا، ژنێـك شـەهید بـوو و پیاوەکـانیش برینـدار بـوون. لـەدوای

ئەوەی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دانیشتوانی چنارە نەچووینەوە شاخەکانی پشتی چنارە، لەبەر ئەوەی ڕۆژانە جارێك و دوو جار بۆردومانی گوندەکەمان ئەکرا بە هۆی فڕۆکەوە. هەر لەو ماوەیەدا بوو ئێوارەیەك دوای نان خواردن، دۆستی نزیك و دڵسۆزی بنەماڵەکەمان وسوو ئاغا لەگەڵ سوارێکی تردا هاتن بۆ چنارە وسوو ئاغا وتی: شێخ مەحموود ناردوومی بۆ لات، ئەیفەرموو بە خاڵە خدر بڵێ: لە چنارە و ناوچەی شارباژێڕ دوور بکەوێتەوە، چونکە هێزێکی گەورەی ئینگلیز و عەرەب بەرەو شارباژێڕ دێن، داگیری ئەکەن و ئەویش تووشی گرتن و ئازاری زۆر نەبێت.

هەر ئەو شەوە بە ماڵ و منداڵەوە کۆچمان کرد بۆ کوردستانی ئەو دیو (مەبەست ڕۆژهەڵاتی کوردستانە). دوای ٢-٣ ڕۆژ گەیشتینە گوندی (نەمەشیر) لە نێوان بانە و سەردەشتدا. خوا لێخۆشبوو حەسەن خانی نەمەشیر کە خاوەنی گوندەکە بوو، هاوکاری زۆری کردین و خانووی بۆ داین کردین.

هەر بە هۆی حەسەن خانەوە کە خزمی (ئەمین بەگ)ی قائیمقامی چوارتا بوو، پاش ٦-٧ مانگ لێبووردنمان بۆ وەرگیراو گەڕاینەوە بۆ چنارە. بۆچوونەکەی شێخ ڕاست و دروست دەرچوو، دوای کۆچکردنی ئێمە بەرەو نەمەشیر بە چەند ڕۆژێك، هێزی ئینگلیزو عەرەب (چوارتا)ی مەڵبەندی ناوچەی شارباژێڕیان داگیر کرد.

**بیرەوەری دووەم: باوکم فەرمووی:**

لە مانگی مایسی ٩٤١ دا شێخ مەحموودی نەمر کە دوور خرابۆوە بۆ بەغا، خۆی دەرباز کردو گەڕایەوە بۆ کوردستان. هەر لەو ڕۆژانەدا کە شێخ مەحموود لە سیتەك دائەنیشێت، ئێمەش چەند کەسێك بووین لای شێخ دانیشتبووین، ئەوانەی لەبیرم ماون: شێخ لەتیف و مەلا ئەسعەدی مەحوی و کەریم زەند و محەممەد خدری تاپۆ و ئیبراهیم گوردی و ئیسماعیلی حاجی حەسەن و چەند کەسێکی تر بوون کە بە داخەوە ناوەکانیانم بیر نەماوە. شێخ قسەی بۆ ئەکردین، ئەیفەرموو: هەر سەربەستییەك داگیرکەری ئینگلیز بە هەر

نەتەوەیەکی بدات، ئەوە سەربەستی نییە، بەڵکوو دیلێتییە. هەروەها شێخ فەرمووی: بەهاران قاچم ئازارێکی لێ پەیدا ئەبێت، ئەویش لەبەر ئەوەی لە دەربەندی بازیان کە بریندار کرام گوللەیەك لە سمتمدا ماوەتەوە.

پێمان وت: یا شێخ جەنابت ئەم ماوە دوورودرێژە لە بەغا بوویت، بۆچی نەشتەرگەریت نەکردووە دەری بهێنیت ؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە گوللەی ئینگلیزە، وەك ئینگلیزەکان خۆیان وایە، لەبەر ئەوەی ئینگلیز چووە هەر وڵاتێك بە زۆر نەبێت دەرناچن و ئەو وڵاتە بەجێ ناهێڵن. ئەم گوللەیەش بە ئاسانی دەرنایەت.

لە درێژەی وتەکانیدا شێخ مەحموود فەرمووی: بە هۆی "لەتیف"ەوە (مەبەستی شێخ لەتیفی کوڕی بوو) ئەزانم کە ئێوە سیاسەت ئەکەن لە کۆمەڵەی (برایەتی)دا، مەبەستتان بەدەستهێنانی مافەکانی گەلی کوردە. ئومێدم وایە سەرکەوتوو بن. بەڵام ئامۆژگارییەکتان ئەکەم لەگوێی بگرن، ئەویش ئەوەیە کە لە کاتی سەرکەوتندا لە خۆتان بایی مەبن، لەکاتی شکستدا ورە بەرمەدەن و مەڕووخێن.

بیرەوەری سێیەم: باوکم فەرمووی:

مەلیك فەیسەڵ ساڵی ٩٥٤ یان ٩٥٥* بوو هات بۆ سلێمانی، لەو ساڵانەدا عومەر عەلی کە کەسێکی عەسکەری و زۆر دڵسۆزی ڕژێمی پاشایەتی بوو لە عیراقدا، موتەسەڕیفی سلێمانی بوو، ویستی لە ڕێو ڕەسمێکدا پێشوازییەکی زۆر گەورە لە مەلیك فەیسەڵی دووەم بکرێت. بۆ ئەم مەبەستە ئاگادری شێخ مەحموود و کەسایەتیە ناودارو ناسراوەکانی سلێمانی و دەوروبەری کرا. منیش (واتە محێدین چنارەیی) بەپێی ئەوەی کە ئەندامی ئەنجومەنی لیوا بووم لەسەر ناوچەی شارباژێڕ، یەکێك بووم لەو ئامادەبوانەی کە ئاگادار کرابوومەوە ئامادەی ئەو ڕێوڕەسمە بم، کە لە

* مامۆستا مستەفا صالح کەریم، هەروەها مامۆستا ئەنوەر حاجی عەلی ماستاو جەختیان کردەوە لەسەر ساڵی ١٩٥٥.

دەربەندی بازیان بەڕێوە ئەچوو. کە گەیشتینە ئەوێ، واتە دەربەندی بازیان، بینیمان شێخ مەحموود لەگەڵ چەند کەسێکدا کەمێك لە دووری ئەو خێمەیەی ئامادە کرابوو بۆ پشوودانێکی کەمی مەلیك فەیسەڵ و بە مەبەستی بەخێرهێنانی ڕاوەستابوو. ئێمەش بۆ سڵاوکردن و هەواڵ پرسین یەکسەر چووین بۆ لای شێخ. پاش کەمێك بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی هات بۆ لای شێخ و پێی وت: جەنابی شێخ موتەسەڕیف ئەڵێت با شێخ مەحموود ئەو خەنجەرە لە قەدی بکاتەوە و لای بەرێت، لەبەر ئەوەی نابێت بەو خەنجەرەوە بچێت بۆ بەخێرهاتنی مەلیك!

شێخ مەحموود لە وەڵامدا زۆر تووڕە بوو، بە دەنگێکی بەرز وتی بڕۆ بە عومەر عەلی بڵێ: تۆو عومەر عەلی و مەلیکەکەتان ئاماقوڵیتان کردو سەرتان دای لە بەرد، من خەنجەر دانانێم. شێخ ئەم قسانەی ئەوەندە بە دەنگی بەرز و تووڕەییەوە وت عومەر عەلی کە لەبەردەم خێمەکەدا وەستابوو، گوێی لێ بوو.

پاش کەمێك بەڕێوەبەری پۆلیس گەڕایەوە لای شێخ و پێی وت: یا شێخ موتەسەڕیف داوای لێبووردنتان لێ ئەکات.

ڕێو ڕەسمی بەخێر هێنانی مەلیك دەستی پێکرد. ئەو کەسانەی کە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوون، یەکەیەکە ئەچوونە ناو خێمەکەوە کە مەلیك فەیسەڵی تیا دانیشتبوو، تەوقەیا لەگەڵ ئەکردو لەلایەکەی ترەوە ئەچوونە دەرەوە. بەڵام مەلیك فەیسەڵی دووەم لەسەر کورسییەك شێخ مەحموودی لای خۆی دانا. لە گەڕانەوەدا بۆ سلێمانی، لە قەراغی شار نزیك بە ئامادەیی پیشەسازی ئێستا، جەماوەری خەڵکی سلێمانی کۆبوونەوە، بەجۆرێکی ئەوەندە شایستە پێشوازییان لە شێخ کرد کە هەر لەو جەماوەرە کوردپەروەرە ئەوەشایەوە. تەنانەت ئۆتۆمبێلەکەی شێخ مەحموودی ئەمریان بەرز کردەوە و بە شان هەڵیان گرت. مەلیك فەیسەڵی دووەم پشت گوێ خرا.

**بیرەوەی چوارەم:** باوکم فەرمووی:

لە چنارە بووم، بەڵێننامەم لێ وەرگیرابوو کە سنووری گوندی چنارە نەبەزێنم. شەو بە هۆی ڕادیۆوە بیستم کە شێخ کۆچی دوایی کردووە. بڕیارم

دا بەیانی زوو بەرەو سلێمانی بکەومە ڕێ. بەڵام پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە، هێشتا شەو مابوو، مەفرەزەیەکی پۆلیس کە لە (چوارتا)وە هاتبوون، گەیشتنە چنارە و بە گیراوی بردیانم بۆ چوارتا. پاش چەند ڕۆژێك بەندکردنم، دەست بەسەر کرام لە چوارتا بۆ ماوەی چەند مانگێك.
مژدەت لێ بێت ئەی شێخی گەورە، خۆت وتەنی، ئەو گەلە نەجیبەی کە هەموو ژیانت تەرخان کرد بۆ بەدەست هێنانی سەربەستی بۆی، وا ئێستا بەرەو سەربەستی و سەربەخۆیی هەنگاو بەرەو پێش ئەڕوات.

٢٠٠٦/١٠/٢٥

# قصيدة في رثـاء
# الشيخ محمود الحفيد

❖ أ . د عبدالفتاح على بوتانى

لقد شاركت في تشييع الشيخ محمود وحضور الفاتحة على روحه ، وفي ذلك الظرف العصيب ، وفود من اربيل وكويسنجق ومدن كوردية اخرى ونظم العديد من الشعراء وعلماء الدين القصائد في رثاء الشيخ والأشادة بمآثره الوطنية، ومن القصائد الرثائية التي كتبت ولم تنشر الى الآن قصيدة جدي العالم الديني الحاج الملا يحيى علي (١٨٨٠-١٩٦٠) الذي رثاه بثلاث لغات هي: الكوردية والعربية والفارسية ، وفي القصيدة المنشورة ادناه اخطاء في الوزن والنحو واخطاء عروضيه ، ربما لم تكن موجودة في الاصل ، لأن والدي كان قد دون هذه الابيات اعتماداً على ذاكرته في سنة ١٩٨٤ ، اي بعد مرور(٢٨) سنة على سماعه لها او رؤيته لها مكتوبة في اوراق والده ، التي فقدت بسبب ظروف قاهرة ، وقد اشار مشكوراً الى تلك الاخطاء الزميل الدكتور محمد بكر استاذ الادب الكوردي المساعد في كلية الآداب ، جامعة دهوك.

شاركنى الشمس صاحى ق البكا و والجزع

قمر الافلاك بيا ويلاه معى

على الچرغام الجسور الـ (محمود الفقيد)

ان تاريخ وفاته يا اخانا خژ دع

* * *

شيخ محمود چراغ جهان بود

شاهين تيز چنگ يا شير ژيان بود

مرغ جانش پریدو فردوس ىَشيان بود

ربيع اول تاريخی وفاتش مه غفران بود

* * *

گەر موسلمان باخلاص رو لاولاد بتول كه

له فراق شيخ دلت محزون و مەلول كه

به بەهشت تەشريفی كرد شرق وشمال بون يه تيم

وەره تاريخی وەفاتی ئەو بەتاريخ قبول كه

ترجمة القطعة الفارسية والقطعة الكوردية :

كان الشيخ محمود نبراس العالم

كان، صقراً بمخالب حادة واسداً مقاتلاً

انطلق طير روحه واستقر في الجنة

وكان تاريخ وفاته في ربيع الاول غفراناً لنا .

اذا كنت مسلماً فتوجه باخلاص لاولاد البتول

واجعل قلبك حزيناً على فراق الشيخ

دخل الجنة فيتم الشرق والشمال

تعال واقبل تاريخ وفاته تاريخاً .

١- القطعة العربية من بحر البسيط (مستفعلن فاعلن مستفعلن فع لن ) وفيها اخطاء في الوزن والنحو .

٢- القطعة الفارسية من بحر الخفيف (فاعلاتن مفاعلين فع لن) وفيها ، اخطاء في الوزن والصياغة .

٣- القطعة الكوردية من بحر الرمل (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وفيها اخطاء عروضية فقط .

# الكشاف الوطني

## جريدة علمية، ادبية، انتقادية، فكاهية، مصورة، حرة

## صاحبها ومديرها المسؤول فؤاد زيدان

تلغرافياً: الكشاف الوطني

صندوق البوسطة نمــــرو

بغداد ٢٦ كانون الاول ١٩٢٦

منح الاله زعيمنا أبهى الظفــــر فتطايرت أخباره بين البَشــــــر

والكل فرح (والسيد احمد) لأجله نادى التهاني قائلاً نِلت البُشـــــرَ

يا فارس كُردستان بل باركُنهـــا يامحي مجد الكُرد من بعد الخطـــر

لازلت للاعداء دوماً قاهــــــراً تروى حسامك من دم القوم الاشـــرِ

لازلت يا ابن الاكرمين مؤيـــداً بالنصر والتأييد مالاح القمــــــرُ

يا أمة الاكراد نادوا واهتفــــوا يحي زعيمنا (محمود) السامي الاغرُ

أهدي قصيدتي العصماء الى الزعيم الكبير لكُردستان الشيخ محمود المعظم أيده الله بالنصر والتوفيق مع أعدائه.

الفقير لله تعالى

صاحب جريدة الكشاف الوطني

فؤاد زيدان

بەڕێز مومتاز حەیدەری ناردوویە.